

# ( حارسی موحاسبی )

## لە سێ کتێبدا

نووسینی

حارسی موحاسبی

وەرگێڕانی

مامۆستا عبدالكريم فتاح

چاپی یەکەم

١٤٣٧ ك - ٢٠١٦ ز












**ناوی کتێب:** حارسی موحاسبی لە سێ کتێبدا.

**نووسینی:** حارسی موحاسبی.

**وەرگێڕانی:** مامۆستا عبدالکریم فتاح.

**نەخشەسازی ناوەوە:** احمد خالد.

**تایپ:** نووسەر.

**نۆرەو ساڵی چاپ:** یەکەم ٢٠١٦ زایینی.

**تیراژ:** (١٠٠٠) دانە.

**ژمارەی سپاردن:** (   )ی ساڵی ٢٠١٦ لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکانی دراوەتێ.



Nuri.haqeeqat@gmail.com



﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا

وَتَقْوَاهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ

خَابَ مَنْ دَسَّاهَا ﴿١٠﴾﴾





**سورة الشمس**

**(٧-١٠)**

## پێشەکی وەرگێر

### حارسی موحاسیبی

**حارسی موحاسیبی (رەحمەتی خودای لێ بێت) باوکی عەبدولاَ حارسی کوڕی ئەسەدی بەغدادی، بەهۆی سەرزەنشت کردنی نەفسی خۆ و دادگایی کردنی خۆ نازناوی "موحاسیبی" لێنرا، لە ساڵی ١٧٠ی کۆچی لە شاری بەسرە لە دایك بووە و ساڵی ٢٤٣ی کۆچی لە شاری بەغداد کۆچی دوایی کردووە، پیاوێکی زانا و زاهیدی خاوەن وەرع بوو، فەرموودەی لە "یەزیدی کوڕی هاروون" و کەسانی ترەوە ریوایەت کردووە، "ئەحمەدی کوڕی حەسەن" و "ئەحمەدی کوڕی قاسم" و کەسانی تریش فەرموودەیان لێوە ریوایەت کردووە.**

**کۆمەڵێك دانراوی گرنگ و بەبەهای لە مەیدانی ئوسوڵ و زوهد و پەروەردەی دەروونداهەیە، چەند دانراوێکی لە بەرپەرچدانەوەی موعتەزیلە و رافیزەدا نووسیوە، ئیمامی زەهەبی دەربارەی دەفەرموێت: "صدوق فی نفسە-لە ناخی خۆیدا کەسێکی زۆر راستگۆ بوو".**

**دەربارەی وەرع و خۆپارێزی موحاسیبی جونەید دەفەرموێت: رۆژێك فەرمووم لێکرد بۆ خواردنێك کە لە ئاهەنگی هاوسەرگیرییەکەوە هاتبوو، پارووەیەکی لە دەم ناو زۆری جویی، پاشان بۆی قووت نەدرا و هەستا و رۆیشتە دەرەوەو لە دەمی خۆی دەرکرد، کاتێك پرسیارم لێ کرد، فەرمووی: خودا رەگێکی لە جەستەمدا**

**داناوە گەر خواردنێك یان خواردنەوەیەك حەرام بێت یان شوبهە بێت رەگەکە لێ دەدات، بۆیە هەرچی هەوڵمدا ئەو پارووەم بۆ قووتنەدرا، جونەید دەفەرموێ: بەدواچوونم بۆ خواردنەکە کرد خواردنێك بوو شوبهەی تێدا بوو.**

**بۆ سوود گەیاندن بە خوێنەری کوردی موسڵمان و دەوڵەمەند کردنی کتێبخانەی کوردی ئەم سێ کتێبەمان وەرگێڕایە سەر زمانی کوردی شیرین، خودا لە دانەری کتێبەکە قبووڵی بفەرموێت و ئێمەش لە پاداشت بێ بەش نەکات.**



**وەرگێڕ**

# مامەڵە لەگەڵ خودا



## بەڵگەکانی ناسینی خودا:

لە هەندێ لە حەکیمانەوە ریوایەت کراوە، فەرموویەتی: (وەسێت دەکەم بۆ خۆم و تۆ و هەر کەسێك گوێی لە قسەکانم دەبێت بە تەقوای خودا کە بەندەکانی دروست کردووە و گەڕانەوە بۆ لای ئەوە و ڕێگەی ڕاست و دروست بە ئەوەوەیە)

بۆیە ئەی برام، لە خودا بترسە، بە ترسانی ئەو کەسەی نزیکی لە خوداوە ناسیوە و هەستی بەدەسەڵاتی ئەو کردووە لەسەر خۆی.

ئیمانی پێ بهێنە وەك ئیمانی ئەو کەسەی دانی ناوە بە یەکتایی و تاکوتەنهایی و هەرهەری بوونی خودادا، لە ڕێگەی ئەوەی دەرکەوتووە لە بینینی مەلەکوت و گەواهی دەسەڵاتی مەزنی، و زۆری بەڵگە و بورهانەکان لەسەری و ئایاتگەلێك کە بەڵگەن لەسەر پەروەردگاری خودای موتەعال و جاریبوونی ویست و بڕیاری و توندوتۆڵی و دامەزراویی بەدیهاتووەکانی و بەیانی دەسەڵاتی لەسەر هەموو دروستکراوەکانی و تەگبیری ورد و باش و پڕ لە حیکمەتی، ئایا دەزانی بوون و بڕیار تەنها بۆ خودای موتەعالە؟ **تبارك الله رب العالمین.**

متمانەت بە خودا هەبێت، ئەی برای من، وەك متمانەی ئەو کەسەی کە باشترین متمانەی بە خودا هەیە، و تۆمەت ناداتە پاڵ پەروەردگاری، و بەڵێنەکانی بەڕاست دەزانێ و متمانەی بە دەستەبەرکردنی ئەو هەیە و دڵی بۆ لای بەڵێنەکانی خودا لە هەڵپە و هەژان کەوتووە و هەڕەشەکانیش لە دڵیدا بە مەزن ڕاگیراون.

ئەی برای من، شوکری خودا بکە وەك شوکری ئەو کەسەی فەزڵی خودا و زۆری نیعمەتەکانی و چاکەی بێپایانی ئەوی ناسیوە.

نیعمەتە ئاشکرا و شاراوەکان و تایبەت و گشتییەکانی بناسە، بە جۆرێك ئیخلاص بۆ خودا بنوێنە وەك ئەو کەسەی کە دەزانێت هیچ کردارێکی لێ قبووڵ ناکرێت هەتا خۆی لە ئافەتەکان خاوێن نەکاتەوە، ئیخلاصی تەنها بۆ خودایە کە هاوەڵ و هاوتای نییە، و لە کار و کردەوەکانیدا هیچ کەس ناکات بە هاوەڵی خودا.

بزانە، ئەی برام، بەشداری پێکردنی دروستکراوەکان لە کار و کردەوەکاندا: بریتییە لە خۆجوانکردن و خۆ رازاندنەوە لە شوێنی تاقیکردنەوەدا و سەرئەنجام لە کارەکەیدا تووشی درۆ ببێت، یان ریا ئەنجام بدات بۆ ئەوەی رێزی لێ بگیرێت، یان بەهۆی قسە جوانەکانی و چاکە و باشەی کردارەکانییەوە مەزن تەماشا بکرێت، ئەو ئەم حاڵەتانە لە نەفسی خۆیدا دەناسێتەوە یان لەوانەیە هەندێکیان نەناسێتەوە.

ئەی برام، تەنها ئەوانەی کە لەم دۆخانە دێنە دەرەوە لە شەڕی ریا سەلامەت دەبن، کەسانێك کار ئەنجام دەدەن و پێیان خۆش نییە هیچ یەکێك لە دروستکراوەکانی خودا پێیان بزانێت، گەر یەکێك لە دروستکراوەکان ئاگاهی بە کارێکی ئەو پەیدا کرد پێی خۆش نییە، لە راستگۆیی کەسەکە ئەوەیە پێیخۆش نییە ئەو دروستکراوە مەدحی بکات بەهۆی ئەو کارەوە کە ئاگاهی پەیداکردووە بەسەریدا، گەر یەکێکیش مەدح و سەنای کرد ئەوا مەدح و سەناکەی پێخۆش نییە و خۆشی و سروور بە مەدحی ئەو رووی لێ ناکات، گەر سرورێك رووی لێ کرد بە مانای سرووری دونیایی نییە بە هۆیەك لە هۆیەکان.

پاشان ئەی برام، لە قسە و گوفتاردا راستگۆ بە، وەك راستگۆیی ئەو کەسەی کە دەزانێت خودا ئاگاهی هەیە بەسەر شاراوەکان و پەنهان و ئاشکرا و ئەوەی ویژدان لە ئامێزی دەگرێت.

تەوەکول بە خودا ببەستە، ئەی برام، وەك تەوەکولی ئەو کەسەی متمانەی بە بەڵێنەکانی هەیە و دڵنیابووە لە دەستەبەرکردنیان بەهۆی متمانەی بە وەفاداری خودای موتەعال، و رازیبوون بە بڕیارەکانی و تەسلیمبوون بە فەرمانەکانی و ئیمان بە قەدەری خودا و یەقین و صدقی بە بەهەشت و دۆزەخ.

لێی بترسە ئەی برام، وەك ترسی ئەو کەسەی لە دەستوەشاندنی خودا و توندی نیقمەت و ئێش و ئازاری سزای دەترسێت، لێ بترسە وەك ترسی ئەو کەسەی بە نموونەکردن و ئاساری رووداوەکان و سزاکانی خودای هەست پێکردووە دژ بەوانەی سەرپێچی فەرمانەکانی ئەویان کرد و لێی یاخیبوون.

بزانە ئەی برام، هەر کەس خودا رسوایی بکات هیچ شتێك راگیری ناکات، هەر کەسێکیش سەرکەوتوو بکات و بە پارێزگاری خۆی دەورەی بدات کەس ناتوانێت رووبەڕووی ببێتەوە، هیچ کەسێك ناتوانێت لەسەر سزا و تۆڵەسەندنەوەی خودا و گۆڕانی نیعمەتەکانی ئارام بگرێت.

ئەی برام، رجا و هیوات بە خودا بێت، وەك رجای ئەو کەسەی بەڵێنەکانی بەڕاست دەزانێت و پاداشتەکانی دەبینێت.

شوکری خودا بکە ئەی برام، وەك شوکری ئەو کەسەی چاکەکانی لێ قبووڵ دەکرێت، و کارەکانی چاك و پاك دەبن و نیعمەتی زۆرتر و زیاتری بەسەردا دادەبارێت و رێز و بەخشینی زۆرتری بۆ رەوانە دەکرێت کە بە کار و کردەوەکانی هاوتا نابن.

ئەی برام، شەرم لە خودا بکە، وەك شەرمی ئەو کەسەی زۆری نیعمەتەکانی خـودا و بێپایانی بەخششەکانی ناسیوە، و لە نەفسی خۆیدا کەموکورتی بۆ شوکرکردن هەسـت پێ دەکات و هەست بە کەمی وەفای خۆی دەکات بەو پەیمانانـەی بـە خـودای داوە، و دەستەوسانە لە هەستان بە جێبەجێ کردنی ئەو حەقانەی کە پێویست بوو جێبـەجێیان بکات، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا تەنها داپۆشینی جـوان و عافییـەتی مـەزن و هـاتنی نیعمەتی زۆرتر و بەردەوامی چاکەی زیاتر و حیلم و لێبوردنی مەزن لـە پـەروەردگاری دەبینێت.

پاشان بزانە، ئەی برام، خـودا -عـز وجـل- کۆمـەڵێك فـەرزی ئاشـکرا و دەرەکـی و شاراوە و ناوەکی داناوە، و چەندین حوکمی لەو بارەیەوە بەیان کردووە، بەڵێنی داوە بە پاداشتی مەزن بۆ ئەوانەی جێبەجێیان دەکەن و هەڕەشە و سزای مەزن و بەئێشیش بۆ ئەوانـەی پێیـان هەڵناسـتن و تیایـان دەبـەن، ئەمـەش وەك رەحمـەتێك بـە تـۆ و ئاگادارکردنەوەت لە نەفسی خۆی (**سبحانە**) وەك بەزەییەك بەرانبەر بە تۆ.

کـەوابوو ئـەی بـرام، هەسـتە بـە فـەرزەکانی و پابەنـدی شـەرعەکەی ببـە و لەگـەڵ سـوننەتی پێغەمبەرەکـەی (ﷺ) تـەبا بـە و شـوێنپێی هـاوەڵانی پێغەمبـەر (ﷺ) هەڵبگرە و پابەند ببە بـە رەوشـت و رەوگەیانـەوە و بـە ئـەدەبی ئـەوان خـۆت ئـەدەب دابدە و رێگەکەیان بگرەبـەر و بـە هیدایـەتیان هیدایـەت وەربگـرە و خۆشەویسـتییان بکە بە وەسیلە بۆ لای خودا و ئەوانەی ئەوانی خۆشدەوێت خۆشـتبوێن، ئەوانـە بـریتین لەو دەستەیەی بۆ لای خودا گەڕانەوە و مەبەستی خودایان گرتەبەر و خـوداش ئـەوانی بۆ هاوەڵی کردنی پێغەمبەرەکە (ﷺ) هەڵبژارد و کردنی بە خۆشەویسـت و هـاودەمی ئەو (ﷺ).

## راستێتی تەوەسول بە خۆشەیستی چاکان:

بزانە، ئەی برام، نیشانەی خۆشەویستی تۆ بۆ چاکان ئەوەیە رێگە و رەوگـەی ئـەوان بگریتە بەر، لەگـەڵ دامـەزراوی و راسـت وەسـتانی دڵ و دروسـتیی کـار و کـردەوە و صدقی زمان و چاکی و پاکی نهێنی و پەنهانت بـۆ کاروبـاری دونیـا و دوارۆژت، وەك چۆن ئـەو دەسـتەیە حالێـان بـەم جـۆرە بـوو، ئەمـە راسـتگۆیی بانگەشـەکەی تـۆ بـۆ خۆشەویستی ئەوان و دەستگرتن بە رێگە و رەوگەیانەوە دەردەخات.

گەر ئەم رەوشتانە لەناو تۆدا و لە تـۆوە راسـت و دروسـت دەرچـوو وەك چـۆن لـەناو ئەواندا و لە ئەوانەوە راست و دروست دەرچوو، ئەوا تۆ لە خۆشەویستی ئەو دەسـتەیە و باش شوێنکەوتنیان راستگۆیت بەدەست هێناوە.

گـەر لـە خۆشەویسـتی ئەوانـدا تـەنها بانگەشـەکەرێك بیـت و پێچـەوانەی کـار و کردەوەکانی ئەوان هەنگاو هەڵبگریت و لە رەوگەی ئیستیقامەی سەر رێگەی رۆشن و بەڵگەداری ئەوان کە لەسەری بوون لاتدابێت، ئەوا تۆ بەلای تـەبایی لەگـەڵ ئـارەزووی خۆتدا لاتداوە و لە رەوگە و رێگەی ئەوان خۆت بـەدوور گرتـووە و لـە بانگەشـەکەتدا راستگۆ نیت.

شتێك لەسەر نەفسی خۆت کۆمەکەرەوە پێچەوانەی رێگە و رەوگـەی ئـەوان بێـت و واز لە بانگەشەی لەسەر رێگەی ئەوانبوون بهێنە، هەر کات ئەوەت ئەنجام دا نەزانی و درۆ لەسەرت راست دەبێتەوە، و خۆت رووبەڕووی خەشمی کەسێك کردۆتەوە کە خاوەنی ناوی "**اللطیف**" و "**الخبیر**"ە.

دانان بە هەڵەدا و داوای لێخۆشبوون لەپێشترە بۆ کەسێك ئەمە حاڵ و سیفەتی بێت.

ئەی برام، با بەشێکت لە حەقدا هەبێت، چونکە وتراوە: سەردەمێك روو لە خـەڵکی دەکات تەنها داننان بە حەقدا مایەی رزگارییە.



# رامهێنانی نەفس



گەر حەقت ناسی و دانت پیادا نا و حەق رێنمونی کردی بۆ ئەوەی کە خـودا لەگـەڵ فەرزە ئاشکراکاندا فەرزی ناوەکی لەسەر تـۆ دانـاوە و دەبـێ وەك مـافی خـودا لەسـەر خۆت جێبەجێیان بکەیت، ئەوانەش بریتین لە: راستکردنەوەی نهێنی و پەنهانی نـاوەوە و ئیستیقامەی ویست و صـدقی نیـەت و پشـکنینی هیممـەت و خـاوێنی ویـژدان لـە هـەموو ئـەو شـتانەی خـودا لای ناپەسـەندە، و پەشـیمانی لـە هـەموو ئـەو شـتانەی گوزەریان کردووە لە تەوبەلێکراوەکان بە دڵ و ئەندامەکانی جەستە لەسەر ئەوەی خودا نەهی لێکردوون.

ئەمە بارێکە زاڵـە بەسـەر کـاری ئەندامـەکانی جەسـتەدا، ئـەوەی کـار و کـردەوەی بەندەیە لە کارە ئاشکراکان بە ناوەوە قبوولْ دەکرێت، ئـەوەی تەبایـە لەگـەڵ نـاوەوەدا چاك و پاکە و ئاشکراکەی قبوولْ دەکرێت، هەموو ئەوانەش کە پێچەوانەیە و نـاوەوە تێکدەدەن کارە ئاشکراکانیان رەد دەکرێنەوە با زۆریش بن، ئەو کـات زاهـیر و دەرەوە بە تێکچوون و خراپبوونی پەنهان و ناوەوە رووبەڕووی زیان دەبێتەوە.

هەموو ئەمانە لەم ئایەتەدا کۆدەبنەوە: ﴿وَذَرُوا۟ ظَـٰهِرَ ٱلْإِثْمِ وَبَاطِنَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْسِبُونَ ٱلْإِثْمَ سَيُجْزَوْنَ بِمَا كَانُوا۟ يَقْتَرِفُونَ ﴿١٢٠﴾﴾ الأنعام: ١٢٠

هـەروەها ئـەو فـەرموودەی پێغەمبـەر (ﷺ): ((کـار و کـردەوە بـە نیەتـە، هـەموو مرۆڤێکیش ئەوەی بۆ هەیە کە نیەتی لێهێناوە))[١]

[١] أخرجه البخاري والنسائي.

هەروەها ئەو فەرموودەی كە دەفەرمویێت: ((لە مرۆڤدا پارچە گۆشتێك بوونی هەیە گەر چاك ببێت هەموو جەستە چاك دەبێت، گەر خراپ ببێت هەموو جەستە خراپ دەبێت ئەوەش بریتییە لە دڵ))[1]

هەروەها ئەو فەرموودەی كە دەفەرمویێت: ((فریشتە كار و كردەوەی مرۆڤ لە دوای مردنی لەلای خودا زیاد (زۆر) دەكات، دەڵێت: بەندەكەی خۆت، هەمیشە لەگەڵی بووم تا مراندت)) پاشان كار و كردەوە باشەكانی باس دەكات، زۆریان دەكات و چاك و باشیان دەكات و زۆر مەدح و سەنایان دەكات، خودای موتەعال دەفەرمویێت: ((تۆ پارێزەر و تۆماركەری كار و كردەوەی بەندەكەم بووی، منیش لەسەر دڵی چاودێر بووم، ئەو كار و كردەوانەی كە تۆ زۆرت كرد و چاك و باشت كرد بۆ من پاڵفتە نەكرابوون، منیش تەنها ئەوە لە بەندەكەم قبووڵ دەكەم لە پاك و پاڵفتە بێت بۆ من))[2]

بۆیە ئەی برام نەفسی خۆت بناسە، و حاڵ و بارەكانی هەڵبسەنگێنە، و لە قوڵاییەكانی ناخت بكۆڵەرەوە و رابمێنە، ئەمەش وەك گرنگیدانی تۆ بەو نەفسە و بەزەیی پێداهاتنەوەی، تۆ تەنها یەك نەفست هەیە، گەر تیابچێت ئەوە كارەسات و بەڵایەكی گەورەیە.

ئەی برام، بە سەرنجێكی تیژی چاوێكی رۆشنەوە لەو نەفسەت بڕوانە، تا ئافەتی كار و كردەوەكانی و تێكچوونی ناخی بناسیتەوە، ئەوەی زمان گۆی دەكات بناسیتەوە، پاشان جڵەوی بگرەدەست و بە "لەغاوی حیكمەت" و "صدقی سەرپێچی لەو نەفسە" لەغاوی

---

[1] أخرجه البخاري ومسلم والبيهقي.

[2] أخرجه أحمد في "الزهد".

بکـە، بـە نـەرمونیانی جـوان و شـیرین بیگێـڕەرەوە بـۆ ئـیخلاص لـە کارەکانیـدا و راستکردنەوەی ویست و لێبڕان لە ویژدانیدا و راستگۆیی لە قسە و گوفتاریدا و هاتنـە راستەی نیـەت لـە دڵدا و چاوداخسـتن لـە هـەموو ئەوانـەی مـەولا **-عـز وجـل-** لای ناپەسەندە، لەگەڵ وازهێنان لە زیادە سەرنجدان و تەماشا کردن لەو شتانەی کە لەوانەیە سەیرکردنیان موباح بێت، چونکە باوەڕی خۆشەویستی دونیا بۆ ناو دڵ رادەکێشێت.

گوێی خۆت کەڕ بکە لە شـتێك کـە مـەولا **-عـز وجـل-** بـە نەشـیاو و ناپەسـەندی دەزانێت، لە ئارەزوو و کاری خراپ و ئەنجامدانی، هەروەها خۆت بپارێزە لە گرژبوون و دڵتەنگی و کرانەوە و خۆشی نەفست.

نەفست لە هـەموو حـەز و خۆزگەیـەکی بگـرەوە و ئـەوەی مـەولا **-عـز وجـل-** لای ناخۆش و ناپەسەندە بە روویدا دابخە و دەرگای لێ مەکەرەوە.

با لەگەڵ ئەمەدا بێدار و بەئاگابیت و بێئاگاییەکان لەم بارانەدا لە دڵ بسڕیتەوە: لە هەموو جووڵە و وەستانێکدا، لە هەموو بێدەنگی و قسەکردنێکدا، لە چـوونە ژوورەوە و هاتنە دەرەوەدا، لە خۆشەویستی و رقدا، لە پێکەنین و گریاندا.

لە هەموو ئەم بارانەدا، ئەی برام، ئاگاداری بە، چونکە بۆ هەر یەکێك لەم جۆرانەی باسمان کرد نەفس هۆیەکی هەیە بۆ ئارەزووی خۆی، و هۆیـەك بـۆ گوێڕایـەڵی نـەفس و هۆیەك بۆ یاخیبوون لێی.

گەر بێئاگابوویت و لەگەڵ ئارەزووەکانیدا تەبا بوویـت و بێئاگـابووی لـە پشـکنینی نیەت و مەرامی نەفس، ئەوا هەموو ئەوەی بۆم باس کـردی و ئامـاژەم پێـدا دەکاتـە یاخیبوون، گەر تۆ بە بێئاگایی تێکەوتی و بە بێداربوونـەوە گەڕایتـەوە بـۆ سەرپێچـی

لــە ئارەزووەکــانی و پەشــیمانی لــە بێئاگاییــەکان و تێکەوتنــەکانت، ئــەوا هــەموو ئەوانەت بۆ دەبێتە چاکە و گوێڕایەڵی.

بۆیە، ئەی برام، بە چاودێری و ئاگاهییەکی ورد و جولاّوەوە لە تۆوە بۆ ئەو بیپشکنە و بەسەری بکەرەوە، بە مەبەستی ترسان لە تیاچوونی، تۆ بەو کارە ڕێگـەی یـاخیبوون لە ئیبلیس دەبڕیتەوە، و دەروازەی خێرگەلێك بە ڕووی نەفسـدا دەکەیـەوە، کۆمـەك و یارمەتی و سەرکەوتنیش تەنها لە خودای مەزن و بەرز و شکۆدارەوەیە.



# لە نێوان زمان و دڵدا



## ترسناکی زمان:

ئەی برام، نەفسی خۆت تۆمەتبار بکە، زۆرتـر و زیـاتر لـە تۆمـەتبار کردنـی خـراپترین دوژمنت.

لە زمانت بترسە، ئەی برام، زیاتر لە ترست لە دڕندەیەکی زیانبەخش نزیکـە بـەوەی پەلامارت بدات، کوژراوی دەسـتی دڕنـدە لـە ئـەهلی ئیمـان پاداشـتەکەی بەهەشـتە، کوژراوی دەستی زمان سزاکەی بریتییە لە ئاگر، مەگەر خودا لێی ببورێت.

بۆیە ئەی برام، بێئاگا مەبە لە زمانت، چـونکە دڕندەیـەکی زیانبەخشـە و یەکـەمین نێچیری بریتییە لە خاوەنەکەی.

دەرگای قسەکردن لەسەر خۆت بە داخستنێکی توندوتۆڵ دابخە، پاشان ئـەو دەرگایـە مەکەرەوە مەگەر زۆر پێویست بێت والاَی بکەی، گەر دەرگاکەت کردەوە زۆر بەئاگا بە، ئاگاداری ئەو بڕە لە قسەکردن بە کە ناچاری و پێویستییە، و پاشان دەرگاکە دابخەرەوە.

وریای بێئاگایی و پێڕاکێشان بە لە قسەدا، ئاگادار بـە قسـە راتنەکێشـێ و نەفسـی خۆت تیاببەیت، لە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) ریوایـەتکراوە بـە **"معـاذ"**ی فـەرمووە: ((بـۆ ئەوانەی لە ئاگردا بە روودا رادەکێشرێن تاوانەکەیان چیترە جگـە لـە دروێنـەی بـەری زمانیان؟!))[١]

---

[١] أخرجه الترمذي وصححه ابن ماجة.

پیاوێك پرسیاری لێ کرد و وتی: لە چی خۆم بپارێزم؟ فەرمووی: ((ئەمە)) واتە زمانت.[١]

پیاوێك وتی: لە چ شتێك زۆرتر بترسم؟ فەرمووی: ((ئەمە)) پێغەمبەر (ﷺ) دەستی برد بۆ زمانی خۆی.[٢]

پیاوێکی تر پێی وت: رزگاربوون لە چیدایە؟ فەرمووی: ((زمانی خۆت بگرە، با ماڵەکەت لە ئامێزت بگرێ و بەسەر هەڵە و گوناهەکانتدا بگری))[٣]

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((هەر کەس بێدەنگ بێت رزگاری بووە))[٤]

هەروەها دەفەرموێت: ((هەر کەس پێیخۆشە سەلامەت بێت با پابەند بێت بە بێدەنگبوونەوە))[٥]

**"عمر بن الخطاب"** سەردانی **"أبا بكر"**ی کرد -خوا لێیان رازی بێت- بینی لایەکی زمانی خۆی گرتووە و ئەی جوڵێنێ، پرسی: بۆ وا دەکەی؟ فەرمووی: ئەمە رووبەڕووی خراپەی کردمەوە.

**"عبدالله بن مسعود"** دەفەرموێت: هیچ شتێك لە زمان شایستەتر نییە بە بەندکردنی دوورودرێژ. ئەمانە و زۆرێکی تر لە هەواڵ لەمەڕ زمان.

---

١ أخرجه الهيثمي في "مجمع الزوائد".
٢ أخرجه البيهقي في "السنن".
٣ أخرجه البخاري في الفتن، وأبو داود في السنن وابن ماجة في الزهد.
٤ أخرجه الطبراني بسند جيد والترمذي بسند ضعيف.
٥ أخرجه التاهيثمي في مجمع الزوائد.

بۆیە، ئەی برام، زۆر ئاگاداری زمانت بە و لێی بێئاگا مەبە، چونکە مەزنترین ئەندامی لاشەیە بۆ تاوان و خراپە لەسەرت، زۆبەی خراپەکانی لاپەڕەی کردەوەکانت لە ڕۆژی دواییدا ئەو گوناهانەن زمان پێی کردوویت، زۆربەی ئەو خێرانەی لە لاپەڕەکەتدا دەیبینییەوە ئەو کارانەن دڵ بەدەستی هێناون.

## فەزڵی کار و کردەوەی دڵ بەسەر کار و کردەوەی زماندا

ئەمەش: بەدەستهێنانی خێر بۆ دڵی حەکیمان و ئەهلی بەصیرەت کارێکی نادیار و شاراوەیە، لە شاراوەیە، تەنانەت لە فریشتەی تۆمارکەری کار و کردەوەکان شاراوەیە، کاروکردەوەگەلێکی پاکن و دوورن لە تێکچوون، لە بەدەست هێنانیاندا ئەرك و ماندبوون لەسەر خاوەنەکەیان زۆر کەمە، پاداشتی مەزن لە پشتیانەوەیە، و لە پیلانەکانی دوژمن و ئارەزووی نەفس رزگاریان بووە و پاڵفتەکراون.

ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە کار و کردەوەگەلێکی داپۆشراون و لە چاوی بەندە شاراونەتەوە، بەندە بە پێوە و بە دانیشتن و بە پاڵکەوتنەوە دەتوانێت ئەنجامیان بدات، بۆیە ئەوانە کەسانێکی خاوەن کرۆك و فام و ژیرین: ﴿ ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ ﴾ آل عمران: ١٩١، زۆربەی زیکریان بریتییە لە بیرکردنەوە و تێڕامان: ﴿ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ آل عمران: ١٩١

ئەوانە باوەڕدارانی ئەهلی خۆپەنادان و خۆ شاردنەوەن، بەندایەتییەکیان بۆ خودا ئەنجام دا لێیانەوە دەرنەکەوت.



# رامهێنانی دڵ



## پاککردنەوەی دڵ لە هەڵپەکردن لەسەر دونیا:

خەریکی دڵی خۆت بە، ئەی بـرام، بـە هۆکارەکـانی دوارۆژ، دڵـت بـەو هۆکارانـەوە خەریك بکە و خۆت بپارێزە لە هۆکارە دونیاییەکان و باسوخواسـێك دڵ بـەرەو حـەز و هەڵپە رابکێشێت.

رێگە مەدە بە دڵت هاوەڵی شتێك بکات داواکەی سەخت و دژوار بێـت و بەهۆیـەوە نووری دڵ بکوژێتەوە، هەوڵبـدە ئولفـەت بخەیـە نێـوان دڵ و ئـەو سـەرئەنجامە باشـەی چاوەڕوانی دەکات، نەفست بترسێنە لەو سزایەی بۆی ئامادەکراوە بەهۆی گرتنەدەستی دونیا و کەمی شوکری ئەو نیعمەتانەی شوکریان لەسەر پێویست کردوویت.

ئەوەی لە دەستی تۆدایە بە زۆری بزانە، چونکە دەزانیت چەندە شـوکرکردنەکەت بـۆ نیعمەتەکان لاوازە و نەفست سەرقاڵ کردووە بە بیرکردنەوە لەوەی لەژێر دەستیدایە لـە دونیا و حەزی زیادبوونی دونیا.

گەر لە زیابوونی دونیا نەفسی خۆت ئاسوودە کرد و ترسانت لەوەی لەناو دەستیدایە لە دونیا، ئەوا قەناعەتت کردووە و رازی بوویت و خۆت لە حەز و هەڵپەی داوای دونیا پاك کردۆتەوە و بە حەز و پەلاماری کـرداری چـاکەوە گەڕاویتـەوە بـۆ دوارۆژ، نـەفس لەسەر بنچینەی تەماع بونیادنراوە، یان تەماعی دونیا یان تەماعی دوارۆژ.

## ترسەکانی تەماعبازی:

هەڵپە و حەزی دونیایی لە سەرچاوەی تەماعەوە هەڵدەقولێن، بینای نەفس لەسەر تەماع راستبۆتەوە، تەماع لە دونیا ئامرازەکانی تەماع بۆ زیادکردنی دونیا بەکاردەهێنێت، بەلاّم تەماع بۆ دوارۆژ ئامرازەکانیی تەماع بۆ زیادکردنی کار و کردەوەی دوارۆژ بەکاردەهێنێت، ئەمەش بە سووربوون و پێداگرتن لەسەریان و حەز بۆ بەدەستهێنانیان.

**وترا: بە حەکیمێك: ئامرازی تەماع چییە؟**

وتی: چڵێسی و هەڵپە، و هەڵچوونی حەزەکان، تەماعی نەفس بەسەر هەرکام لەو سیانەدا کەوت ئامرازەکانی بۆ ئامادە دەکات و ئامێرەکانی بۆ کۆدەکاتەوە و پێداگرانە دەست بە داواکەی دەکات.

گەر نەفس بۆ چوونە ژێر ئارەزووەکانی خاوەنەکەی خۆی ژێردەستە کرد ئەوا دەیکات بە کۆیلەی خۆی و زەلیل و ماندووی دەکات و رووبەڕووی سەرسامی و سەرگەردانی دەکاتەوە و ئەقڵی لێ وەردەگرێتەوە و دامێنی پیس و گلاّو دەکات و پیاوەتی و جوامێرییەکەی عەیبدار دەکات و دینەکەی رووبەڕووی فیتنە دەکاتەوە، با کەسەکەش زانا و هۆشیار و ژیر و دانا و رەوانبێژ و فەقیە بێت، ئەو پیسی دەکات و دەیڕوخێنێ و سووك و رسوای دەکات، هەموو ئەمانەی بەسەر دەهێنێت، لە زانایەکی خاوەن ئەدەبەوە دەیگۆڕێت بۆ نەزانێکی گەمژەی سووك و کاڵفام.

هەموو ئەمانەش: چونکە پیاڵەیەك شەرابی ژەهراوی لە تەبایی لەگەڵ نەفسدا نۆش کردووە، ئەوەش تووشی هەڵنانی کرد و زانست و ئەقڵ و تێگەیشتنی لەدەستدا و

حیکمەت و بینینی کوژاندەوە و لەگەڵ حەزەکانی نەفسدا جاری بوو، ئەو کات لەلای حەکیمان و مەند و رەندەکان رسوایی لەم دونیایەدا بۆ پێشخست، لە خۆشییەکانی خودا بێبەشی کرد، و لەبەرچاوی بەندەکانی خودا لە ئەهلی بەصیرەت بەربوویەوە، و پەشیمانی و تەوبەی لێ دواخست هەتا کاتی جیابوونەوە لە دونیا و گەیشتن بە سارای رۆژی مەحشەر.

## ژێربار کردنی نەفس بۆ داوای دوارۆژ:

کاتێك بەندە لە هۆکارە دونیاییەکان تەماعی بڕی و بە ئەقڵ زاڵ بوو بەسەر ئارەزووەکانیدا، ئەوا بەبێ هیچ گومانێك تەماعەکەی دەگێڕێتەوە بۆ سەر هۆکارەکانی دوارۆژ، چونکە ئەوانیش لەسەر تەماع بیناکراون.

کاتێك لە هۆکارە دونیاییەکان خۆی دادەڕنێت و لە دروستکراوەکان نەفسی بێهیوا دەبێت، ئەوا حەز و تەماعی نەفس دەگەڕێتەوە بۆ هۆکارەکانی دوارۆژ، بۆیە سەرومڕ و پێداگرانە دەکەوێتە داوای دوارۆژ و کۆشش دەکات و پشت لە دونیا دەکات و لە ئارەزوو جیا دەبێتەوە و سەرپێچی لە دوژمنەکەی دەکات و شوێنی زانست دەکەوێت و نەفس دەبێت بە وڵاخی سواری بۆ ئەقڵ و ئارام دەگرێت لەسەر تالاّوی ئەوەی حەق ئاماژەی بۆ دەکات، بۆیە رزگاری دەبێت و دەبێتە رزگارکەر بۆ کەسەکە.



# ترس و دڵتەنگی



## وەسیلەی بەدەستهێنانی ترس و دڵتەنگی:

ئەی برام، ئاگات لە حەز و خۆزگە و ویستی دڵت بێت، بیری رۆژی دوایی تێیدا بچێنە، لە دڵی خۆت جیا مەبەرەوە، ئەندێشەی ئەو ساتە بکە لە دونیا جیادەبییەوە، بیر لەوە بکەرەوە چۆن ئەهلی دونیا هەموو ئەوە بەجێدەهێڵن کە بۆ خۆشییەکانی دەروونیان فەراهەمیان هێنا کردبوو، حەیا و حورمەتی خۆیان بۆ دونیا پیس کرد و ئەخلاق و پیاوەتیان لەدەستدا و ئایینی خۆیان هەڵوەشاندەوە، پاشان هەموو ئەوەیان بەجێهێلا و بە تاك و تەنها بۆ لای خودا گەڕانەوە، لەگەڵ ئەو نامۆبوونەی لە گۆڕدا روویان تێدەکات و پرسیاری مونکەر و نەکیر و ترسەکانی رۆژی دوایی و وەستان لە بەردەم خودادا و پرسیار لێکردن لە هەموو قسە و کردارێك کە لەوان وەشاوەتەوە بە نموونەی گەردیلەیەك یان دەنکە رەشکەیەك.

پرسیاری خودا لەسەر لاوێتییەکەی لە چیدا بەختی کردووە، هەروەها پرسیار لە تەمەن چۆن بەسەری بردووە، پرسیار لە ماڵ و سامان چۆن بەدەستی هێنا و لە کێی گرتەوە، و چۆن سەرفی کرد، پرسیار لە زانست چ کارێکی پێ ئەنجام دا، هەر بەو جۆرە پرسیار لە سەرجەم کار و کردەوەکانی لە کامەیاندا راستی کرد و لە کامەیاندا درۆی کرد.

ئەی برام، گەر دڵی خۆت بەمانەوە خەریك کرد و لەناو دڵدا نیشتەجێت کردن و شتێك لە دروستی ڕێکخستنی ئەقڵت لەلا بوو، ئەوا زمانت کوڵ دەبێت و لە قسە دەکەویت، و ترسی پێویست لێت جیانابێتەوە لەگەڵ حوزنێکی هەمیشەیی و سەرقاڵی ئابڵۆقەدەر بە دڵت.

## ئیبلیس حەزی بە دڵی وێرانە:

ئیبلیس بە قەلای دڵی تۆدا سەردەکەوێت لە کاتی گوناهدا بەهۆی وەسوەسەی نەفس و وێرانی دڵەوە.

وێرانبوونی دڵ ئەوەیە کە خاڵی بێت لە ترسی پێویست و دڵتەنگی هەمیشەیی، ئەو کات فووی وەسوەسەی پێدا دەکات بۆ هیوا و خۆزگەکانی دونیا و کۆکردنەوەی دونیا و ترسان لە هەژاری، لەگەڵ پەیوەستبوونی هیوا و ئاواتی دوور و درێژ بە دڵتەوە و پشت هەڵکردنی لە خودای موتەعال، و نەمانی هەستکردن بە مەزنی خودا لە دڵدا و خاڵیبونەوەی لە ترس و هەیبەت و حەیا بەرانبەر بە خودا.

کاتێك ئیبلیس دڵێکی ئاوەدان دەبینێتەوە دەچێتە دواوە و بزر دەبێت و لێی هەڵدێت و ڕێگەیەکی شیاوی تێدا نابینێتەوە، و بە دەوروبەری دڵدا کەلەبەرێك نابینێتەوە لێیەوە بچێتە ژوورەوە، چونکە دڵەکە ئاوەدانە بە ترسان لە خودا حوزن و بیرکردنەوە، بۆیە ئەو دڵە نوورانی و ڕۆشن و درەوشاوەیە.

بەندە بە نووری دڵی خۆی دەرچەکانی شەیتان بۆ ناو دڵی دەبینێت، بۆیە کاتێك بانگی لێ دەکات وەڵامی ناداتەوە، دەست بە نوورەی دڵیەوە دەگرێت کە خودا

کۆمەکی ئەوی پێ کردووە، بۆیە ئیبلیس رووبەڕووی شکست و دۆڕان دەکاتەوە، شەیتانی چەپەڵ هەمیشە روو لە دڵێك دەکات کە ترسی تێدا نییە و وێران و تاریك بووە و نووری تێدا نەماوە.

هیچ شتێك بە ئەندازەی نوور لەسەر شەیتانی چەپەڵ قورس نییە، کاتێك نوور دەبینێتەوە دەچێتە دواوە و لێی هەڵدێت، ئەو ناتوانێت زاڵ بێت بەسەر ئەو دڵەدا مەگەر لەو کاتانەی بێئاگایی رووی لێ دەکات.

نووری دڵ بۆ کەسێکە ئامۆژگاری پێ وەردەگرێت و زیندەگی پێ بەدەست دەهێنێت، کاتێك بێئاگا دەبێت دڵ دەمرێت و تاریك دەبێت و نوورەکەی دەکوژێتەوە، هاتنە ژوورەوەی دوژمنەکەی لێ تێکەڵ دەبێت یان دڵی لێڵ و تەمومژاویی دەکات، بۆیە لەو بارەدا ئیبلیس پەلامارێکی بەندەی بێئاگا دەدات، کەسەکە لە بێئاگایی بەردەوام دەبێت، گوناه و خراپە رووی لێ دەکات، گەر بەردەوام بوو لەناو ئەو گوناه و خراپانەدا و پێیان رازی بوو پەردەیەك بەسەر دڵدا دێت و بە تەواوی تاریکی دەکات، شەیتان تیایدا نیشتەجێ دەبێت، پاشان رێگەی گوناه و خراپە و تاوانی زۆرتری پێ دەگرێتە بەر، تا دەیخاتە ناو تاوانە گەورەکانەوە.

هیچ شتێك بە ئەندازەی تاریکی و رەشی دڵ و کوژانەوەی نوور و کەوتنی پەردە بەسەر دڵدا شەیتان سەرسام و دڵخۆش ناکات، هیچ شتێکیش بە قەدەر نوور و سپێتی و پاکێتی و پاڵفتەبوون لەسەر شەیتانی چەپەڵ قورس نییە، ئەو هەمیشە تاریکی شوێن و جێگەیەتی و لەناو نوور و سپێتیدا شوێن و جێگەیەك بۆ ئەو بوونی نییە.

پێم گەیشتووە پێغەمبەر (ﷺ) لای ناپەسەند بووە بڕواتە ناو ماڵی تاریکەوە تا بە چرایەك بۆیان رۆشن دەکردەوە.

# چاودێری خودای موتەعال



## چ مانەیەك هەیە لەسەر چاودێری:

**لە هەندێك لە حەکیمانەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی:** بەرزترین و چاکترین مەقام بریتییە لە چاودێری بۆ خودا.

**باشترین چاودێری:** ئەوەیە بەندە بە شوکرکردن لەسەر نیعمەت و دانانی بە گوناه و خراپەدا خۆی بخاتە بەر داوای لێبوردن بۆ خراپەکانی، ئەو کات دڵی پابەند دەبێت بەم مەقامەوە لە هەموو کار و کردەوەکانیدا، هەر کات بێئاگایی دایدەگرێتەوە دەیگێڕێتەوە بۆ ئەم کارە بە مۆڵەتی خودای موتەعال.

**هەروەها لە ماناکانی:** وازهێنان لە گوناهان و یەکلابوونەوە لە سەرقاڵی دونیا و گرنگیدان بە پێداچوونەوە.

**هەروەها لەو کارانەی کە دڵ پاك دەکەنەوە و گەشەی پێ دەدەن بریتیین لە:** ئیخلاص و متمانە و شوکر و تەوازوع و خۆڕادەست کردن بە خودا و نەصیحەت و خۆشەویستی بۆ خودای موتەعال و رق و تووڕەبوون بۆ ئەو.

**وتراوە:** کەمترین نەصیحەت ئەوەیە: وازهێنان لە نەصیحەت رووبەڕووی تەنگەتاویت بکاتەوە و نەتوانی کاری پێ نەکەیت، هەر کات کەمتەرخەم بووی لە نەصیحەت خۆت وا ببینیت لە خودای موتەعال یاخی بوویت بەهۆی وازهێنان لە نەصیحەت بۆ بەندەکانی، کەمترینی ئەوەش: هیچ شتێکت بۆ بەندەکانی خودا پێ خۆش نەبێت کە لای خودا

ناپەسەند بێت، هەروەها هیچ شتێك بۆیان لا نـاخۆش نـەبێت کـە لای خـودا -**عـز وجـل**- پەسەند و خۆشەویست بێت.

ئــەم حالــەی کــە وەســفمان کــرد لەســەر خــەڵکی پێویســت(**واجــب**)ە، بــۆ تــەنها چاوتروکانێکیش ناتوانێت وازی لێ بهێنێت، نە بەناخ و نە بەکاری ئەندامەکانی جەستە.

حاڵێکی تر هەیە لەسەرو ئەمەوە، ئەمەیان وەك فەزیلـە وایـە بـۆ بەندەکـە، ئـەوەی خودا پێی ناخۆشە و لای ناپەسـەندە بـۆ بەنـدەکانی ئـەویش بـۆ ئـەوان لای نـاخۆش و ناپەسەند بێت، هەروەها ئەوەی خودا پێیخۆشە بۆیان ئەویش پێیخۆش بێت بۆ ئەوان.

**دەڵێت:** پیاوێك هات بۆ لای "**عبدالله بن المبارك**" و پێی وت: ئامۆژگاریم بکە، پێی فەرموو: "چاودێری خـودا بکـە"، پیاوەکـە وتـی: چـاودێری خـودا چییە؟ فـەرمووی: "ئەوەیە شەرم لە خودا بکەیت".

## چاودێری و موناجات لە یەقینەوەیە:

دەڵێت: موناجات و چاودێری لەو شوێنەی دڵی خۆتی تێدا دادەنێیت، ئەوەیە: کە لە خوار عەرشەوە دڵت دابنێیت و لەوێوە موناجات بکەیت.

**لە گێڕانەوەی دڵ بۆ چاودێری دوو پێداچوونەوە هەیە:**

**یەکەمیان:** چاودێری سەرنجدان، لەگەڵ یادهێنانەوەی زانست، خودای موتەعال دەفەرموێت: ﴿ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾ هود: ٥، ئەو زانایە بە ختورەی سینە و ئەوەی پیایدا گوزەر دەکات. هەروەها دەفەرموێت: ﴿ أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَانِ ٱلرَّجِيمِ أَعُوذُ بِٱللَّهِ ﴾ غافر: ١٩، خیانەتی چاو و ئەوەی سینە حەشاری دەدات دەزانێت و لێی بەئاگایە.

**قسەکەی تریان:** دەگێڕنەوە کە خودا (**سبحانه**) وەسێتی بۆ ئیبراهیم (**علیه السلام**) کرد و پێی فەرموو: ((ئەی ئیبراهیم، تۆ دەزانیت بۆچی من تۆم کرد بە خەلیلی خۆم؟ فەرمووی: نەخێر، ئەی پەروەردگارم، فەرمووی: بەهۆی راوەستان و مانەوەی دوور و درێژت لەبەر دەستی مندا))، وتی: بۆیە وتراوە: راوەستان و مانەوەی ئیبراهیم لەبەر دەستی خودادا بە دڵ بووە، نەك بە نوێژکردن.

ئەمەش تەبایە لەگەڵ قورئان کە دەفەرموێت: ﴿ أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾ ص: ٤٦، هەروەها فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ): ((خودا بپەرستە وەك ئەوەی بیبینیت))[١]

هەروەها فەرموودەکەی "الحارثة" و ئەو قسەی کە دەفەرموێت: ((وەك ئەوەی تەماشای عەرشی پەروەردگارم بکەم لەبەر چاوم بەرجەستە بووبێت))[٢]

## لە ئادابەکانی چاودێری:

**هەروەها دەڵێت:** بەرزترین کار لە پلە و پایەدا: ئەوەیە خودا بپەرستی بە خۆشی و سرووری مەولاوە -**عز وجل**- پاشان بیپەرستی لەسەر بە مەزنڕاگرتنی، پاشان لەسەر شوکرکردنی، پاشان لەسەر ترسان لێی، دواهەمینیان بریتییە لە پەرستنی خودا لەسەر ئارامگرتن بۆ خودا.

**ئارام گرتنیش چەند روویەکی هەیە:** بەزۆر ئارامگرتن (**تصبر**)، لەگەڵ ئارامگرتنی جوان (**صبر جمیل**)، پاشان لەوە دێیە دەرەوە بۆ ترسان لە خودا و ئەوجا شوکر و پاشان بۆ بەمەزن زانین و پاشان خۆشی و سروور.

---

[١] أخرجه البخاري في الإيمان ومسلم في الإيمان وأبو داود وابن ماجة والترمذي والنسائي.

[٢] أخرجه البخاري ومسلم وأبو داود والنسائي.

هەر کەس زوهدی لە دونیا دەوێت با ئەو زۆرەی لە دەستی خەڵکیدایە بە کەمی بزانێت، با کەمی ئەوەی لەژێر دەستی خۆیدایە لە دونیا بە زۆری بزانێت، با خراپە و ئازارە مەزنەکانی خەڵکی بۆ ئەو بە بچووك تەماشا بکات و ئەو کارە خراپە بچووکەی لە ئەوەوە بۆ ئەوان دەڕوات بە مەزن تەماشا بکات.

**هەروەها دەڵێت:** گەر نەفست بانگی کردی بۆ ئەو شتەی کە دابڕانی پێ دەکەی لە بەشی خۆت، ئەوا دادوەرێك لە شەرم کردن لە خودا بخە نێوان خۆت و نەفسەوە.

**هەروەها دەڵێت:** ژیران و هۆشمەندان کاتێك نەفسیان بانگیان لێ دەکەن بۆ دابڕان لە ڕێگەی ڕزگاری بە فێڵەکانی نەفس، بە شەرمکردن لە خودای موتەعال دادگایی دەکەن، بۆیە بڕیاری دادگای شەرمکردن زەلیلی دەکات.

**هەروەها دەڵێت:** دەرچەی فریوخواردن لە گومانی باشی دڵەوەیە، گومانی باشی دڵیش لە هەستانەوەیە بۆ خودا لەسەر ئەو شتەی لای ناپەسەندە، پاشان لە درۆی نەفسەوە.

**هەروەها وتراوە:** لە نەصیحەت ئەوەیە پێتخۆش بێت هەموو خەڵکی لە تۆ باشتر بن.

**هەروەها:** لای **"ابن المبارك"** باسی ئەوە کرا عابیدێك بەبێ فیقه خودا دەپەرستێت، فەرمووی: ((خۆزگە دەریایەك لە نێوان من و ئەودا هەبوایە))

**هەروەها:** هەر کەس بۆ خودا دابڕابێت لەسەر خەڵکی ئارام ناگرێت، هەر کەس بۆ لای غەیری خودا دابڕابێت بۆ لای خەڵکی ئارامی لێ دەبڕێت.

**هەروەها:** ((هەر کەس قورئان بخوێنێتەوە چییەتی لە قسەی خەڵکی))

**هەروەها:** تەنها چەند ڕۆژێکی کەمی دونیایە، چی دەبێت گەر مرۆڤ نەفسی خۆی بە خودا ببەخشێت؟

**هەروەها:** تەوازوع بۆ خودا زەلیلی دڵە.

**هەروەها:** یەکەمین نیعمەت ناسینی زانستە کە بەهۆیەوە فەرزەکان بۆ خودا جێبەجێ دەکرێن، پاشان تەندروستی و پاشان دەوڵەمەندی و پاشان ئەقڵ.

**هەروەها:** بۆ بەندە نییە بڕیارەکانی مەولای خۆی ڕەد بکاتەوە، بۆیە پێویستە لەسەری ڕازی بێت بەو بڕیارەی مەولا بەسەریدا دەریدەکات، پێویستە لەسەری ئارام بگرێت، دوو حاڵ بۆ بەندە بوونی هەیە: حاڵێك تەبایە لەگەڵ ڕازیبوون بەوەی پێیخۆشە، لەگەڵ حاڵێك تەبایە لەگەڵ ئارامگرتن لەسەر ئەوەی پێیناخۆشە.



# عەدل و فەزڵ



## شەریعەتی عەدل و شەریعەتی فەزڵ:

بسم الله الرحمن الرحیم...

**لە هەندێ لە حەکیمانەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی:** ڕێگەی دوارۆژ یەك ڕێگەیە، **خەڵکیش تیایدا دوو دەستەن:** دەستەیەکیان ئەهلی عەدلن و دەستەی دووەمیان ئەهلی فەزڵن.

**عەدلیش دوو عەدلە:** عەدلێکی ئاشکرا و دیار لە نێوان خۆت و خەڵکیدا، لەگەڵ عەدلێکی شاراوە لە نێوان تۆ و خودادا.

**ڕێگەی عەدل بریتییە** لە ڕێگەی دامەزراویی و ڕاست وەستان (**الإستقامة**)، و ڕێگەی فەزڵیش بریتییە لە ڕێگەی داوای زیادە.

ئەوەی لەسەر خەڵکی پێویستە بەکارکردن پێیەوە پابەند بن بریتییە لە ڕێگەی ئیستیقامە، بەڵام گرتنەبەری ڕێگەی فەزڵ لەسەریان پێویست نەکراوە.

ئارامگرتن و زیادە خۆپارێزی (**الورع**) لەگەڵ عەدلن ئەم دوانە پێویست (**واجب**)ن، زوهد و ڕازیبوون لەگەڵ فەزڵن، ئەم دوانە واجب نین، میانەگیری لەگەڵ عەدلدایە و ئیحسانیش لەگەڵ فەزڵدا.

ئەو کەسەی عەدل سەرقاڵی بکات لە فەزڵ بیانوو و پاساوی خۆی هەیە، بەڵام هەر کەس فەزڵ لە عەدل سەرقاڵی بکات ئەوە فریوی خواردووە و شوێنی ئارەزووی نەفسی

خۆی کەوتووە، ناسینی عەدل لەسەر مرۆڤ پێویستە، بەڵاّم ناسینی فەزڵ لەسەری پێویست نییە مەگەر خۆبەخشانە هەوڵی بۆ بدات.

هەر بەو جۆرە هەر کارێك ئەنجامدانی لەسەر بەندە واجب نەبێت زانستەکەی لەسەری واجب نییە.

## سیفەتەکانی ئەهلی عەدل:

بەندە نابێت بە ئەهلی عەدل بە سێ خەسڵەت نەبێت: بە زانست تا بزانێت چی بۆ ئەوە و چی لەسەر پێویستە، بە کردار، و بە ئارامگرتن.

بۆیە کلیلی عەدل کە زۆر بۆ بەندە پێویستە و واجبە لەسەری: قەدری نەفسی خۆی بزانێت و بیناسێت، لەسەرو مەنزیلەی خۆیەوە داینەنێت، دەرەوەی مرۆڤ شێوەی ناوەوەیە.

لێبڕاوترین مرۆڤ لە عەدلدا و نزیکترین کەس بە وەرگرتنی عەدل: ئەو کەسەیە کە پێداچوونەوە بۆ نەفسی خۆی دەکات لە هەموو خەیاڵ و خەتورەیەکدا کە نەفس حەزی لێ دەکات، یان حەزی لێ ناکات، سەرنجی ئەوە دەدات، وەك ئەوەی خەڵکی ئاگادار بن بە حاڵەکەی شەرم بکات لە خۆی یان پێیناخۆش بێت، بۆیە لەو حاڵەوە دەگوێزێتەوە بۆ حاڵێك کە شەرمی لێ نەکات، ئەو شتەی شەرمی لێ ناکرێت پێچەوانەی ئەوەیە کە شەرمی لێ دەکرێت.

گەر حاڵەکەی گواستەوە و بەردەوام بوو با سەرنج بدات، گەر نەفسی حەزی کرد خەڵکی لێی بەئاگا بن با لەو حاڵەشەوە بگوێزێتەوە بۆ حاڵێك کە نەفس حەزی بە ئاگاداربوونی خەڵکی نییە لە کارە باشەکانی، چونکە ئەو شتەی نەفس حەزی لێ

دەکات دژی ئەوەیە حەزی لێ ناکات، بۆیە بەندە بـە هەمیشـەیی دژی ئەوەیـە نـەفس حەزی لێ دەکات.

## دوورترین کەس لە عەدلەوە:

دوورترین کەس لە عەدلەوە ئەو کەسەیە کە زۆرتـرین بێئاگـایی هەیـە لـە چـاودێری ناوەوەی خۆی، و کەمترین دادگایی هەیە بۆ نەفسی خۆی، هەروەها دوورترین کەس لە عەدلەوە ئەو کەسەیە کە بێئاگاییەکەی لەو چاودێرییە درێژترین بێئاگاییـە و زۆرتـرین ساردی و گوێپێنەدانی هەیە بۆی.

گەر بتزانیبایە چاودێری کێ دەکەیت پاشـان ئەندامـەکانت پارچـە پارچـە بوونایـە و دڵت لەت لەت و بە زەویدا سەری خۆت هەڵبگرتبایە هێشتا تۆ بەو کارەت کەسـێکی نەزان بوویت.

هەتا تێنەگەی و نەژنەوی و خاوەن هۆش و فام نەبیت شەرم و ترس و ئاگاهی خـودا بەسەر ناختدا و زانستی ئـەو(**سـبحانە**) بـەوەی هەسـتەکانت رەوانـەی دڵـی دەکـەن و دەسەڵاتی ئابلۆقەدەری بە تۆ لە چاودێری خوداوە نابینێتەوە، کەچی لـە دوای ئـەوەش وەك کەسێکی بێباك بە خودا پشتت هەڵکرد و رووت لە چاودێری کەسـانێك کـرد کـە بەئاگا نین لەناخ و دەروونی تۆ و زانستیان نییە بە پەنهانەکانی نـاوەوەت، وتـت: گـەر خەڵکی بەئاگا بێت لەوەی لەناو دڵمدایە پشتم لێ دەکەن و رقیـان لـێم دەبێـت، بۆیـە ترس و حەیا لەوان داگیری کردیت، لە ترسی کەمبوونەوەی مەنزیلەت و روخانی پلە و پایەت لەلای ئەوان، بۆیە بەو کارەت تۆ چاودێری ئەوان دەکەی، و لە ئەوان دەترسی و

بیر لە رق و خەشمی ئەوان دەکەیەوە، کەوابوو تۆ هێشتا بیرت لە رق و تووڕەبوونی خودا نەکردۆتەوە و بیرت لە روخانی پلە و پایەت لە لای ئەو نەکردۆتەوە.. رق و تووڕەبوونی خودا لە هەموو رق و تووڕەبوونێك گەورەترە.

پاشان گەر شتێك لە کاری چاکەت ئەنجامدا کە لە خودا نزیکت دەکاتەوە، گەر ئەوان لێی بەئاگابوون دڵت تەرخان دەکەیت بۆ خۆشەویستی حەمد و سەنایان لە سەر ئەو کارە باشەی ئەنجامت داوە و پێتخۆش دەبێت مەنزیلەیەك لەلای ئەوان بەدەست بهێنیت.

گەر شتێك بوو لە خودا پێی نزیك دەبوویەوە لە کارێکی چاکە بە ئیخلاصەوە، یان بە کاری ئەندامەکان، گەر ئەو کارە نهێنی بوو پێتخۆشە لێت بەئاگا بن و لەسەری حەمدت بکەن و لەوێوە پلە و پایەت هەبێت لەلایان.

تۆ رازی نەبووی بە ئاگابوونی خودا -**عز وجل**- لە کارەکەت و پاداشتی خودا لەسەر ئەو کارە نهێنییە و کاری ئاشکرات، تۆ بەو رەفتارەت رازی و قانعی، لەوێشەوە بێئاگا و پێڕاکێش و فەخرکەر و خەڵەتاوی، ئەم حاڵە لەلات باشترین حاڵی تۆیە و لێبڕاوەنەترین کار و کردەوەتە.

گەر تەنها بە خودا و بە ئاگاهی ئەو لەسەر خۆت بێنیاز بوویتایە و بیرت لە پاداشتی خودا بۆ ئەهلی گوێڕایەڵی و خۆشەویستی و کۆمەك و یارمەتی و رێنموونی ئەو بۆیان و چاودێری کردنیان، ئەوا ئەو باوەڕە بێنیازی دەکردی لە کەسانێك کە نە بۆ تۆ و نە بۆ خۆیان توانای بەخشینی قازانج و زەرەریان نییە.

ئەو(**سبحانه**) رازی بووە بەوەی چاودێری بکەی لە کار و کردەوەکانتدا، خۆزگە تۆش بتوانیبایە ئەو چاودێرییە بە دروستی ئەنجام بدەی.

نزیکترین فەزڵ بە تۆ و بەسوودترینیان ئەوەیە کە نەفست نزمتر لە قەدەری خۆی دابنێیت، هەروەها ناوەوەت باشتر بێت لە دەرەوەت و مافەکانی خەڵکی بەجێبگەیەنیت و مافی خۆتیان لێ وەرنەگریت و لە کارە هەڵەکانیان ببووریت و بەرانبەریان بە ویژدان بیت و داوای ویژدانیان لێ نەکەیت بۆ خۆت.

ئەو کارەش پاکبوونەوەیە پاشان کردار... پاکبوونەوە لەپێشترە بۆ ئێمە لە کردار.



# پاککردنەوە و کار



## گرنگی خۆپاکردنەوە لە ئافەتەکان بەر لە کردار:

**خۆ پاککردنەوە بریتییە لە:** گواستنەوە لە شەڕەوە بۆ لای بنچینەیەك کە خێری لەسەر بینا دەکرێت..

هەر کەس پێش کردار پاك نەبێتەوە ئەوا شەڕ ڕێگری دەکات لە بەندە بۆ سوودبینین لە خێر، بۆیە وازهێنان لە شەڕ بۆ بەندە لەپێشترە، پاشان بەدوای خێردا بگەڕێت.

نەفس لە پاکبوونەوە دەکەوێتە سکالاَ و بێزاری و هەڵدێت بۆ لای کار و کردەوەی گوێڕایەڵی، بەهۆی قورسی پاکبوونەوە لەسەر نەفس و سووکی کار و کردەوەی گوێڕایەڵی بەبێ پاکبوونەوە.

گەر پاکبوونەوەکان پێشی کاری گوێڕایەڵی کەوتبێت و کارەکان ئاسان بن لەسەری بەهۆی مەزنی کاری پاکبوونەوەوە، ئەوا کەسەکە پێویستی هەیە بە زانینی هۆکارەکان کە خێر(کاری چاکە)یان لێوە دەخوازرێت، گەیشتنیش بە خودا کارێکی زەحمەتە.

هەر کەس گرنگیدانی هەیە بە نەفسی خۆی و ترسی ئەوەی هەیە تیابچێت بە دوای وردەکاری هۆکارەکاندا دەگەڕێت، ئەمەش بە وردەکارییەکانی ژیری و و تێگەیشتنی قووڵ تا بەدەستیان دەهێنێت، کاتێك گەیشتە ئەو هۆکارانە دەستیان پێوە دەگرێت و کاریان لەسەر دەکات، چونکە مەعریفە بۆ ئافەتەکانی کردار پێش کردارەکەیە، زانینی و ناسینی ڕێگە بەر لە گرتنەبەریەتی، بەندە ئاتاجی ناسینی نەفس و ئارەزووەکانی

نەفسە، ئاتاجی ناسینی دوژمنەکەیەتی، ناسینی شەڕ گرنگترە گەر کەسەکە ژیر بێت، ئەو بۆ لای زانستی شەڕ ئاتاجترە گەر ژیر و دانا بێت و گرنگی بدات بە نەفسی خۆی.

چونکە بەندە پابەند نییە بەکارکردن بەهەموو خێرێك، بەڵام پێویستە بەندە لە هەموو شەڕ خۆی بەدوور بگرێت، هەر کەس شەڕێك واز لێ بهێنێت دەکەوێتە ناو خێرەوە، مەرج نییە هەموو ئەوانەی کار دەکەن بە خێر کاریان ئەنجام دابێت و ئەهلی خێربن.

مەعریفەی بەندە بۆ شەڕ زانستی خێر و شەڕی تێدایە، بەڵام لە مەعریفەی خێردا هەردوو زانستەکەی تێدا نییە، چونکە هەر کەسێك خێر لە شەڕ جیادەکاتەوە شەڕ کەنار دەدات و خۆی کەنار دەدات لە شەڕ، هەموو ئەوەی دەمێنێتەوە لەدوای ئەوە بریتییە لە خێر، لەوانەیە خێر بناسێت و ئەو شەڕەی کە تێیدایە پێی جیانەکرێتەوە، هەروەها ئەو ئافەتانەی خێر تێکدەدەن و پووچ و بەتاڵی دەکەنەوە نەناسێتەوە، چونکە خێر تێکەڵە و لەگەڵ شەڕدا ئامێزانن، بەڵام شەڕ سەراپای شەڕە.

## شەیتان بە خێر و شەڕ خەڵکی گومڕا دەکات:

دوژمنی چەپەڵی خودا خەڵکێکی زۆری بە خێر گومڕا کردووە، خەڵکێکی زۆریشی بە شەڕ گومڕا کردووە، ئەوانەی بە خێر گومڕای کردوون بۆ کەمی مەعریفەیان دەگەڕێتەوە بەهۆی تێکەڵ بوونی خێر و شەڕ بە یەکتر، ئەوان مەعریفەی ئەوەیان نەزانی، نەفسیان ئەندێشەی بۆ دروست کردن گوایە لەسەر خێر و هیدایەت و ڕێگەی خۆشەویستی و ئیستیقامەن، ئەوان لە خودا گومڕا و سەرگەردانن و لە ڕێگەی خۆشەویستی و ئیستیقامە لایانداوە.

ئەمەش بەهۆی زۆری ئەو ئافەتانەوە کە تێکەڵ بە کار و کردەوەکان دەبن، و کەمی زانستی کارکەران بەو ئافەتانە، **فإنا لله وإنا إليه راجعون**.

## داوا لەسەر قەدری مەعریفە:

چەندە خەڵکی لە نەفس و ئارەزوو دوژمنەکەیان بێئاگان! پەنا دەگرین بە خودا لە بێئاگایی و تێکەوتن و لەبیرچوونەوە کە مرۆڤ رووبەڕووی هەڵدێر دەکاتەوە و کار و کردەوەکان دەشێوێنێت.

لەپێشترە: ئەو کەسەی واز لە شەڕ دەهێنێت وازهێنانەکە بە ئەندازەی زانینی زەرەرەی شەڕەکەیە، ئەو راوەستاوە بە ئەنجامدانی فەرزی نزیکبوونەوە لە خودا زۆرتر و زیاتر، داواکەری خێر داواکەی بەپێی ئەو شتەیە کە رجای دەکات و سوودەکەی دەزانێت، هەروەها لە زانینی ئەوەی کە زانست شتێکە و کردار شتێکە و سوود و قازانج شتێکی تر، لەوانەیە کەسەکە بزانێت و کاری پێ نەکات، لەوانەیە زانست و کرداری هەبێت و سوود و قازانجی نەبێت، لەوانەیە زانست و کردار و سوود و قازانجی هەبێت، بەڵام دوای ئەوە پووچبوونەوە و پووکانەوەی بەسەردا بێت، لەوانەشە بزانێت و کاربکات و سوود و قازانج ببینێت و سەلامەت ببێت و تەواو ببێت.

۞ ۞ ۞

## ئەو خەسڵەتانەی خێریان لیّ داوا دەکریّت



داواکەری خێر  لە پێنج خەسڵەت بێنیاز نییە، جگە لەوەی ئاتاجە بە زانستی سنووری کردارەکان و ئەحکامەکانیان و جێبجیّ کردنیان بە خودا بە شێوەکی پاك و پڕ لە ئیخلاص، تێکەڵ بن بە صدق وەك ئەوەی فەرمانی پێکراوە و فەرزکراوە و لە سوننەتدا هاتووە، هەروەها لەو کاتانەی کە ئەمری کردووە و فەرزی کردووە.

هاوەڵی خێری کارکەر بە خێر بێنیاز نییە لە: دروستیی و صدق و  شوکر و رجا و ترس.

### دروستیی ( الصواب ):

**دروستیی** بریتییە لە سوننەت، سوننەت بریتی نییە لە زۆری نوێژکردن و زۆری رۆژووگرتن و صەدەقە و خێر کردن، هەروەها بریتی نییە لە ئەقڵ و تێگەیشتن و حیکمەتی دەگمەن، هەروەها بریتی نییە لە گەیاندن و ئامۆژگاری، بەڵکو بریتییە لە شوێنکەوتن و خۆڕادەست کردن(**الإتباع والإستسلام**) بۆ کتێبەکەی خودا -**عز وجل**- و سوننەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) و ئیمامانی راشیدین لە دوای ئەو.

هیچ شتێك بە ئەندازەی ئەقڵ تۆمەتی توند و زەرەری گەورە ناداتە پاڵ سوننەت، هەر کات بەندە ویستی بە ئەقڵ و تێگەیشتن (**العقل والفهم**) رێگەی سوننەت بگرێتە بەر ئەوا پێچەوانە لەگەڵی دەوەستێتەوە و رێگەیەکی تر جگە لە رێگەی سوننەت دەگرێتە بەر.

## صدق:

**صدق** بریتی لە چوار شت: کار ئەنجام بدەیت و پاشان لەسەری پاداشت و شوکر لە خودا داوا نەکەی و کارەکەت بە منەت و ئازار پووچ نەکەیەوە، هەروەها لە جۆرەکانی صدق صدقی زمانە لە قسەکردندا، هەندێ جار صدق لە حاڵێدا بە زمان دەردەبڕێت، هەروەها ئەو یاخییە لە خودا لە صدقەکەیدا ئەو کەسەش بریتییە لە غەیبەتکەر و گوێزەرەوەی قسە لە نێوان خەڵکیدا.

## شوکر:

**شوکر** بریتییە لە ناسینی تاقیکردنەوە، گەر ئەوەی زانی کە هەموو نیعمەتێك لە خوداوەیە نەك لە کەسانی ترەوە، و تاقیکردنەوەیەکە بەندەکەی پێ تاقیدەکاتەوە، ئایا شوکر دەکات یان کوفر دەکات، هەموو لادانێکی شتی خراپ لە بەندە خودا لایداوە و ئەو بکەرەکەیەتی، تاکو بەندەکەی شوکری بکات یان کوفری نیعمەتەکەی بکات، ئەمە لە شوکرە.

گەر بەندە ئەوەی زانی کە شوکرکردنیش لە خوداوەیە، و لە ریزی نیعممەتەکان سەرژمێری کرد، کەسی تری تێدا بەشدار نەکرد: نە نەفسی خۆی و نە کەسانی تر، ئەوا ئەو بەندەیە شوکری خودای کردووە، بۆیە شوکر جۆراوجۆرە، خەڵکیش لە شوکردا جۆراوجۆر و سەروخوارن، ئەمە بریتییە لە نزمترین شوکر، بەرزترین شوکریش کەس نایگاتێ و سنوور و رادەیەکی بۆ نییە.

هەروەها لە جۆرەکانی شوکر ئەو شێوەیە ئێمە وەسفمان کرد، بەڵام ئەمەیان ئەسڵی شوکرە، ئەوەیە بەندە بە دڵ بزانێت: هەر نیعمەتێك لەلای ئەوە لە خوداوەیە، بە

زانینێك کە لە ئاستی یەقیندا بێت، و شك و گومانی تێکەڵ نەبووبێت، گەر بە دڵ ئەوەی زانی بە زمان یادی دەکات و لەسەری حەمدی خودا دەکات، پاشان شتێك لە نیعمەتەکانی خاوەن نیعمەت بەکارناهێنێت بۆ سەر شتێکی تر کە خاوەن نیعمەت پێی ناخۆشە و لای ناپەسەندە.

**باڵاتر لەم شوکرە ئەوەیە:** هەموو بەڵایەك کە بەسەرتدا دادەبارێت بە نیعمەتی بزانیت، چونکە خودا بەڵای توندتر و سەختتر لەوەی تۆی بەسەر غەیری تۆدا دابەزاندووە.

خەڵکی لەم جۆرە شوکرەدا ئاتاجن بەئارامگرتن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بە شوکرەوە راوەستاوە.

## رجا:

**رجا بریتییە لە:** هیوا و خۆزگە بۆ قبووڵبوونی کاروکردەوەکانت، و پاداشتی گەورە لەسەریان، لەگەڵ ئەوەش بترسی کار و کردەوەکانت بە رووودا بدرێتەوە، یان ئافەتێکیان پیێ تێکەڵ بووبێت کارەکەیان تێکدابێت.

**ئەوانەی رجایان هەیە سێ جۆرن:**

- **پیاوێك** چاکەیەك ئەنجام دەدات و لە کارەکەیدا کەسێکی راستگۆیە و ئیخلاصی ئەنجامداوە و بە کارەکەی خودای دەوێت و داوای پاداشتی لێ دەکات، ئەو رجای وایە کارەکەی قبووڵ ببێت و پاداشتی دەست بکەوێت، لەگەڵ ئەوەشدا ترسێکی هەیە.
- **هەروەها پیاوێك** کارێکی خراپەی ئەنجامداوە و پاشان تەوبەی کردووە بۆ لای خودا، ئەو رجای وایە تەوبەکەی قبوڵ کرابێت و **پاداشتی** لەسەر وەربگرێت، و رجای لێبووردن و لێخۆشبوونی خودا دەکات، لەگەڵ ئەوەش ترسێکی هەیە لەسەری سزابدرێت.

-**سێیەمیان پیاوێکە:** لەناو گوناه و ئەوەی خودا پێی ناخۆشە پێی راکێشاوە و حەزناکات بەو گوناهانەوە بە **خزمەتی** خودا بگات، رجا و هیوای بە لێخۆشبوونە بەبێ تەوبەکردن، لەگەڵ ئەوەش تەوبە لە گوناهان ناکات، و دەست لە گوناه ناکێشێتەوە، بەڵام رجای بە خودا و لێخۆشبوون هەیە.

**ئەم کەسە پێی دەوترێت:** درۆزن، ئەو دەستی بە رجایەکی درۆزنانە و هیوا و خۆزگەی درۆزنانە و تەماعێکی درۆزنانەوە گرتووە.

راوەستان لەسەر ئەمە مەزنی خودا لە دڵی بەندە دەردەهێنێت، بۆیە پشتهەڵکردنی لە خودا بەردەوام دەبێت، و هۆگری بە دووری لە خوداوە پەیدا دەکات وەك فریوخواردنیچك بە مەکری خوداوە، لە پەلەکردنی سزا و تۆڵە خۆی بە سەلامەت دەبینێت، ئەم کەسە کەسێکی درۆزنی فریوخواردووە و بە هەڵنان(**الإستدراج**)ی خودایی خەڵەتاوە.

بەڵام نموونەی ئێمە لە خەڵکی پێویستە ترس لەلایان زۆرتر بێت لە رجا، چونکە رجای راستگۆیانە بە ئەندازەی کارکردنە بە گوێڕایەڵی خودا.

## ترس:

ترس بەپێی گوناهانە، گەر رجا بەبێ کردار ئیستیقامەی وەربگرتبایە ئەوا چاکەکار و خراپەکار لە رجادا یەکسان دەبوون، خودای موتەعال دەفەرموێت: ﴿ **إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرۡجُونَ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ** ﴾البقرة: ٢١٨، هەروەها: ﴿**إِنَّ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ** ﴿٥٦﴾ ﴾ الأعراف: ٥٦

هەروەها مانای ئەو فەرموودەی کە هاتووە: ((گەر رجای باوەڕدار و ترسی باوەڕدار

هەڵبسەنگێنرێت هاوتا و هاوسەنگ دەبن))[1]

پێویستە لە نێوان ئەهلی خۆیدا تایبەت بێت، ئەوە پێش فەرموودەیەکی ترە کە دەفەرموێت: ((کەسی باوەڕدار وەك كەسی دوو دڵ وایە، دڵێك كە رجای پێ دەكات، لەگەڵ دڵێك كە پێی دەترسێت))[2]

بۆیە گەر چاكەی كرد رجای هەیە و گەر خراپەی كرد ترسی هەیە لەگەڵ تەوبە و پەشیمانی و دەستكێشانەوە لە گوناهان.

بەڵاّم هەر كەس بە خراپەی زۆر خۆی ناسی، ئەوا پێویستە ترسەكەی بە ئەندازەی خراپەكانی بێت و رجاكەشی بە ئەندازەی چاكەكانی، چونكە رجا بە ئەندازەی داوایە و ترسیش بە ئەندازەی هەڵهاتن.



---

[1] لم أجد هذا الحديث في المراجع.

[2] أخرجه الإمام أحمد في الزهد.

# تاوتوێکردن و تاقیکردنەوە



## قورئان تاقیکردنەوە بە هەموو دونیا رادەگەیەنێت:

**بزانە و یەقینت هەبێت کە هەموو دونیا:** زۆرەکەی و کەمەکەی، شیرینەکەی و تاڵەکەی، سەرەتا و کۆتاییەکەی، هەموو شتێك لە دونیا تاقیکردنەوەیە لە خوداوە بۆ بەندەکەی.

تاقیکردنەوەکەی-با زۆر زەبەند و جۆراوجۆریش بێت- هەر هەموو لە دوو سیفەتدا خۆی دەبینێتەوە: شوکر و ئارامگرتن(صبر)، یان شوکری نیعمەتی خودا دەکات یان لەسەر موسیبەت ئارام دەگرێت.

خودای موتەعال دەفەرموێت: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ ﴾ الكهف: ٧ ، هەروەها: ﴿ وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَا۟ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ ﴾ محمد: ٤، هەروەها﴿ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ﴾الأنعام: ١٦٥، هەروەها﴿ وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ ﴾الفرقان: ٢٠، هەروەها﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾هود: ٧، ئایەتی زۆرتر و زیاتر لە کتێبەکەی خودای موتەعالدا.

تاقیکردنەوەی ئادەم لە کتێبەکەیدا کەمتر لە ئایەت ئاماژەی پێکراوە و دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ ﴾ البقرة: ٣٥، هەموو ئەوە بۆ تۆ تاقیکردنەوەیە.

## زۆربەی فیتنە لە خەڵکیدایە:

زۆرترین تاقیکردنەوەی بەندە لەم دونیایەدا بریتییە لە خەڵکی.. فیتنەدارترین کەس و خەرۆترین کار بریتییە لە ناسراو و کەسوکارت، سەرقاڵترین کەس بۆ مرۆڤ و زۆرترین فیتنە بۆی ئەوانەن کە لەگەڵیان دەژیت، و تەماشات دەکەن و قسەت لەگەڵ دەکەن و قسەیان لەگەڵ دەکەی.

گەر ئەهلی سەردەمی خۆت نەتناسێت و تۆش ئەوان نەناسیت هیچ لەبارەیانەوە نەبیستی وەك ئەوە وایە پێیان تاقینەکرابیتەوە، هەروەها ئەوان بە تۆ تاقینەکرابنەوە، وەك ئەوە وایە نەهاتبنە ئەم دونیایەی کە تۆی تێدایە.

بۆیە لە ئارامگرتنتدا بگەڕێرەوە بۆ لای خودا و داوای کۆمەکی لێ بکە، و لە پێناوی ئەودا لە هەموو شت دابڕێ، و هۆگری یادی ئەو ببە، تێکەڵاوی بە خەڵك هەتا دەتوانی کەم بکەرەوە، بەڵکو کەمەکەش وازلێبهێنە بۆ ئەوەی سەلامەت بیت، خودای موتەعال دەفەرموێت: ...﴿وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ ۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا ﴿٢٠﴾﴾ الفرقان: ٢٠، کەوابوو لە فیتنە هەڵبێ.

ئارامگرتنەکەت دەگەڕێتەوە بۆ ناو ناسراوەکانت، ئەوانەی تۆ لەنێونیاندا دەژیت، بۆیە سەیرکردنی تۆ بۆ ئەوان فیتنەیە، سەیرکردنی ئەوان بۆ تۆ فیتنەیە، قسەکردنی تۆ لەگەڵیان فیتنەیە، قسەکردنی ئەوان لەگەڵ تۆ فیتنەیە، پشتهەڵکردنی تۆ بۆ ئەوان فیتنەیە، پشتهەڵکردنی ئەوان بۆ تۆ فیتنەیە، ڕێزگرتنیان بۆ تۆ فیتنەیە، ڕێزگرتنی تۆ بۆ ئەوان فیتنەیە.

پەند و ئامۆژگاری لەوە وەربگرە بە شـوێنێکدا گـوزەر دەکـەی و ناسـراوەکانی تـۆی تێدایە، لەگەڵ شوێنێك پیایدا گوزەر دەکەی کەسی تێدا نییە تۆ بناسێت.

هەر بەو جۆرە حەزەکانی خواردن و پۆشین و حەزی چاو و ئەوەی سەیرکردنی حەڵاڵـە و ئەوەی سەیرکردنی حەڵاڵ نییە، ئەوانەی لەو شارەدا نەبن کە تۆی تێـدا دەژیـت، تـۆ لێیان سەلامەت دەبیت، و گەر خودا بیەوێت فیتنەیان لە تۆ لادراوە، چـونکە ئـەرك و زەحمەتیان لەسەر تۆ لاچووە، هەر بەو جۆرە تۆ لە هەموو کاروبارەکانتدا.

## تاقیکردنەوە لە کاردا:

ئەو کارەی ئەنجامی دەدەی فیتنەیـە، تـۆ دەتـەیَ خـۆت لـە چـاوی خـەڵکی بـەدوور بگریت، زۆربەیان تۆ بە کەسێکی چاك و پاك دەزانن، بۆیە کار و کردەوەکانـت بـۆ تـۆ فیتنەیە.

گەر حەجت کرد و بەتەنها بوویت و کەست لەگەڵ نەبوو بـە ئـەهلی خێـر و چـاکەت بزانیَ و تۆش کەست نەدەناسی ئەمە بۆ تۆ سەلامەتترە، ئەگـەر نـە، بـۆت دەبێـت بـە فیتنە، سەرنج بدە چۆن خۆتی لیَ سەلامەت دەکەیت.

گەر لە شار و وڵاتێك دەرچووی کە تۆ بە ئەهلی خێر و چـاکە تیایـدا ناسـراوبوویت، لێی دەرچوویت و ئەوان نەزانن تۆ رووت لە کویَ کردووە ئەمە بۆ تۆ سەلامەتترە، گەر زانیان ئەوا بۆ تۆ دەبێت بە فیتنە، سەرنج بدە چۆن خۆتی لیَ رزگار دەکەیت.

هـەر بـەو جـۆرە غـەزا کـردن و بـەلاَی ئـەهلی غـەزا، و ئەوانـەی لـە غەزاکانیانـدا رووبەڕووت دەبنەوە لە فیتنە گەورەترە لە بەلاَ و فیتنەی کەسانی تـر، ئەوانـەی کـاری

چاکە ئەنجام دەدەن، ئەوان بەر لەوەی بچنە ناو هەموو ئەو شتانە لە عافییەتدا بـوون، کە چوونە ناوی فیتنە دادەبارێت، لە حەسوودی بردنی هەندێکیان بە هەندێکی تریـان، تەماعبازی لە بەشکردنی ئەوەی لە جەنگدا بەردەستیان کەوتووە، هەروەها تەماعیان لە وڵاخی بار لە ئەسپ و حوشتر، هـەموو ئـەو شـتانەی بـۆ خـەڵك جیادەکرێتـەوە لـە رێگەی غەزاکردندا.

گوێم لە پیاوێکی لـەو جۆرانـەی ئـەهلی غـەزا بـوو کـە دەوڵەمەندییـەکی زۆری بـە رووبەڕووبوونەوەی دوژمن بەدەستهێنابوو، نـاوی لـە خۆبەخشـانی سـوپادا زۆر گـەورە بوو، دەیوت: ئەسپسواران رۆیشتن بۆ غـەزا رێنەکـەوت لەگـەڵیان بم، بـۆ سـەلامەتیان پێمخۆشە هەموویان سەلامەت بن، بـەڵام پێمناخۆشـە غەنیمـەیان دەسـت بکـەوێت و منیان لەگەڵدا نەبم.

من بۆخۆم بینیم هەندێ کەس غیرەیان هەبوو بەرانبەر بە کەسـانێکی غەزاکـەر کـە شتێکیان پێ بوو خۆیان لە جەنگدا پێ بەهێز دەکرد، بەڵام بە ئەو نـەدرابوو، هـەروەك غیرەی هەندێ کەس بەرانبەر ژن و دایك و خوشکی، هەروەها کەسانێکم بینی غەزایان کرد و غەنیمەیان بەدەست نەهێنا، ئاواتیان دەخواست غەزایان نەکردبایە.

بۆیە ئەی بـرام، کـەس لـە ئاسـایش و سـەلامەتیدا نییـە لـە چـوونە ژوورەوەی کـارێکی دونیایی یان دواڕۆژیی گەرئافەتگەلێك بەدوایانەوە بێت بـۆ تێکـدانی کـار وکردەوەکانیـان، شـەیتان لێیـان بچـێتە ژوورەوە و نـەنگی و ناتـەواوی و فیتنـە بخاتـە نـاو کارەکانیانـەوە، نموونەی ئەمە و زۆرتریش لەمە.

با مرۆڤ ئاگادار بێت لە هەر کارێك لەکاری دونیاو دواڕۆژ ئەنجامی دەدات، با ئەو کەسە

لـە کارەکەیـدا چـاودێری خـودا بکـات، و بـە نـاخێکی پـڕ لـە ئیخلاصـی پاکـەوە مامەڵەی بکات، با خۆی بپارێزێت لە تەماشاکردنی خودا لە ناخ و ویژدانی تێکچوو و داڕوخاوی، بترسێت لە ئاگابوونی خەڵکی بـە کـارە چـاکەکانی، پاککـەرەوەی زبـڵ و پیسایی بەڕێزترە لەو ڕۆژووگر و نوێژکەر و شەونوێژکەر و غەزاکەرەی کە پێی ناخۆشە موسڵمانان غەنیمەی ڕۆم بەدەست بهێنن، دانیشتوویەك لـە شـاری بەغـداد پێیخۆشـە لەگەڵیان غەنیمە بەدەست بهێنێت.

ئاگادار بە، خودا ڕەحمت پێ بکات، لەو کەسانەی لێت نزیك دەبنەوە و لێیـان نزیـك دەبیەوە، ئەوانەی لە تۆ دوورکەوتنەوە و تۆ لێیـان دوورکەوتییـەوە لـە تـۆ سـەلامەت بوون و تۆ لەوان سەلامەت بوویت.

خەڵکانێك هەن ئاوات دەخوازن و پێیان خۆشە هیچ کەس بە کاروکردەوە چاکەکانیان نەزانێت، ئەو کار و کردەوانەی لەبەر بینیندان و رجاوایە خاوەنەکەی پاداشـتی گـەورە لەسەریان بەدەست بهێنێت، و پلە و پایەی بەو کردارانە بـەرز ببێتـەوە، ئـەوان ئـاوات بەوانە دەخوازن کە کاری مـەزن و چـاکەیان وەکـو ئـەوان ئـەنجام نـەداوە، لـە خـوداوە شتێکیان بۆ دەرکەوت کە بیریان لێ نەکردبوەوە.

## چۆن کەسێك بە کاری چاکە تیادەچێت:

دەوترێـت: ئەوانــە کۆمــەڵێك کــار و کــردەوەی چــاکەن خاوەنــەکانیان وا دەزانــن ڕزگارکەری ئەوانن، بـەڵام دەبێتـە هـۆی تیاچـوونیان بـەهۆی تێکـەڵبوونیان بـە ریـا و خۆشەویستی بۆ مەدح کردن لە خەڵکەوە و بەدەستهێنانی مەنزیلەتی دونیایی بە کـار

و کردەوەی چاکە و راستبوونەوەی پلەوپایە و خۆشەویستی بۆ رێزی خەڵکی و مەیل بۆ پاداشت لەلایەن دروستکراوەکانەوە.

کاتێك گەڕانەوە بۆ لای خودا (عز وجل) بینییان کار و کردەوەکانیان پووچ بوونەتەوە و بەخۆیان نەزانیوە، چونکە پاداشتی کار و کردەوەکانی خۆیان بۆ دونیا پێشخست، بۆیە رسوابوون، رسوابوونێك کە لەوێ بەهەمیشەیی دەمێنێتەوە، شتێکیان لە پاداشتی کاروکردەوەکانی خۆیان نەبینییەوە، هەروەك ئەو کەسە تینوەی شوێنی سەراب و تەپوتۆز کەوتووە.

خودای موتەعال دەفەرموێت: وەك بەسەرهاتێك دەربارەی ئیبلیس دوژمنی چەپەڵ: ﴿ ثُمَّ لَآتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ وَعَنۡ أَيۡمَٰنِهِمۡ وَعَن شَمَآئِلِهِمۡۖ وَلَا تَجِدُ أَكۡثَرَهُمۡ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ ﴾ الأعراف: ١٧، گەر لە قورئاندا لەمەڕ سیفەتی ئیبلیس تەنها ئەم ئایەتە بوونی هەبوایە ئەوا پێویست بوو خەڵکی خۆیان لە ئیبلیس پەنابدایە و لێ بەدوور بگرتبایە.

گەر سەرنجی خەڵکی بدەی ئەوەت بۆ رۆشن دەبێتەوە کە زۆربەیان لە رێگەی کار و کردەوەی چاك و کەمی گرنگیدان بە پاککردنەوە و پاڵفتەکردنی کاروکردەوەکان بۆ خودا شەیتان بۆیان دێت، هەروەك چۆن لە رێگەی خۆشەویستی بۆ مەدح و سەنای خەڵکی روویان لێ دەکات.

خەڵکانێکی زۆریش هەن لە رێگەی گوناه و تاوانەوە شەیتان بۆیان دێت، بەڵام نیشانەی فیتنە لەناو خەڵکیدا جۆراوجۆرە، زۆربەی خەڵکی وادەزانن کەسێك بە گوناه تووشی فیتنە بووە، بەڵام وانازانن کەسێك بە کاری چاکە تووشی فیتنە بووبێت، مەگەر تەنها کەسانێکی زۆر کەم لە ئەهلی نوور و حیکمەت و فیراسەت و هۆش و ژیری.

ئــەوەش: چــونکە ئەوانــەی کــاری چــاکە ئــەنجام دەدەن و فیتنــەی کــارە چــاکەکەیان خۆشدەوێت زۆرتر و زیاترە لەوانەی کاری چاکە ئەنجام دەدەن و لە فیتنەکەی دەترســن، ئەوانەی فیتنەی کاری چاکە نازانن زۆرتر و زیاترن لەوانەی فیتنەکەی دەناسنەوە.

هەندێ کەس فیتنەی کــار و پووچــکەرەوەی کاروکردەوەکــان دەناســن، بــەڵام پاشــان ئارەزوو بەسەریاندا زاڵ دەبێت، هەشیانە دەزانێـت، بـەڵام چـاودێری کـردن و گرنگـی پێدانی کەمە و تووشی بێئاگایی دەبێت.

بزانە، ئەو کەسەی کار دەکات و ئافەتەکانی تێکـدەری کاروکردەوەکـان دەناسـێتەوە و گرنگیــدانی بــە نەفســی خــۆی و کارەکــانی هەیــە، و بێداربوونــەوە و ســڕینەوەی بێئاگایی لەگەڵدایـە، لەگـەڵ ئەوەشـدا ترسـی هەیـە لـە ئافەتـەکان، زۆر بـە زەحمـەت سەلامەت دەبێت مەگەر کەسێك خودا سەلامەتی بکات، ئەی دەبێ حاڵی ئەو کەسـە چۆن بێت کـە نـەزانی دەنوێنێـت و بێئاگـا دەبێـت و ئـارەزوو زاڵ دەبێـت بەسـەریدا و پێیخۆشە بچێتە ناو ئافەتەوە؟

## گشتگیری فیتنە و ترسەکەی:

لەم سەردەمەی ئێمەدا لە هەموو لایەکەوە داوای دونیا دەکرێت: بە چاکە و بە خراپە، هەر هەموو تووشبوونی فیتنەیە، بۆیە خۆت بپارێزە لە فیتنەی کـاری خراپـە و کـاری چاکە، تاکو ئەوەی بەسەر خەڵکیدا داباریوە بەسەر تۆشدا دانەبارێت لە وازهێنان و داوا.

با هەوڵ و لێبڕانت بۆ وردبوونەوە لە ئاوێنـەی بـیر وەك هـەوڵ و لێبڕانـت وابێـت لـە کاروکردەوەکانـدا، بـەڵکو زیـاتریش لـەوە، چـونکە ئارەزووەکـانی گونـاه و خراپـە و

حەزەکانی خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و بینا و سواری و هاوسەری کردن و زێر و زیوو زاڵتر نیین لەسەر خاوەنەکانیان لە حەزەکانی پلە و پایە و دەسەڵات و راستبوونەوەی رێز و حورمەتی خەڵکی بۆت و بەدەستهێنانی مەنزیلەت لەلایان و قبووڵ کردنی ئەمر و نەهییەکانت و راپەڕاندنی پێویستییەکانت لەلایەن ئەوانەوە، هەروەها خۆشەویستی بۆ باشی و چاکی جیران و دۆست و ناسراوانت لەگەڵت، هەروەها مەدح کردنت لای خەڵکانێکی چاکەخواز بە چاکەکانت.

کەسێك دەبینی دەتوانێت زاڵ ببێت بەسەر حەزی گوناهدا و واز لە گوناه دەهێنێت و روو لە کار و کردەوەی چاك دەکات، بەڵام لە پاڵفتە کردنی کار و کردەوەی چاکەدا لاواز و سستە، حەزی کارەکان زاڵ دەبێت بەسەریدا، بۆیە زۆرێك لە کاری چاکە بەهێز و توانینەوە ئەنجام دەدات، زۆر خۆی تینوو دەکات و شەوان ناخەوێت، بەڵام ناتوانێت زاڵ ببێت بەسەر حەزەکانیدا بۆ پاڵفتەکردنی کار و کردەوەکان، **"إنا لله وإنا إليه راجعون"** لەوەی بەسەرماندا داباریوە، ئێمە لەبەردەم ترسێکی مەزنداین، ئێمە چەندە بێئاگاین لەو ترس و هەڕەشە مەزنە!

## لە فێڵی شەیتان و ئارەزووی نەفس خۆتبپارێزە:

پاشان بزانە من نامەوێت تۆ لە ئەنجامدانی کاری چاکە سارد بکەمەوە، چونکە هەر کارێك ئەمڕۆ ئەنجام نەدرێت سبەینێ پاداشتەکەی نابینیتەوە، بەڵکو لە فێڵەکانی شەیتان و ئارەزووی نەفسی فەرمانکەر بە خراپە ئاگادارت دەکەمەوە.

فەزڵی قورئان لەسەر کەلام و قسەی مرۆڤ وەك فەزڵ و گەورەیی خودا وایە لەسەر دروستکراوەکانی، خودای موتەعال دەفەرموێت: ﴿ **فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾** ﴾ النحل: ٩٨.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ **إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا إِنَّمَا يَدْعُو حِزْبَهُ لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ ﴿٦﴾** ﴾ فاطر: ٦.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ **وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّي إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴿٥٣﴾** ﴾ یوسف: ٥٣.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ **وَكَذَلِكَ سَوَّلَتْ لِي نَفْسِي ﴿٩٦﴾** ﴾ طه: ٩٦.

﴿ **فَطَوَّعَتْ لَهُ نَفْسُهُ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُ فَأَصْبَحَ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٣٠﴾** ﴾ المائدة: ٣٠

﴿ **قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنْفُسُكُمْ أَمْرًا فَصَبْرٌ جَمِيلٌ** ﴾ یوسف: ١٨

﴿ **وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ** ﴾ **ص: ٢٦**

﴿ **وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِنَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿٥٠﴾** ﴾ القصص: ٥٠

﴿ **وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا ﴿٢٨﴾** ﴾ الکهف: ٢٨

﴿ **وَكَذَّبُوا وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءَهُمْ** ﴾ القمر: ٣

لەگەڵ زۆرێك لە ئایەتی تر لە دوژمنایەتی ئیبلیس و زەمی نەفس و ئارەزوو.

# پێداچوونەوەی نەفس



## مرۆڤ چۆن سەلامەتی خۆی لە ئافەت دەناسێتەوە:

وتم: من لە خەڵکیدا شتگەلێك دەبینم کە هەمان نەنگی لە خۆمدا بوونی هەیە، پێمخۆشە لە نەنگی و ناتەواوی رزگارم ببێت، بەلاّم نازانم نەفسم لەو نەنگی و ناتەواوییانە سەلامەت بووە یان نە.

وتی: مرۆڤ لە نەنگی نەفسی خۆی گێل و وێڵە، بەلاّم لە ناسینی نەنگی و ناتەواوییەکانی خەڵکانی تر زیرەك و لێزانە، نەنگی و ناتەواوی هەموو خاوەن پیشەکان و ئەهلی هەموو کارێك لە کارەکانی دونیا و دوارۆژ بەسووك تەماشا دەکات، نەنگی و ناتەواوی ئەوانەی لە ئاستی خۆیدان دەبینێت و بە سووك و کەم تەماشایان دەکات، لە هەر کەسێك ئەو ناتەواوییانە ببینێت زۆر لای گەورەیە، بەلاّم کاتێك دێت بۆ لای نەنگییەکانی نەفسی خۆی بە گونجاویان دەزانێت، وەك ئەوەی کوێربێت و نەیان بینێت.

ئەو لەو نەنگییانەدا پاساو و بیانوو بۆ خۆی دەهێنێتەوە، بەلاّم ئەو پاساو و بیانووانە بۆ خەڵکانی تر ناهێنێتەوە، ئەو لە داواکردنی پاساو بۆ خۆی زۆر زیرەکە، بەلاّم لە داوای پاساو بۆ کەسانی تر زۆر گێل و گەمژەیە، لە ناخیدا شتێك بەرانبەر هاوەڵەکەی هەڵدەگرێت کە پێیناخۆشە خەڵکانی تر ئەو شتە لە ناخیاندا بەرانبەر بە ئەو حەشار بدەن گەر هەمان نەنگی و ناتەواوی لێوە ببینن.

گەر نەنگییەك یان هەڵەیەك یان خلیساکان و تێکەوتنێکت بینی خۆت بخە جێگەی ئەو، پاشان سەرنج بدە چۆنت پێخۆشە پێشوازیت لیٚ بکرێت گەر یەکێك ئەو کارەت لیٚ ببینێت کە ئەو کەسە ئەنجامیداوە، تۆش هەمان شت لە ناخی خۆتدا بەرانبەر بە ئەو بشارەوە، چونکە ئەو کەسە ئەو شتەی دەوێت لە تۆ کە تۆ لە ئەوت دەوێت.

هەر بەو جۆرە گەر چاکەیەکت لە کەسێك بینی و ویستت فێری زانستی سەلامەتی ببیت لە حەسەد پیٚ بردن بەرانبەری.

تۆ هەمیشە کەسانێکت لا باش و چاکە کە بۆ هەڵە و تێکەوتنەکانت پاساو و بیانوو دەهێننەوە، گەر نەشتوانن پاساو و بیانوی بۆ بدۆزنەوە کارەکەی تۆیان پیٚ ناخۆش بێت و بیشارنەوە، لە کاتی کارە چاکەکانی تۆدا خۆشحاڵی روویان تێبکات، گەر خۆشحاڵیش نەبن بە چاکەکانت دڵتەنگ نەبن.

تۆش لە کاتی هەڵە و تێکەوتن و لە کاتی چاکەدا هەر بەو جۆرە بە بۆ ئەوان، گەر بەو جۆرە بوویت ئاوات مەخوازە بۆ تیاچوونی نیعمەتێك —لە دیندا یان لە دونیادا- خودا بە یەکێکی بەخشی بێت، پێتخۆش نەبێت هیچ کەس لەسەر یاخیبوون لە خودا بەردەوام بێت، پێتخۆش نەبێت لەکاتی هەڵە و خراپەکانیدا پەردەی لەسەر لابەریت، گەر ئەم کارانەت بە دڵ ئەنجامدا حەسوودی-بە دینی یان بە دونیای- لە ناخی تۆدا دەردەچێت.

## زانستی سەلامەتی بە پێداچوونەوە و پشکنین:

بزانە حەسوودی و گومانی خراپ و بوغز و کینە پێشی تۆ دەکەوێت بۆ گەیشتنە ناخ و ویژدانت، بۆیە پێداچوونەوە بکە بە کارێکی پێویست، هەمیشە و بەردەوام لە

هەڵوێستەکردندا بە، وەك پێشین دەفەرموون: باوەڕدار هەڵوێستکەرە و وەك کۆکەرەوەی دار و چیلکە نییە لە شەودا.

بۆیە بوەستە و بە چاوێکی پڕ لە سەرنجی تیژەوە لە ناخی خۆت بڕوانە، چاوێك کە بینینەکەی پەردە و تاریکییەکان دەبڕێت، گەر کارێکی باشت بینی حەمدی خودا بکە، و بڕۆ و بەردەوام بە، گەر خراپەیەکت بینی و بە باشیی پێداچوونەوە چارەسەری بکە و لە رەگوریشە دەریبهێنە، چونکە ئەو کەسەی هاتۆتە ناو ماڵەکەت و مۆڵەتی لێ وەرنەگرتوویت [١] خۆی تیادا حەشار دەدات، گەر تاریك بوو تۆ هەستی پێ ناکەیت و نایبینییەوە، مەگەر چرایەکت لە زانستی رۆشنکەرەوەی رۆشن بەدەستەوە بێت، هەروەها شارەزایی و لێزانینێکی وەهات لەلا بێت بتوانیت بیگریت و لەو شوێنە دەریبهێنیت کە چووەتە ناویەوە، شوێنێك کە ناتوانێت لەسەری ئارام بگرێت و بێتوانایە بەرانبەری.

گەر ئەمەت ئەزموون بکردبایە دەتزانی ئەوەی من بە تۆی دەڵێم هەر بەو جۆرەیە.

کەسێك دێتە ناو ماڵەکەتەوە بەبێ مۆڵەتی تۆ، کەسێکە ئەگەری هەیە شوێنەکە وێرا بکات، گەر خەمساری و گوێپێنەدانی لە تۆدا بینی شوێنەکە دەکات بە مەنزڵی خۆی، و کارەکانی دەگرێتە دەست و دەست دەگرێت بەسەر ئازادی ماڵەکەتدا، هەروەها بەسەر حەیا و حورمەتیدا، گەر بەرهەڵستکاری لە تۆ بینی، بەڵام بە شێوەیەکی لاواز ئەوا خۆی بزر دەکات و چاوەڕوانی کاتی بێئاگایی و هەڵە و سستی تۆیە، گەر هەلێکی بۆ

---

[١] مەبەستی بەو کەسە نەفسی خۆیەتی، چونکە لە کۆتاییدا باسی ئەوە دەکات کە دەبێ ئەو نەفسە لەو شوێنە خراپانە بکێشێتەوە، ئەگەر نە، تیادەچێت.

رەخسا ئەوەی تۆ چاکت کردووە ئەو لێتی وێران دەکات، تێبگە گەر دەتەوێت تێبگەی، ئامۆژگاری خاوەن ئامۆژگارییەکان وەربگرە گەر ئامۆژگاری وەردەگریت.

گەر کۆچت بکردبایە بە گرتنەبەری هۆکارەکانی سەفەر، تا ئەوپەڕی دووری دوور بکەوتبایتایەوە، لەو پێناوەشدا هەموو دەگمەنێکی ماڵ و سامەنەکەت ببەخشیبایە، ئەوا ئەوەی بەدەستی دەهێنیت زۆر زیاترە لەوەی بەختت کردووە، تۆ لە رۆژی دواییدا لە ترازووی کار و کردەوەکاندا خێرێکی زۆرت بە راستگۆیی لە پێداچوونەوە و خەریکبوون پێیەوە دەبینییەوە، بەر لەوەی شیرینییەکەی سارد ببێتەوە، ئەوە بەخشینێکی مەزنە لە بەخششەکانی خودای موتەعال، خودا خەڵکانێکی تایبەتی پێ ڕێزدار کردووە، و نیعمەتی مەزنی بەسەردا داباراندوون، چونکە مەزنی نیعمەت بەپێی بڕی پێویستییە.

تەماشا بکە بزانە پێداچوونەوەت بۆ نەفس و کاروباری خۆت کردووە، چاکە و بەرژەوەندیت تێدا بینیوەتەوە، یان تێکدان و وێرانکاری، گەر زوو بە پێداچوونەوە بە هانایەوە نەچیت ئەوا دەڕوات بۆ رۆژی دوایی.

## پێداچوونەوە بنچینەی ئاکاری دروستە:

بزانە، من زۆر باسی پێداچوونەوە بۆ تۆ و بۆ خۆم دەکەم، چونکە بۆم دەرکەوتووە چەندە مرۆڤ ناچاری و پێویستی بە پێداچوونەوە هەیە، گەر پێداچوونەوە پەیوەست ببێت بە شتێك لە خێر ئەوا بە ئەندازەی ئەو پەیوەستبوونە خێری تێدایە، ئەگەر نە، تێیدا نییە..

وازهێنانی نەفست لە پێداچوونەوە وەك ئەو کەسە وایە هۆگری لەگەڵ دوژمنەکەی هەیە و خۆی رادەستی کردووە، ئەوکات نەفست تیادەچێت و تۆ هەستی پێ ناکەیت.

گەر گوێتنەدا بەوەی من بە تۆی دەڵێم ئەوا زۆرترین پێویستی تۆ لە نوێژە فەرزەکاندایە، پاشان ئەوانەی بەدوایاندا دێن، هەر بەو جۆرە تەواوی کاروبارەکانی ترت.

گەر لەوانە بوویتایە پێداچوونەوە بە کار و بارەکانیاندا دەکەن ئەوا دەتزانی چی رووی لە تۆ کردووە لە پەشیمانی و حەسرەت، بەوەی پێداچوونەوە لە نوێژی فەرزدا لە تۆ جیابووەتەوە، نازانی ئیمامەکەت چی بۆ خوێندوویت، نازانیت ئایا تۆ لە نوێژی فەرزدای یان لە نوێژی سوننەتدای، ئایا لە نوێژدا بووی یان لە ناو کارێکی تردا، بەڵام تۆ بە رواڵەت گوایە ئاخافتن لەگەڵ پەروەردگارت دەکەی.

گەر تۆ بە دوو گوێت گوێت بۆ ئیمامەکەت گرت و بە وەستانت خشوع رووی لێ کردیت، دڵت خاڵی کردەوە بۆ گوێگرتن لەوەی ئیمامەکەت لە کەلامی پەروەردگارت دەیخوێنێت لەناو نوێژی فەرزدا، کە هیچ شتێك بە ئەندازەی نوێژی فەرز واجتر نییە لەسەرت، بەڵام کاتێك لە پێداچوونەوە تەواو بوویت ئەوەی بۆمان وەسف کردیت لە تۆ دەرکەوت، ئەوا تۆ وەك ئەو کەسە وایت کە لە نوێژەکەدا ئامادە نەبوبێت، بەهۆی نەبوونی پێداچوونەوە بە نەفسدا لە نوێژەکەدا.

لەوانەیە ئەوەی کە دڵ تیایدا ئامادەیە و دەیژنەویت سەهوی تێدا نەکەی، گەر پێت بوترێت: ئایا پێتخۆشە نوێژەکەت وەك جاران پڕ لە بێئاگایی بێت و سەدهەزار دینارت پێ بدرێت بە دڵنیاییەوە دەڵێی: نەخێر.

بۆیە ئێستا گرنگی بەو پێداچوونەوەیە بدە بە ئەندازەی ئەوەی دەیزانیت لە پێویستی تۆ بەو پێداچوونەوەیە، چونکە هەر ئەوەندە تەمەن بۆ تۆیە کە تێیدا بێداری، بێداری تۆ: بریتییە لە پێداچوونەوەی ئەوەی قازانجت پێدەگەیەنێ و نزیکت دەکاتەوە، رۆیشتن

بۆ لای ئەمەش لە ڕێگەی ئەقڵەوەیە، بەدەر لە ئەوە بریتییە لە بێئاگایی و سەهوکردن کە سەردەکێشن بۆ حەزێك دڵت دێنێتە کوڵ، لەوەشدا تۆ لەگەڵ نەفسی فەرمانکەر بە خراپە و ئارەزووی گومڕاکەر لە ڕێگەی خودا تەبا بوویت، ئەو ئارەزووەی خەڵکی لە ڕێگەی خۆشەویستی دووردەخاتەوە، لەوەشدا دوژمنی چەپەڵ -کە هیچ هەلیك لە دەست نادات- زاڵ دەبێت بەسەر دڵدا، دوژمنێك کە وەك خوێن بە جەستەدا جاری دەبێت، ئەو و دەستەکەی تۆ دەبینن و تۆ ئەوان نابینی.

**مالیکی کوڕی دینار دەڵێت:** دڵی چاکان بە کار و کردەوەی چاکە دێنە کوڵ، بەڵام دڵی خراپەکاران بە کاروکردەوەی خراپ دێنە کوڵ، بۆیە دەستبکە بە پێداچوونەوە لەگەڵ کار و کردەوەکاندا، گەر لەگەڵ ناباشێکدا بوویت چاکی دەکەی و خۆتی لێ لادەدەیت، گەر شتێکی ترت بینی حەمدی خودای لەسەر دەکەی، گرنگی دانت بەوە زیادەیەکە بۆ تۆ و مایەی نزیکبوونەوەی زیاترە.

گەر گرنگیدانت بە پێداچوونەوە تێدا بوو، بزانە نیعمەت و نزیکییە بۆ تۆ لە مەزنترین نیعمەتەکانی خودا، نیعمەتی خودا لە هەموو کەسێك زیاتر پێویستی بە هاوەڵی کردنی باش و چاکە، ئەو نیعمەتانەی کلیلی گەنجینەکانی ڕەحمەتی خودان، داوای زۆرتر و زیاتری نیعمەتەکان بکە بە شوکرکردنی خودا، تەنها کەسێك کە دەبێت زۆر خراپ مامەڵەی لەگەڵ بکەیت نەفسی فەرمانکەرە بە خراپە، خراپبوون لەگەڵی بریتییە لە بەگوێنەکردن و سەرپێچی لێکردنی، چونکە لە سەرپێچی کردنی نەفسدا ڕازیبوونی خودا هەیە.

## گوێ نەدان بە بچووك دەیخاتە ناو گەورەوە:

وتم: ئەهلی ویست کێن؟

وتی: ئەو کەسەیە کە نەنگی و ناتەواوی خۆی بە کارێکی نافیلە تەماشا ناکات.

وتم: پارێزگاری لە زمان چییە؟

وتی: بێدەنگی.

وتم: کەنارگیری و خۆلادان لە قسەکردن چییە؟

وتی: وازهێنان لە ناوهێنانی نەنگی و ناتەواوی ئەو کەسەی گەر ناوت هێنا هیوا و رجای پاداشتی لە خوداوە لێ بکەیت، بۆ ئەوەی ئەو ناوهێنانە دەرتنەکات بۆ باسکردنی نەنگی و ناتەواوییەك ترسی سزات هەبێت لەسەری، نەفست لەم دەروازەیەوە زۆر بە توندنی رابگرە، ئەوانەی لەسەر ئەمە داوای رێنموونیت لێ دەکەن و ئەوەیان دەوێت کە تۆ دەتەوێت رێنموونییان بکە.

بەندە لە دەرگای گوێ نەدان بە کەم شەیتان لێی دەچێتە ژوورەوە، ئەوەش دەبێتە هۆی کەوتنە ناو گوناهی گەورەوە، گوێنەدان بە کەم ئەو بنچینەیە زۆری لەسەر بینا دەکرێت، بۆیە سەرەتاکەی بریتییە لە خۆکەناردان، پاشان دەبێت بە کرانەوە، پاشان لە کرانەوە بۆ شتێکی کەم، پاشان لە کەمەوە بۆ زۆرتر لەوە، تۆ بە خۆت نازانیت کاتێك خۆت دەبینییەوە لە شوێنێکدای کە پێت ناخۆشە خەڵکانی تر تێیبکەون، بۆیە لە دوورکەوتنەوە لە کەم لە کەم و زۆر رزگارت دەبێت.

بەهێزترین کەس لەسەر ئەمە و خاوەنی راستترین هەوڵ و لێبڕان ئەو کەسەیە گەر بڕیاری دەستبەکاربوونی دا بڕوات لەسەری و خاوبوونەوە رووی لێ نەکات، لاوازترین مرۆڤ

لەم مەیدانەدا لاوازترین هەوڵ و لێبڕانی هەیە، ئەوە ئـەو کەسـەیە بڕیـاری کۆشـش دەدات و پاشان بڕیارەکەی هەڵدەوەشێتەوە، بۆیە ناتوانێت بڕیارەکەی تێپەڕێنێت.

ئەمە ئەو کەسەیە شەیتان و ئارەزوو و نەفس یاری پێ دەکەن، لەلای ئەوانە رێزێکی نییە، بەهۆی زۆری زانیارییان بە هەڵوەشاندنەوەی بڕیارەکانی و کـەمی بـەکارهێنان و بەکردارکردنیان، خاوەن هەوڵ و لێبڕانی مەزن خەڵکە مەزنەکانن لە هەر نەوەیەکدا.



# نزيك لە تەوبەوە و دوور لە تەوبەوە



## صدقی پەشیمانی و نیشانەکانی:

کێ لە هەموو کەس بۆ قبووڵی تەوبە رجای زۆرترە؟

وتی: ئەوەیان کە لە هەمووان زۆرتر دەترسێت و لە هەموویان زۆرتر پەشیمانی رووی لێکردووە لەسەر ئەوەی لێی وەشاوەتەوە، هەروەها لەوەی کە خودا لە ئەو بینیویەتی لە هەڵە و گوناه و خراپە و تاوان، تێکەڵکردنی خراپە بە چاکە و بێئاگایی دووروودرێژ و بەردەوامی پشتهەڵکردن، هەروەها ئەو کەسەیە کە لە هەمووان زیاتر کەنارگیری و ئاگاهی هەیە لەوەی رووی لێ دەکات، گەر لە هەموو ئەمانەدا یەکسان بوون، ئەوا ئەو کەسەیان کە لە هەمووان زۆرتر هەوڵ و کۆشش دەکات لە کاردا.

چونکە نیشانەی صدقی پەشیمانی لەوەی ئەنجامیداوە لە گوناه بریتییە لە: زۆری ئاگاداربوون لەوەی ماوەتەوە لە تەمەن، و بەردەوابوون لە گوێڕایەڵی بە هەوڵ و تێکۆشان، بەکەمزانینی زۆری گوێڕایەڵی، و بەزۆرزانینی کەمی نیعمەت، لەگەڵ نەرمی دڵ و پاکی و بێگەردی و بەردەوامی لە دڵتەنگی تیایدا، و زۆری گریان و خۆدانە دەست خودا لە هەموو کاروبارەکاندا، و خۆداڕنین لەپاڵ هێزی خودادا لە هەموو هەوڵ و هێزێکی خۆت، پاشان ئارامگرتن لەسەر حوکمەکانی خودا -**عز وجل**- و رازیبوون لە خودا لە هەموو ئەو حوکمانەدا و خۆڕادەست کردن بۆ هەموو فەرمانەکانی.

## هەڵە لەسەر رێگەی تەوبە و دەرئە نجامەکانی:

پێی وتم: زانیت لە کوێدا هەڵەت کردووە: گومانی باشت بە نەفسی خۆت بردووە، نەفست خۆی لە پلەی چاکەکاراندا دادەنێت بە پێچەوانەبوون لەگەڵ رێگە و رەوگەی ئەوان، بەبێ ئەوەی لەسەر کارە خراپەکانی سەرەکۆنەی بکەیت، هەروەها بەبێ ئەوەی دەمکوتی بکەی لە بانگەشەی کار و کردەوەی راستگۆیان.

گومانی خراپت برد بە کەسانی تر، ئەوانت لە پلەی خراپەکاراندا دانا، چونکە شانوشکۆی خۆتت لەبیرچوو، و خۆت یەکلاکردەوە بۆ تەماشا کردنی نەنگی و ناتەواوییەکانی خەڵکانی تر.

کە ئەمە بریتی بوو لە کار و کردەوە و رەفتاری تۆ سزا درایت بەوەی چاوگەی رەحمەت و بەزەیی لە دڵ کوێربوویەوە، و رووباری بێئاگایی و دڵڕەقی لە ناویدا تەقییەوە، پێتخۆش بوو بە چاوی کەم و سوك و بێ بەزەییانە تەماشای خەڵکی بکەیت، لەگەڵ ئەوەش ویستت ئەوان بە چاوی مەزنی و هەیبەت و رەحمەتەوە سەرنجی تۆ بدەن، هەر کەس لەوان لەسەر ئەوە لەگەڵ تۆ تەبابێت نزیکی و خۆشەویستی پێ دەبەخشیت، بەڵام تۆ بەو کارەت دووری و خەشم و تووڕەبوونت لە خوداوە بەدەستهێناوە، هەر کەس سەرپێچیت لێ بکات لەوەدا دووری و رق و کینەی بەسەردا دادەبارێنی، تۆش بەو کارەت دووری و خەشم وتوڕەبوون لە خوداوە دروێنە دەکەیت.

لە هەموو ئەوانەدا هیوا و ئاواتت درێژ دەکەیەوە، رۆیشتنت لەسەر رێگەی **"تسویف-دواخستن"** و پێپلەکانی سەرگەردانی لەلا خۆش و شیرین بووە، حەزی نەفست گرێ سەندووە و هەڵپەکردن دڵتی داگیرکردووە، بۆیە حەزت بۆ دونیا زۆر مەزن بووە، و

نەفست بۆ لای حەزەکانی —وەك ئەسپێکی سەرکەش- چەپۆکان دەکات، دڵت لە خۆی نامۆبوو، ئەوەش وایکرد شیرینی گرتنەبەری ڕێگەی دواڕۆژ نەبینیتەوە.

دڵت لەسە ڕێگەی سەرگەردانی سەرگەردان بووە، ڕێگەی رزگاریت لێ تێکچووە، چووەتە ناو پەردەی گوناهانەوە و هۆگری پێیان پەیداکردووە، حەزت بە بۆنی گوناهە، بەوەش گەیشتییە یاخیبوونی تەواو، بۆیە بانگەشەی شتێك دەکەیت کە تۆ خاوەنی نیت، و دەست بۆ شتێك دەبەی مەرامەکەی لە کەسانی وەك تۆ زۆر دوورە.

پاشان ئەوە تۆی هەڵنا تا بۆ غەیری خودا قسان بکەیت، تەماشای شتێك دەکەی مافی تۆ نییە، کار بۆ غەیری خودا دەکەی، بۆیە فریوتخوارد و خۆت روو بە رووی ترس و هەڕەشە کردەوە بەهۆی گومانی باشت بە نەفسی خۆت بەبێ ئەوەی بە خۆت بزانیت، تووشی هەڵنان بوویت بێ ئەوەی ئاگات لە خۆت بێت، بۆیە بەری کارەکانت بوو بە پیسی و تاوان و غەش و فێڵ و خیانەت و مەرامیکردن و خراپە و وازهێنان لە نەصیحەت، تۆ لە هەموو ئەمانەدا وا نیشان دەدەی هیچ کام لەوانە لە تۆدا نییە.

هەر کەس ئەمە سیرە و سلوکی بێت لە خوداوە شتێك رووی لێ دەکات کە حسابی بۆ نەکردووە و بیری لێ نەکردۆتەوە.

ئەی هەژار، گەر کەمترین ترست هەبوایە ئەوا وەك دایکێکی جگەر سوتاوی پڕ لە خۆشەویستی بەسەر گوناهەکانتدا دەگریای، بەسەر نەفستدا دەگریای وەك گریانی ئەو کەسەی مردوو دەلاوێنێتەوە، ئەمەش بەهۆی داباریني شوومی ئەو گشتە گوناهەی تۆی داپۆشیوە.

تۆ شایستەی ئەوەی هەموو ئەهلی ئاسمانەکان و زەوی بەهۆی گەورەیی بەڵاکەتەوە بۆت بگرین.

تۆ شایستەی بەوە هەموو دروستکراوەکانی خودا تەعزیباری و سەرخۆشیت لێ بکەن، چونکە لە دین بێبەش بوویت، و ناسینی خودات بە شوومی گوناه لێ وەرگیرایەوە، بۆیە زەلیلی یاخیبوون زاڵ بوو بەسەرتدا، و ناوت لە دیوانی یاخیبوان جێگیرکرا، و ئەهلی تەقوا لە تۆ نامۆبوونیان لا دروست بوو، مەگەر کەسانێك هاوشێوەی تۆ بن.

ئەوانەی تەنها خودایان ویست رێگەی خۆشەویستیان بۆ ئەو گرتەبەر، رێگەی رزگاریان بەدەستهێنا، تۆ بە رێگەیەکی تردا جیا لە رێگەی ئەوان هەنگاوت هەڵگرت، بۆیە رووبەڕووی شەکەتی بوویەوە کاتێك سەرپێچیت لە رێگەکەی ئەوان کرد بۆ رێگەیەکی تر، لە ئازاری ئەوەی تووشت بووە هۆشت لەدەستداوە..

نموونەی ئەم هۆکارانە کە رێگەکەی تۆ لە ئامێزی دەگرێت دەبنە بە بەڵگە بۆ زیانۆمەندی دواڕۆژ، پەنا دەگرین بە خودا، لە ئەو(**سبحانە**) داوای لێبوردن و نزیکبوونەوە لە چاکەکاران دەکەین، ئەو(**سبحانە**) **"لطیف و خبیر"**ە.



## مەعریفە بەبێ کار وەسیلەیە بۆ کار



وتم: تۆ ناترسیت ئەم مەعریفەیە ببێتە بەڵگە لەسەرت؟ خەریکبوون بە وەسفی ئەم مەعریفەوە فێڵ و فریودانێکی دوورودرێژە لە شەیتانەوە و ڕێبڕینەوەیە لە سوود و قازانجەکەی؟

وتی: هاوار بۆ ئەو بێشەرمییە، هاوار لە بێئاگاییەك وەسفکەرەکەی لە جوانکەرانیەتی، ئەمە بەراورد بە کەسێکی تیرهاوێژ کە تیرەکەی دەهاوێت و دەدات لەو شوێنەی بە ئامانجی گرتووە، ئارامی و ئاسایش بۆ کەسی یەکەم حەرامە، ترسیش فەرزە لەسەر هەر کەسێك باوەڕ بە خودا و ڕۆژیی دوایی و بەڵێن و هەڕەشە دەهێنێت.

ئەوەت زانی هەنگاوهەڵگرتن بۆ لای خودی خۆشەویستی و گرنگی پێدانی باشترین کارێکە بۆ خاوەنەکەی، و بەسوودترینە بۆ ئەو لە تەنها وەسفی خۆشەویستی، چونکە ئەو کەسەی داوای خودی قازانج و سوود دەکات و هەنگاوی بۆ هەڵدەگرێت وەك ئەو کەسە نییە تەنها بە شان و باڵی خۆشەویستیدا دەخوێنێ و وەسفی دەکات، من بە ناچاری سەرقاڵی وەسفکردن بووم، چونکە نەفسی خۆمم بینی لە دەرەوەی هەردووکیانەوە، بۆیە بە مەعریفەی وەسفکردنی خۆشەویستی و هیدایەت بۆ لای بێنیاز بووم، بەهیوای ئەوەی بمگەیەنێت بە خودی قازانجەکەی و هیدایەت بۆ لای، خودا لەسەر ئەوەی دەیلێین و لە ناخماندا شاردومانەتەوە یارمەتیدەرە.

## پوختەی زانینەکان:

### بەندە لە نێوان نۆ ترسدایە:

**یەکەمیان:** بترسیٚ و داوا لە خودا بکات و بۆی گەردنکەچ ببێت: تاکو شان دانەدات لەسەر چاکەکانی خۆی کە –بە زوڵم و زۆر–لەناو بەندەکانی خودادا خۆی پیٚ ڕێزدار دەکرد.

**دووەم:** بترسێت لە کوفری نیعمەتەکان کە بەهۆیانەوە لەخۆی باییبووە و لوتبەرزی دەنوێنێت و سەرقاڵبووە بە خۆشییەکانییەوە و شوکری لەبیرچووەتەوە.

**سێیەم:** ترسی هەڵنان (الإستدراج) بە نیعمەتەکانی هەبێت.

**چوارەم:** ترس لە خودا، بەوەس سبەینیٚ لە خوداوە سەرئەنجامێك رووی لیٚ بکات کە بە بیریدا نەهاتبوو، لەو گوێڕایەڵیانەی کە رجای پاداشتیان لیٚ دەکات، هەروەها لەو گوناهانەی کە ئەو نایزانیٚ و نەیژماردوون.

**پێنجەم:** ترس لەو گوناهانەی ئەنجامی داون، و لێیان دڵنیا بووەتەوە لەوەی لە نێوان ئەو و خودای موتەعالدایە.

**شەشەم:** ترس لە ماف و حەقی خەڵکی لەسەر ئەو.

**حەوتەم:** ترس لەوەی نازانێت ئەو بڕە لە تەمەن کە ماوە چی تێدا ئەنجام دەدات.

**هەشتەم:** لە پێشخستنی سزای گوناهان و تۆڵەی خودایی بۆ دونیا بەرلە مردنی بترسێت.

**نۆیـەم:** تـرس لـەو زانسـتەی پێشـینەی خـودا بـە ئـەو هەیـەتی، لـە کـام لـە دوو خانەکەدا(بەهەشت، دۆزەخ) لە **"أم الکتاب"**دا خودا ناوی نوسیوە.

لە گوناھ خۆت بپارێزە چونکە شوومییەکەی لە مرۆڤەوە نزیکە، و تاریکییەکەی چڕ و خەستە، لـە چـاکەیەك خـۆت بپـارێزە کـە لـە رێگـەی صـاڵحان دوورت دەخاتـەوە، خوێنەری قورئان بەبێ مەعریفە لە خۆبەزلزانینەوە بەسەر بەندەکانی خودادا و منـەت کردن بەسەر خودادا -**سبحانە وتعالی**- بە چاکەکانی زۆر نزیکە، ئەو چاکانەی گەر خودا ئـەو بداتـە دەسـتیان سـەرئەنجامەکەی تیاچـوونە، ئـەو زۆر نزیکـە ئـەوەی خـودا لـە بەندەکانی داوای دەکات لە گوێڕایـەڵی و قـەدرزانی و بـە مـەزن زانـین و شـکۆمەندی دانەپاڵ ئەویش بۆ نەفسی خۆی لێیان داوا بکات.

خوێنەری(قورئان) بێ فیقھ سەلامەت نییە لە خراپەکاری بەرانبەر بەندەکانی خـودا، هەروەها سەلامەت نییە لەوەی داوایان لێ بکات دان بـە چـاکەکانیدا بنـێن و ئـەوەی بڕیارە لە نەفسی خۆی بە خودای ببەخشێ بەوانی ببەخشێت.

خـودای موتـەعال داوا لـە ئـەو دەکـات: خـۆی بـۆ ئـەو جـوان بکـات، و ئـەو بپەرسـتێ و کارەکـانی تـەنها بـۆ ئـەو بێـت، بـەڵام ئـەو هـەموو ئـەو کارانـەی بـە دروستکراوەکانی خودا بەخشیوە.

۞ ۞ ۞

# مەدح و زەم



## جیاوازی نێوان ریا و خۆشەویستی بۆ مەدح و رقبون لە زەم:

وتم: ئەو پیاوە دەڵێت: ئەو لەو کەسانەیە بە کارەکەی پاداشت و شوکری لە خەڵکی ناوێت، ئەو بە کاروکردەوەی چاکە بەناوبانگە: بە نوێژ، بە صەدەقەکردن، بە رۆژوو، شتانی تریش، کەسانێك مەدحیان کرد زۆر پێی گەشایەوە و دڵی پێخۆش بوو، کەسانێکی تریش زەمیان کرد زۆری لا ناخۆش بوو و پێی بێزار بوو، هەتا لە ناخەوە هەستی گۆڕان بەرانبەر هەردوو دەستەکە دەبینێتەوە، چۆن نیەتی ئەمە و خۆشەویستی بۆ حەمد و سەنای خەڵکی و پێناخۆشبوونی بۆ زەمی خەڵکی دەناسرێتەوە؟ کەسی ریابازیش مەدح و سەنای خەڵکی پێخۆشە و رکی لە زەمیان دەبێتەوە.

وتی: واجب نییە لەسەر خەڵکی مەدح و سەنای باشی خەڵکیان پێناخۆش بێت، واجبیش نییە لەسەریان زەمکردنیان پێخۆش بێت، چاکە ئەنجام بدەن یان ئەنجامی نەدەن، گەر ئەو کارە لە ئەوانەوە بۆ مانایەکی خراپ و تێکچوو نەبێت، چونکە کەسی ریاباز بە کارەکەی مەدح و سەنای گەرەکە و خۆشیدەوێت و رکی لە زەمی خەڵکی دەبێتەوە، بۆیە کەسی راستگۆ لەسەری واجب نییە مەدح و سەنای پێناخۆش بێت و زەمی پێخۆش بێت.

زۆرینەی صادقان مەدح کراون و سەنا لەسەریان هەبووە، ئەوەش هیچ زیانێکی بەوان نەگەیاندووە.

**جیاوازی نێوانیان:** کەسی ریاباز ویست و هیوای لە کارەکەیدا پلە و پایەی دونیـا و مەنزیلەتە لە دڵی خەڵکیدا، بۆیە کارەکەی بە نیەت و ویستی خۆی تێکداوە، بەو کارە ریاکارانەی ئەوەی دەیەوێت بەدەستی بهێنێت یان بەدەستی نەهێنێت، لەسەر کارەکەی حەمدی بکەن یان حەمدی نەکەن، زەمی بکەن یان زەمی نەکەن.

جگە لە کەسی ریاباز زەمکردنەکەی پێناخۆشە بەهۆی ئەو حاڵەتە ناپەسـەندەی لـە زەمکردندایــە، وەك بەربوونــەوە لــە بەرچــاو خــەڵکی، بــوغز و رقــی ئیمانــداران، و هاوشێوەکانی ئەمانــە، ســەنای بــاش و قســەی جوانیشــی خۆشــدەوێت بــەهۆی مانــای داپۆشین و ستری خودا بۆ ئەو لە گوناه و خراپەکانی، و هەروەها بـەهۆی ئـەو هیـوا و رجایەوە کە لە سەنای باش و قسەی جوان و خۆشەویسـتی خـەڵکی و سـۆز و بـەزەیی ئەواندایە، باوەڕ و سووربوونی نیەتەکەی لە سەرەتای کارەکـە و کۆتـایی کارەکەدایـە، بەوەی هیچ مەبەستێکی نەبێت جگە لە رووی پاکی خودای موتەعال بە تاکوتەنهایی، هەروەها بەدەستهێنانی پاداشتی دوارِۆژ، جا حەمدی بکەن یان زەمی بکەن، خۆشییان بوێت یان رقیان لێی بێت.

## ترس لە وەرگەڕانی نیەت:

لەوانەیە باوەڕی کەسەکە لە کاتی ئەنجامدانی کارەکەدا ویسـتی دوارِۆژ بێـت، بـەڵام دواتر کەم کەم دەگوێزێتەوە بـۆ ویسـتی دونیـا، ئـەوەش چـونکە ئـەو بـاوەڕە شـتێکی نادیــارە، خــەڵکی بەگشــتی زانســت و گرنگــی پێــدانیان پێــی نییــە، بێئاگــایی و سەهوکردنی زۆریان لەمەڕ ئەو کارە هەیە، دەبـوا گرنگـی پێدانی بـاوەڕ بـەو بـاوەڕ و نیەتە زۆر زیـاتر بوایـە لـە گرنگـی پێدانی بـە کـار و کـردەوە زاهیرییـەکان، چـونکە

سەرئەنجامەکانی کار و کردەوە زاهیرییەکان جەستە ناتوانێت وەریان بگێڕێت و لە حاڵی خۆیان بیانگۆڕێت، بەلاَم نیەت لە تێکچوون سەلامەت نییە، با لە سەرەتاشەوە صادق و دروست بووبێت، بەوەی لە باشترین باریەوە بگۆڕێت بۆ خراپترین و ناشیرینترین بارێك کە دەکەوێتە سەری، خراپترینێك بۆ کاری خاوەنەکەی.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((کار و کردەوەکان بە نیەتن، هەموو کەسێکیش ئەوەی بۆ هەیە کە نیەتی لێهێناوە)) [1]

کار و کردەوەکان بە نیەتەوەن و لە نیەتەوەن، بەندە لە هەموو شتێك زیاتر ئاتاجی نیەت و ناسینی تێکچوونییەتی، چونکە کار و کردەوەکان بە دروستیی نیەت دروست دەبن، و بە تێکچوونی نیەت تێکدەچن، هەموو ئەوەی ئێمە باسی دەکەین بریتییە لە وەسف بۆ کردار، بۆ حەقیقەت و دروستیی نیشانەگەلێکی تر هەیە جیا لەمەی ئێمە باسمان کرد.

**هەموو کار و کردەوەکان دوو کارن:** کارێك کە نیەت تیایدا زاڵە، لەگەڵ کارێك نیەت تیایدا زاڵ نییە، کارکردن لە غەیری گوێڕایەڵی خودا و سوننەتی پێغەمبەرەکەی نیەتی تێدا زاڵ نییە، ئەوەی نیەتی تێدا زاڵە بریتییە کارکردن بە گوێڕایەڵی خودا لەسەر ڕەوگەی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) خەڵکیش **لەمەدا دوو پۆلن:**

**پۆلێك** کە دەزانن نیەت چییە و دەیناسنەوە، **لەگەڵ پۆلێك** کە نازانن نیەت چییە و نایناسنەوە.

---

[1] أخرجه البخاري ومسلم.

**ئەوانەش کە نیەت دەناسنەوە دوو پۆلن:**

**پۆلێك** ڕووانین و وردبوونەوەیان بۆ نیـەت تـەنها لاف و گەزافـە و خۆزگـە و ئاواتـە، **لەگەڵ پۆلێك** کە لە نەفسی خۆیان لەمەڕ نیەتەکانیان دڵنیا نین، ئەوان تەنها بیر لـەوە دەکەنەوە چەندە لە ترازووی خودادا کار و کردەوەکانیان وەردەگیرێت، ئەوەش بریتییـە لە میحنەت، میحنەتی نەفست.

## واجبوونی وردکاری لە چاودێری دڵدا:

هەندێ کەس وا دەزانـێ حەمـد و سـەنای خـەڵکی پێناخۆشـە وەك خەمخۆرییـەك بـۆ کارەکەی، و ترسان لە فیتنەی پێخۆشبوون، بۆیە لاناکاتەوە بـەلای خـەیاڵ و گومـانی خەڵکیدا، چونکە زۆربەی گومانەکانی خەڵك بەو جۆرە نییە کە گومان دەبـەن و بـیری لێدەکەنـەوە، هـەتا لـە ڕاسـتەقینەی صـدقی ئـەو گومانـە وردەبنـەوە لـە کـاتی ئاشکرابوونی.

با بەندە پێداچوونەوەی نەفسی خۆی بکات گەر سەنا و مەدحی کرا یان زەمی کرا و دایانە پاڵ شتی ناپەسەند، گەر مەدح و سەنای بۆ مانای ئەوەی وتمان لە داپۆشین(ستر) و ڕجای سەنای باش و قسەی جوان پێخۆش بوو، وەك ئـەم ئایەتـە پیرۆزانـە: ﴿وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّي﴾ طـە: ٣٩، هـەروەها: ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ أَجْرَهُۥ فِي ٱلدُّنْيَا﴾ العنكبوت: ٢٧-وتـی: پاداشتەکە سەنای باشی خەڵکە بۆی، هەروەها: ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً﴾ النحل: ١٢٢، وتی: سەنای باش و چاك، هەروەها: ﴿وَٱجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي ٱلْـَٔاخِرِينَ ﴿٨٤﴾﴾ الشعراء: ٨٤- وتی: سەنای باش و چاك.

پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی پیاوێك كارێك ئەنجام دەدات مەبەستی رووی پاكی خودایە و خەڵكی لەسەری مەدح و سەنای دەكەن، فەرمووی: ((ئەوە مژدەی پێشكەوتووی باوەڕدارە))[١]

هەروەها لەسەر ئەو بەندەی گەر خودا خۆشیویست، دەفەرموێت: ((لە دونیا دەریناكات تا گوێیەكانی پڕ نەكات لەوەی پێیخۆشە))[٢]

هەروەها ئەو فەرموودەی كە دەفەرموێت: ((ئێوە شایەتەكانی خودان لە سەر زەوی))[٣]، ئەمانە و هاوشێوەی ئەمانە لە كیتاب و سوننەدا.

گەر سرورەكەی بەوەی باسی دەكەن شوكربێت لەسەر ئەوەی خودا داپۆشیوە لە ئەودا و حەمد بێت بۆ خودا بەوەی خودا گێڕاویەتی لەوانەی بە نیشانەی خێر باس دەكرێن، ئەو سرووره سرورێكی خراپ و تێكچوو نییە، بەڵكو شوكر و داوای زۆرتر و زیاترە.

نیشانەی سەلامەتی نیەتی لەوەدا: ئەوەیە كە تەوازوع و شۆڕبوونەوەی بۆ خودا زۆرتر و زیاتر بێت، بۆ نیعمەتەكانی شوكری زیاتر بكات، بۆ گوێڕایەڵی خودا كۆشانی زۆرتر بكات، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە نەفسی خۆی بگێڕێتەوە سەر رێگەی ترس لە هەڵنان(**الإستدراج**)، ئەو كاتە ئەوەی لە كارەكەی شاراوەیە لای خۆشەویستر بێت لەوەی دەركەوتووە، ترسان لەوەی كە ئەهلی چاكە رووبەڕووی دەبنەوە لە فیتنە كاتێك گوێیان لە مەدح و سەنا دەبێت، هەروەها لەبەر ئەو نەهیكردن و ناپەسەندییەی لە

---

[١] **أخرجه الهيثمي في مجمع الزوائد.**

[٢] **أخرجه ابن ماجة والترمذي.**

[٣] **الحديث أخرجه البخاري في الشهادات ومسلم في الجنائز والترمذي والنسائي وابن ماجة.**

گوێگرتن بۆ مەدح و سەنا هاتووە، ئەوەش وەك فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ): ((هەر کەس مەدحی براکەی بکات لە روودا وەك ئەوە وایە زنجیری ئاسنی لە مل کردبێت))[1] ((گەر گوێی لێت بێت رزگاری بەدەست ناهێنێت))[2]، هەروەها: ((کوشتت خودا بتکوژێت))[3]، ئەمانە و زۆرێکی تر لە هاوشێوەکانی ئەمانە.

گەر مەبەست و نیەتی شوکر کردنی خودا بوو لەسەر نیعمەتەکانی و ئەو سرووری کە دەگاتە دڵی بەهۆی مەدح و سەناوە کاتێك دەیبیستێت هیوا و رجای بە پێشەنگ(**قدوة**) بوونی لێ بکات، گەر لەو کەسانە بوو بەکاری ئەوە دەهات خەڵکی چاوی لێبکەن و شوێنی بکەون، بەپێی ئەو ئایەتە پیرۆزە: ﴿وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾﴾ الفرقان: ٧٤، دەڵێت: بمن بە ئیمام لە خێردا و خەڵکی چاویان لێ بکات و رەوگەی ئەوان بگرنە بەر.

گەر هیوا و رجات بەو جۆرە بوو ئەوە زیانی پێ ناگەیەنێت و کارەکەی خراپ ناکات.

لە"**مطرف**"ەوە باسکراوە، وتویەتی: (مەدح و سەنایەکم بۆ خۆم نەبیستووە نەفسی خۆمم لا بچووك نەبووبێتەوە)

هەروەها "**زياد بن أبي مسلم**" دەڵێت: (هەر کەس مەدح و سەنا ببیستێت شەیتان خۆی بۆ دەردەخات، بەڵام باوەڕدار پێداچوونەوە دەکات، یان دەڵێت"**إنا لله وإنا إليه راجعون**")، "**ابن المبارك**" دەفەرموێت: هەردووکیان راست دەکەن.

---

[1] أخرجه الإمام أحمد.

[2] أخرجه الهيثمي في مجمع الزوائد.

[3] أخرجه الهيثمي في مجمع الزوائد.

ئەوەی"**زیاد**" باسی دەکات بریتییە لە دڵی خەڵکی ڕەشۆکی، ئەوەی "**مطرف**" باسی دەکات دڵی کەسانی تایبەتە..

گەر ئەوەی بیست و پێی دڵخۆش بوو مەبەست و نیەتی داوای بەرزبوونەوە و مەنزیلەت بێت لەلای خەڵکی ئەوە خراپترین حاڵە بۆ پووچکردنەوەی کارەکەی.

## ڕێچکەی صاڵحان و ئەهلی ریا لە مەدح و زەمدا:

کەسی ریاباز ئەو کەسەیە کە مەزهەب و نیەتی لە سەرەتا و کۆتایی کارەکەیدا داوای حەمد و سەنا و بەرزبوونەوە و ڕێزە لەلای خەڵك، هەروەها بەو کارەی مەبەستی بەدەستهێنانی سوود و قازانجە، ئەوە ئەو کەسەیە هەڕەشەی سەختی لێکراوە لە دونیا و دوارۆژدا.

گەر بەڕاستی دەیزانی: ئەوەی ئەو پێی دڵخۆشە بەم مانایەیە، و بەهۆی ئەوەوە نییە داوای حەمد و سەنا لە خەڵکی ناکات، چونکە ئەو پلە و پایە و مەنزیلەی لەلای خەڵکی هەیە، و لەو بارەدا ئاتاج نییە بە مەدح و سەنایان، بۆیە—گەر بە ناوهێنانی چاکی دڵخۆش بوو-گوناهێکی لە گەردن نییە.

نیشانەی ئەوەش تەوازوع و شۆڕبوونەوەی بۆ خودا زۆرتر ببێت و ترسی لە هەڵنان هەبێت و ئەوەی لە کارەکەی شاراوەیە لای خۆشەویستتر بێت لەوەی دەردەکەوێت و ئاشکرا دەبێت، چونکە ئەو بەو گرتنەبەرە مەبەستی گرتنەبەری ڕێگەی صاڵحانە، بە ئەندازەی ئەوە دەبێت حەز و ویستی هەبێت بۆ کارەکانیان و ئەوەی لە ناوی چاکە بەدەستیان هێناوە و بوونیان بە ئەهلی چاکە، لەگەڵ ئەوەی کە پێیەوە پەیوەستە لە

ترس لە فیتنە کە ئەهلی مەدح و سەنای باش کاتێك مـەدح و سـەنا دەکـرێن پێیـەوە پابەندن، وەك ئەو فەرموودەی پێغەمبـەر (ﷺ): ((ئـەو پیـاوەت کوشـت)) هـەروەها: ((گەر گوێی لە تۆ بێت رزگـاری بەدەسـت ناهێبیـت)) ، هـەروەها: ((سـەری براکـەی خۆتت پەڕاند))[١]، هەروەها: ((ئاگاداری مەدح بن چـونکە سـەربڕینە))[٢]، هـەروەها: ((گەر مەدحکەرانتان بینی خۆڵ بکەن بە سەروچاویاندا))[٣]، هەروەها: ((گەر پیاوێك بە چەقۆیەکی تیژەوە بچێت بۆ پیاوێکی تر باشترە لەوەی لـە روویـدا مـەدح و سـەنای بکات))[٤]، نموونەی ئەمانە زۆرن.

کەسی مەدحکراو ترس لەسەری زۆرترە لە رجا، چونکە ترس زیانی پێ ناگەیـەنێت، بەڵام مرۆڤ لە فیتنەی رجا سەلامەت نابێت.

**نیشانەی خاوەن پلە و پایەکان لە دونیادا و نیشانەی کەسانی ریاباز و عەودالّی پلە و پایە:** ئەوەیە کاتێك مەدح و سەنا دەبیستن پێیانخۆشە و عیززەت و سەرسامی زۆرتریان بە نەفسی خۆیان بۆ دروست دەبێت، و لە هەڵنان بێئاگان، پێیـان راکێشـاوە و ئـاوات دەخوازن و تەماعیان هەیە و ئەوەی لە کار و کردەوەکانیان بۆ خەڵکی دەرکەوتووە لایان خۆشەویتترە لەوەی شاراوەیە، و لە فیتنە و ئافەتی کاروکردەوەکان ناترسن.

هەر بەو جۆرە بە زەمکردن بێزار و دڵتەنگە، بۆیە زەمکردنی پێناخۆشە چـونکە حـەزی دەکرد لە جێگەی ئەو زەمکردنە مـەدح و سـەنا بکرابایـە، تـاکو بـەوە پلەوپایـە و قـەدرو

---

١ أخرجه الشيخان وأبو داود وابن ماجة.

٢ أخرجه ابن ماجة.

٣ أخرجه مسلم والترمذي وابن ماجة.

٤ أخرجه البخاري ومسلم.

مەنزیلەو بەرزبوونەوەی لەلای خەڵکی بەدەست بهێنابایە، ئەو پێناخۆش بوونە پێناخۆش بوونێکی نەخۆشی زەمکراوە، خاوەنەکەشی کەسێکی لەخۆدەرچوو و فریوخواردووە.

گەر خۆشحاڵییەکەی خۆشەویستی بوو بۆ داپۆشینی جوانی خودا لە هەڵە و ناتەواوییەکانی ئەودا و ناخۆشحاڵی بۆ هەڵماڵینی داپۆشینی خودا لەسەر ناتەواوییەکانی، چونکە خەڵکی رقیان لێی نابێت تا رقی خودا بەسەریدا دانەبارێت بەر لە رقی خەڵکی، گەر پێناخۆش بوونەکەی لەم رووەوە بوو، ئەوە کەسی راستگۆ و درۆزنیش رقی لە زەمکردنە و لای ناپەسەندە، بۆیە لەسەر ئەوە لۆمە ناکرێت.

نیشانەکەی: گەردنکەچ بوون و دەربڕینی هەژاری و گەدایی بۆ خودا و پێداچوونەوە و وردبوونەوە بۆ خۆیەکلاکردنەوە بۆ رێگەی خودا و رێگەی ئیستیقامە و بەڵگەی رۆشنی ئیمان و تێکۆشان تیایدا.

## رۆشنکردنەوەی زۆرتر لە نیشانەکانی ئەو دوو دەستەیە:

**رۆشنتر لەوە:** هەر کەس بانگەشەی ئەوە دەکات کە بە کارەکەی تەنها مەبەستی رووی خودایە و بە هیچ یەکێك لە کار و کردەوە چاکەکانی پاداشت و شوکر لە خەڵکی داوا ناکات، پاشان خەڵکی بەو کارەیان زانی و بە چاکە ناویان هێنا، و ئەو کەسە بوو بە کەسێکی ناسراو لە ناویاندا، و پلە و پایە و بەرزی لەلای ئەوانەوە بەدەستهێنا، گەر لە نەفسی خۆی ئەوەی زانی گەر پێی بوترێت: ناوەکەی بگۆڕرێت و ئەوەی بەدەستی هێناوە لە مەدح و سەنا و ناوی چاك بچێت بۆ کەسێکی تر، و ئەو وەك ئەو کەسەی لێ بێت کە بە کاری چاکە بەناوبانگ نییە، تەنها ناوێك و هیچی تر، گەر ئەو کەسە ئەمەی لا خۆشەویست بێت، ئەوا ئەو کەسە کارەکەی رجای خێری لێ دەکرێت.

گەر پێی ناخۆش بوو ناوی چاکی ئەو بچێت بۆ کەسانی تـر و ئـەو بـەبێ نـاو و وەك کەسێك کە بە کاری چاکە نەناسراوە بمێنێتەوە، ئەوا لەو کاتەوە کارەکەی بانگەشەکەی پووچ و بێبنەمایە.

**چونکە ئەو کەسەی کە دەڵێت:** ئەو بەو کارەی خودای مەبەستە و مەبەسـتی هـیچ کەسێکی تر نییە، گەر باسی چاکە و باشـەی ئـەو بچـێت بـۆ کەسـێکی تـر پاداشـتی کارەکەی ناچێت بۆ کەسێکی تر، و بە مەدح و سەنای خەڵکی بۆ ئـەو کەسـە بـەهۆی کاری چاکەی ئەمەوە هیچ لە پاداشتەکەی ئەم کەمی نەکردووە، لەوانەیـە زۆرتـری لـە پاداشت لەلای خودا دەستبکەوێت و نزیکتر بێت بە سەرئەنجامی باش.

ئەو کەسەش کە بانگەشەی ئەوە دەکات بە کارە چاکەکانی مەبەستی خەڵکی نییـە، پێیناخۆشە ئەو ناوەی لەلای ئەوان جێگیربووە بە مەنزیلە و پلە و پایەوە بسـڕێتەوە، و پێیناخۆشە بـەبێ نـاو و باسـی کـارە چـاکەکانی و ناسـینەوەیان بمێنێتـەوە، هـەروەها پێیناخۆشە لەلای ئەوانەی ئەم دەڵێت بۆ ئەوان کار ئەنجام نادات بەبێ ناو بمێنێتـەوە و کارەکانی نەناسنەوە.

**نموونەی ئەم کەسە:** تەماشا دەکات گەر خەسڵەتێکی چاکەی لەلای خەڵکی هـەبوو، خەڵکی ئەویان دەدایە پاڵ ئـەو خەسـڵەتە و وایـان دەزانـی ئـەو کەسـە خـاوەنی کـارە چاکەکەیە، بەڵام تیایدا بە هەڵەدا چووبوون و گومانیان بردبوو ئەو خـاوەنی خەسـڵەتە چاکەکەیە، کەسەکەش پێی ناخۆش بێت ئەوان ئەو راستییە بـزانن و دەربکـەوێت ئـەو خاوەنی خەسڵەتە چاکەکە نییە و ئەو کارە چاکەیە لە ئەو نەوەشاوەتەوە، یان کـارێکی چاکەی هەبێت و خەڵکی پێی وابێت ئەوەی ئەنجامی دەدات لە چاکە زۆرتـر و زیـاترە،

دیسان بۆ ئەمەش پێیناخۆش بێت خەڵکی بە راستییەکە بزانن ، ئەوا ئەو کەسە لەو جۆرە کەسانەیە کە پێیخۆشە حەمد بکرێت بەوەی ئەنجامی داوە.

کەسێك نابینیتەوە پێیخۆش بێت حەمد بکرێت بەوەی ئەنجامی نەداوە، پێیخۆش نەبێت حەمد بکرێت بەوەی ئەنجامی داوە، بەڵکو هەردووکیانی خۆشدەوێت.

هەر بەو جۆرە گەر هاوەڵی پیاوێکی کرد کە بە چاکە و عیبادەت لەلای خەڵکی بەناوبانگ بوو، یان هۆیەکی هەبوو ناو و ناوبانگی لای خەڵکی پێ پەیدا کرد بوو، کەسی هاوەڵێکەری ئەو پیاوچاکە پێیناخۆش بوو پلە و پایەی کەسەکە لەلای خەڵکی بڕوخێت، و گوێ بە خۆشەویستی نەفسی خۆی نەدات کاتێك کاری چاکە ئەنجام دەدات، ئەوا ئەو کەسە پێیخۆشە حەمد بکرێت بە خۆدانەپاڵ کەسێکی تر، ناکرێت مەدح و سەنا و ناوهێنانی پێخۆش بێت بە کاری چاکەی کەسانێکی تر و پێیناخۆش بێت حەمد بکرێت بە کاری چاکەی خۆی و بە چاکە ناوبهێنرێت، بەڵکو هەردووکیانی خۆشدەوێت.

گەر نەفسی خۆی لەم شوێنانەدا بەڕاستگۆ لەسەر ئەوەی خۆشیدەوێت بینییەوە، ئەوا راستگۆیی تێدایە، و رجا وایە ئەو کەسە لە ئەهلی صدق بێت.

❁ ❁ ❁

# یەقین و عیززەت



## راستی لە یەقیندا:

یەقین لەگەڵ کاردایە، صدق لەناو یەقیندا: بریتییە لە بینینی پاداشت و سزا، صدق بە زۆری بەخشین و زۆری قسەکردن نییە، پێویستی بە جولأنی دوو لێو نییە، بەڵکو بە ئیمان و بە ئەقڵ و مەعریفە و تەگبیری باش لە دەرەوە و ناوەوەی کار و بارەکانیدا.

صدق بناسی و پێچەوانەی صدق کە درۆیە بناسی، خێر بناسی و پێچەوانەی خێر کە شەڕە بناسی، کار بکەی لە جێگیرکردنی صدقدا و نەرێکردنی دژەکەی، ئەسڵ لە لق جیابکەیەوە، کار بکەی بۆ جێگیرکردنی صدق لە رووی ئەسڵەوە، هەروەها نەرێ کردنی دژەکەی لە رووی ئەسڵەوە، چونکە ئەسڵ دێت بەسەر لقەکاندا.

هەتا بەندە بە لقەوە خەریك و سەرقاڵ بێت و بێئاگا بێت لە ئەسڵ، ئەوا لە سەرقاڵییەکەی فەنا نابێت و خەریکبوونەکەی کۆتایی پێ نایەت، مادام ئەسڵ جێگیر بێت، هەر کاتێك لقێك دەڕوات لقێکی تر جێگەی دەگرێتەوە.

## نەفسپەزێری لە ناخی مرۆڤدا ئەسڵی نەخۆشی دڵانە:

خۆشەویستی بۆ نەفسپەزێری[1] لەناخی مرۆڤدا ریشەی داکوتیوەو ئەسڵێکە لە ئەسڵەکانی، خۆشەویستی بۆ دەسەڵات و پلەوپایە لەلای خەڵکی لەو ئەسڵەوە سەرهەڵدەدات،

[1] نەفسپەزێری: بریتییە لە دانەپڵی عیززەتی درۆینە بۆ لای نەفس و باڵاکردنی نەفسی خۆ بەسەر دەوروبەردا.

هەروەها لوتبەرزی و فەخرکردن، تووڕەبـوون و حەسـەد، رق و کینـە و دەمـارگیری، نەفس عاشقی ئەم عیززەتی نەفسەیە، و رۆشنکەرەوەی چـاویەتی، لای خۆشەویسـتترە لە تەنها دایکێك بۆ ئەو یەکلا بووبێتەوە.

**پێمگەیشتووە:** دوایین شتێك کـە لـە دڵـی ئەوانـەی دونیـا بـۆ دواڕۆژ وازلێـدەهێنن بریتییە لەم نەفسـپەزێرییە، ئەمـەش بـەهۆی سـەختی داگیرکـردن و بنجـداکوتانی لـە نەفسی مرۆڤدا.

بۆیە کرداری چاکەی ئەوانەی نەبوون بە موریدێکی بەهێز و شارەزا لە قورئانخوێنـان چەکەکەی کە دەسەڵاتی خۆیانی پێ بەهێز دەکەن بریتییە لە نەفسپەزێری و فەخرکردن بە کارەوە و سووك و کەم تەماشا کردنی خەڵکی.

کەسانێکمان بینی کە کاری صاڵحانیان ئـەنجام دەدا لـە نوێـژ و رۆژوو و صـەدەقە و حەج و جیهاد، بەڵام نەفسـپەزێرییەکی زۆریـان لـە ناخـدا حەشـاردابوو، بـەڵێ، ئێمـە کەسانێکمان بینی بۆ ئەوەی نەفسپەزێری زیاتر بەدەست بهێنن تەوازوعیان دەنواند.

یەکێك لە ئەهلی نوسك نابینم لەم نەفسپەزێری خاڵی بێت.

گەر هێشتا شیرینی تامی نەفسپەزێری لـەلا بێـت لەدەسـتی سـەرفراز نابێـت، جـا کەسەکە عابید بێت یان زاهید.

چۆن کەسەکە دەبێت بە زاهید کە زوهد لەگەڵ نەفسپەزێری لە یەك شوێندا نـاتوانن پێکەوە هەڵبکەن؟!

هەر کەس بە نەرێکردنی نەفسپەزێری چارەسەری ئەمـەی کـرد و خـودا یارمـەتی دا لەسەری و توانی ریشەکەند کردنی بەدەست بهێنێت، رۆیشتن لەسەر رێگەی خۆشەویستی

خودا -**عز وجل**- و رەوگەی ئیمان و رێگەی ئیستیقامە و پێپلەی صاڵحانی لەسەری ئاسان دەکات، هەر بەو جۆرە چارەسەرکردنی صدق لە کارکردەوەکانیدا لەسەری ئاسان دەبێت، دڵی بە لای گەردنکەچی و تەوازوعەوە دڵنیا دەبێتەوە، و رێگەی میانەگیری لا خۆش و شیرین دەبێت.

هەر کەس نەتوانێ ئەوەی بۆ خۆی پێیخۆشە بۆ براکەی پێیخۆش بێت هێشتا نەفسپەزێری تێدایە، نەتوانێ رقی خۆی بخواتەوە نەفسپەزێری تێدایە، نەتوانێ حەق قبووڵ بکات نەفسپەزێری تێدایە، نەتوانێ تەوازوع بنوێنێت کە بریتییە لە لوتکە و جوانی تەقوا نەفسپەزێری تێدایە، نەتوانێ بەردەوام بێت لە صدق نەفسپەزێری تێدایە، نەتوانێ حەسەد وازلێبهێنێت نەفسپەزێری تێدایە، نەتوانێ کینە واز لێ بهێنێت نەفسپەزێری تێدایە، نەتوانێ یاخیبوون واز لێ بهێنێت نەفسپەزێری تێدایە، نەتوانێ دڵی سەلامەت رابگرێت نەفسپەزێری تێدایە، نەتوانێ نصح و ئامۆژگاری وەربگرێت نەفسپەزێری تێدایە، سەلامەت نەبێت لە سووك و کەم تەماشا کردنی خەڵکی نەفسپەزێری تێدایە.

چەندە زیانی نەفسپەزێری زۆر و تێکچوونەکەی مەزن و کارەکەی بەهێز و روشدەکەی کەمە! خەڵکی رەشۆکی و تایبەتان لە خەڵکی پەی بە روونی و ئاشکرایی گومڕاییەکەی نابەن، و مەعریفەیان پێی کەمە و شوێنکەوتنیان بۆی زۆرە.

**بۆیە ئارەزوو** بریتییە لە بڕیاری، لوتبەرزی برا و پشتیوانی، ستەم رەوشت و ئاکاری، تووڕەبوون دەسەڵات و سوڵتانی، ریا یارمەتیدەرێك لە یارمەتیدەرانی، بەدەستدەهێنێت و بەهۆی نەفسپەزێرییەوە دەیبەخشێت، خۆپەسەندی لاوازترین کۆمەککاریەتی، حەسەد ئەمیری سەربازەکانی، دەغەڵی دۆستی راوێژکارییەتی.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((لوتبەرزی و حەسەد چاکە هەڵدەلوشن وەك چۆن ئاگر پلۆپووش هەڵدەلوشێت))[١] **هەندێکیان دەڵێن:** دەغەڵی و حەسادەت.

## نەفسپەزێری نەفس گشتییە لە خەڵکیدا و تایبەتە لە خوێنەرانی قورئاندا:

نەفسپەزێری لەناو خەڵکیدا بەربڵاوە، لە پیاو و لە ژن، لە هەژاران و دەوڵەمەندان، لە لاوازان و بەهێزاندا، لە خوێنەرانی قورئان و زانایاندا، هەر یەکێك لەمانە لێی دەردەکەوێت بەو ئەندازەیەی کە پێویستە لێی دەربکەوێت، هەر کەس نەتوانێ ئاشکرای بکات لە ناخەوە و بەنهێنی مامەڵەی خەڵکی پێ دەکات، چونکە هەتا لە مرۆڤدا بوونی هەبێت بەشی خۆی وازلێ ناهێنێت بە نهێنی و بە ئاشکرا.

نابینی چۆن لە خەڵکی بە رقەوە پیشدەخواتەوە و چۆن حەسوودیان پێ دەبات و بە دەوروبەری خۆیدا دەسورێتەوە و بەدوای نەنگی و ناتەواوییەکانیاندا دەگەڕێت، نابینی چۆن بە بڕیاری ئارەزوو بڕیاریان لەسەر دەردەکات؟!

گەر بتوانێت لە دەرەوە خۆی بگرێتەوە ناتوانێت لە ناوەوە و لە پەنهانی خۆیدا زاڵ ببێت بەسەریدا، بۆیە کاتێك دێت ئەوەی لە ناخیدا پەنهانی داوە بهێنێتە دەرەوە.

ناشیرینترین کاری نەفسپەزێری و تێکچووترینیان و رسواترین شێوەی ئەوەیە کە لە کەسی قورئانخوێندا رەنگ بداتەوە، چونکە ئەو ناتوانێت بە هیچ هۆکارێك خۆی عەزیز بکات بەسەر خەڵکیدا بە هۆکارەکانی ئایین نەبێت، ئەگەر نە کاریگەری ئەوەت لەسەر دەبینی.

---

[١] أخرجه ابن ماجة.

پـــاکێتی بـــۆ خـــودا، خوێنـــەرانی قورئـــان لەنەفســـپەزێری و کۆمـــەککارانی رووبەڕووی چی دەبنەوە!

ئـەوەی ئـەو نەفسـپەزێریەت لەوانـدا پـێ نیشـان دەدات خێرایـی کینـەیان و زۆری تووڕەبوونیانە لەپێناوی نەفسدا لە رێگەی بەخشینی نەفسپەزێری بە خۆیان، هـەروەها ئەوەی لەسەر خەڵکی گەورەی دەکەن کە هیچ ترسێکی تێدا نییە، هـەموو ئەوانـە لـە نەخۆشی نەفسپەزێری و جووڵەی نەفسپەزێریەوەیە، کارێك کە رێگە نەدراوە بە ئەهلی بەهەشت و فریشتەکان و پێغەمبەران تیایاندا هەبێت، خوێنەرانی قورئان بۆ خۆیان بـە رەوای دەزانن و لەسەر سەری خۆیانی دادەنێن.

لەسەر کەسی صادق پێویستە بە خوێندنی قورئانەکەی کردار ئـەنجام بـدات لـەپێناو کوژاندنەوەی کڵپەی نەفسپەزێری لە دڵی لە یەکەمین هەنگاویەوە، نەفسـپەزێری بخاتـە ژێر دوو پێی-نەك لەسـەر سـەری- گـەر پیاوێـك نوێـژی بـەیانی کـرد خەسـڵەتێك لـە خەسـڵەتەکانی نەفسـپەزێری لـە خۆیـدا چارەسـەر کـرد، نـەك هـەموو خەسـڵەتەکان، کەسێکی تریش بە سەنگی خۆی زێڕی بەخشی لەپێناوی خودادا بە روویەکی شیرینەوە بە خەڵکانی برسی، لای ئەهلی مەعریفە و زانست یەکەمیان خۆشبەختترە و نیعمـەت لەسەری مەزنترە و شوکر کردن لەسەری زۆرترە.

ئەی دەبـێ حـاڵی ئـەو کەسـە چـۆن بێـت کـە رۆژی لـێ دەبێتـەوە هـەموو هـەوڵ و کۆششـێکی بـۆ گرنگیـدان بـە نەفسـپەزێری تـەرخان کـردووە، بـەهۆی ئـەزموون و مەعریفەی بە نەفسپەزێری.

یەکێکی تر ڕۆژی لێ دەبێتەوە هەموو هەوڵ و کۆشش و خۆشەویستییەکی بریتییە لە ڕیشەکەند کردنی نەفسپەزێری و پابەندبوون بە تەوازوع و زەلیل کردنی نەفس و بەهۆی ئەزموونی بۆ نووری تەوازوع و ناسینی سوود و قازانجەکانی.

پیرۆزبایی لەو کەسە کە وەکو ئەو سەرقاڵی نەفسی خۆیەتی.. چەندە کارێکی بەسوود و پڕ لە قازانجە، چەندە جێگەی ڕەزامەندییە لەلای مەلیکەکەی، چەندە ئارامی و ئاسوودەیی بە دڵ دەبەخشێت!

لەو دوو پیاوە پەند و ئامۆژگاری وەربگرە کە بە بەندایەتی فەرمانیان پێ کرابوو، یەکێکیان پێیخۆش بوو نەفسی خۆی بکات بە بەندە وەك فەرمانی پێکرابوو، ئەویتریان پێیخۆش بوو نەفسی خۆی بکات بە مەلیك، کام لەم دوانە لەپێشترە بە خەڵات لەلای مەولا -عز وجل- و کامیان شایستەیە بە سزای پڕ لە ئێش؟

## ئامڕازەکانی چارەسەری نەفسپەزێری:

وتم: زۆرت باس کرد لەمەڕ فەساد و خراپەی نەفسپەزێری و زیان و شەڕەکانی، ئێستا ڕێگەی خۆپەنادان و ڕێ لێگرتنم بۆ باس بکە، نەخۆش کە دەردەکەی خۆی زانی پێیخۆشە دەواکەی بزانێت، ئەو کەسەش نەنگی نەفسی خۆی دەناسێت هەر بەو جۆرەیە، پێویستە ئەو دەوایەی نەفسی چاك دەکاتەوە بناسێت.

بۆیە وتی: ڕۆڵەی ئادەم هەوڵی دابەزینی باڵندە دەدات لە ئاسماندا و دایدەبەزێنێت، هەوڵی دەرهێنانی حوت دەدات لە قولایی دەریادا و دەریدەهێنێت.

هەوڵی ڕامهێنانی چوارپێ و ئاژەڵان و وەحشی و دڕندەکان دەدات و ڕامیان دەهێنێت.

هەوڵی دەستبردن بۆ مار و خشۆکەکان دەدات و بەکاریان دەهێنێت.

هەوڵی ناسینی ئەستێرەکانی ئاسمان و ناوەکانیان و کەشکەشانەکانیان و شوێنی هەڵهاتن و ئاوابوونیان دەدات و هەروەها هەوڵ دەدات مەنزیلەکانی خۆر و مانگ و خولگەکانیان و شوێنی هەڵهاتن و ئاوابوونیان بزانێت، هەموو ئەمانە فێربوو.

هەروەها فێری ئەوە بوو چۆن منداڵی باوك بناسێتەوە، هەموو ئەمانەی زانی چونکە هەوڵ و کۆششی بۆ کرد.

هەوڵ و کۆششی بۆ دەردی نەخۆشان و هۆکارەکانی نەخۆشی بە تەماشاکردنی میزەکەی بەبێ تەماشاکردنی کەسەکە، بۆیە دەرد و دەرمانەکەی ناسییەوە، هەموو ئەمانەی زانی و ناسی.

هەوڵیدا بۆ فێربوون و زانینی ژیان و سیرە و رەوگەی مەلیکانی پێشوو لە سەردەمانی پێشوودا، نووسی و لێکۆڵینەوەی لەسەر کرد.

هەموو ئەو هەوڵ و کۆشانە کە نەفسی خۆی بۆ تەرخان کرد بۆ ئەوە بوو دونیای زۆرتر و زیاتر بەدەست بهێنێت، هەموو ئەوانە ئەو کارە سەرەکییە نییە کە دینەکەی داوای لێکردووە.

داوای لێکرا تەنها یەك نەفس راستبکاتەوە بەو کارە هەڵنەستا، هیچ شتێك بە ئەندازەی ئەو نەفسە شەڕ و خراپە و تێکچوون رووبەڕووی ئەو ناکاتەوە.

ئەو تەنها داوای لێکرا فەسادی نەفسی خۆی چارەسەر بکات، ئەو هەڵنەستا بەو کاری چاککردنە، لە هەندێ چاککردن بێئاگا و لە هەندێکی تر ئاگادار، ئەوەی کە نایزانێت نەزانە پێی و هەوڵی زانینی نادات، ئەوەش کە لەمەڕ فەسادی نەفس دەیزانێت چاککردنەکەی تیابردووە.

هیچ کەسێك لە جێگەی کەسێکی تر داوای نوێژ و رۆژ و زەکات و حەج و دەستنوێژ و خۆشۆرینی لێ ناکرێت، هەر کەسێك بۆخۆی داوایلێکراوە، هیچ کەسێك ناتوانێت کارێك بۆ هیچ کەس بکات، کەسیش ناتوانێت لە جێگەی کەسێکی تر چاك بێت، بەڵکو چاکبوونی هەر مرۆڤێك و تەقوای هەر کەسێك پەیوەستە بە نەفسی خۆیەوە و لەناو ترازووی خۆیدا و لە ترازووی هیچ کەسێکدا شتێکی ئەم دانەنراوە.

نیەت لە کار و کردەوەکاندا هەر بەو جۆرەیە، نیەتی من قازانجێك بە کارەکەی تۆ ناگەیەنێت، هەر بەو جۆرە نیەتی تۆ قازانجێك بە کارەکەی من ناگەیەنێت گەر نیەتەکەت راست و دروست بێت، زیانیشی پێ ناگەیەنێت گەر نیەتەکەت خراپ و نەخۆش بێت، قازانج و زیان تەنها بۆ کەسی خاوەن نیەت و خاوەن کردارە، تەنها یەك نەفسە، گەر رۆیشت بە دەم داواکارییەکانی نەفسییەوە خێری نەفسی لە شەڕی پێ جیاناکرێتەوە و نازانێت کەی رووی لێ دەکات و کەس پشتی لێ دەکات.

خێر ئەنجام دەدات و نازانێت ئایا رووی لێکردووە یان پشتی تێکردووە، ئەو تەنها سەرقاڵی رووالەتی کار و بانگەشە کردنە، نازانێت چ کارێك بۆ دونیا یان دوارۆژ ئەنجام دەدات، ئەو دوو کارەی پێ جیاناکرێتەوە، هیممەتی خۆی لە کارەکەدا و خۆشەویستی بۆی و ترس لە خودا تیایدا ناپشکنێت، هەر بەو جۆرە نازانێت کەی دەوەستێت و نازانێت چۆن لە ناخی خۆی وردببێتەوە، ئەو بەشەڕ خێری تێکداوە و هەست بەخۆی ناکات.

ئەو لە رووالەتدا رووی لە خودا کردووە، بەلاّم ئەو لە ناوەوە پشتی لە خودا کردووە، ئەو لە رووالەتییدا بۆ لای خودا هەڵدێت، بەلاّم لە ناخیدا لە خودا هەڵدێت.

پاکێتی بۆ خودا! بزانە چ هەوڵ و کۆششێکی خستەگەڕ بۆ زانینی ئەوەی داوای لێ نەکرابوو، هەموو گرنگیدانی خۆی بۆ تەرخان کرد و تێگەیشتنی خۆی پێوە خەریك کرد، بەلاّم ئەوەی نایزانێت و تیایبرد بریتییە لەو شتەی کە داوای لێکراوە و لەسەری پەیمانی لێ وەرگیراوە.

شەڕ و فەساد لێی دەچنە ژوورەوە و نازانێت لە کوێوە هاتوونەتە ژوورەوە، و چۆن هاتوون و ئەوە چۆنە و چ ڕێگەیەك هەیە بۆ ڕزگاربوون لە دەستیان؟ بۆیە بە سەرگەردانی و سەرسامی دەمێنێتەوە، ئەو چارەسەری ئەوەی کرد لە هەوادا بوو، ئەوەی لە بنی دەریادا بوو، هەموو ئەوانەی زانی و گرنگی پێدان و خۆی پێوە سەرقاڵ کرد بۆ مانای ئەو دونیایەی خودا بڕیاری داوە بە ئەندازەی خۆی ڕۆزی بدات لەسەری، و بە بەڵێنی خۆی وەفادارە و بۆی دەستەبەر کردووە، جا کەسەکە رووی لێ بکات یان پشتی تێبکات.

ئەو بەسەر خەڵکیدا زاڵ بوو، نەفسی خۆشی بەسەر ئەودا زاڵ بوو، گەر گرنگی بدایە بە فەسادی نەفسی خۆی و چاککردنی، هەروەها گرنگی بدایە بە خێر و شەڕی ئەو نەفسە، و بترسابایە لە تیاچوونی، وەك گرنگیدا بە ناسینی ئەوانەی باسمان کرد لە کار و باری دونیای دەستەبەرکراو بۆی، ئەو کات فەساد و خراپەی نەفس و باش و چاکەی پێ جیادەکرایەوە، وەك چۆن شتە دونیاییەکانی زانی، هەروەك چۆن لە شتە دنیاییەکاندا بەشی خۆی بەدەستهێنا لەمەشدا بە هەمان شێوە دەبوو، بەلاّم رازی بوو ڕێگەی ئایین بە نەزانی بگرێتە بەر، رازی نەبوو ڕێگەی دونیا بەبێ زانست و بەصیرەت بگرێتە بەر، هەر کات بتەوێت لەسەر ڕێگەی دونیا دەیبینییەوە، لەگەڵ ئەوەش ئەو پێیوایە لەسەر ڕێگەی دوارۆژە.

لەگەڵ ئەوەش هەندێ لەوانەی پشتیان لە خودا کردووە و لە خودا دووردەکەونەوە ناوی خۆیان ناوە "**زانا**"، خۆیان کردووە بە ئاماژە و ڕێنیشاندەر بۆ لای خودا، بەڵام ئەوان سەرگەردانانن و وانیشان دەدەن ڕێنیشاندەرن، ڕێگەیان گرتۆتە بەر دونیایە شك و گومان و نەزانینیان تێدایە، خەڵکی نەزان وا دەزانن ئەوانە ڕێنیشاندەرن، بەڵام کوێر و سەرگەردانن، "**إنا لله وإنا إليه راجعون**".

بزانە، نەفسپەزێری و نمایشی نەفسپەزێری نادیارێك نییە ڕووت لێ بکات، و تۆش بتەوێت خۆتی لێ لابدەیت، و ڕێگەی لێ ببڕیتەوە، بەڵکو شتێکە لە تۆدا نیشتەجێ بووە، و دابەزیوەتەماڵەکەت و دەستی بەسەریدا گرتووە، لەسەرو مەجلیسی دیوەخانەوە مەجلیسی گرتۆتە دەست، خێرت لێ وەردەگرێت، بەسەر خێرترین شوێنی ماڵەکەتدا زاڵ بووە، شانی داداوە و چۆنی بوێت هاوکارەکانی خۆی-بەو جۆرەی ئارەزووی داوا بکات- لە ڕووتێکردن و پشتتێکردندا بەکاردەهێنێت.

هەوڵنادەم دەوا و چارەسەری لقەکانت بۆ باس بکەم و زۆر بکەوێت لەسەرت و بەهۆیانەوە شەکەت ببیت و پشتهەڵبکەیت، بەڵکو ئەسڵێکت پێ نیشان دەدەم گەر چارەسەری بکەیت بەسەر هەموو لقەکاندا بلاو دەبێتەوە، ئەوەش بریتییە لە: بێهیوابوون لە هەموو خەڵکی بەوەی زیانت پێ بگەیەنن یان سوود و قازانجت بۆ دەستەبەر بکەن، پێت ببەخشن یان لێت بگرنەوە، بتژیەنن یان بتمرێنن، دڵت بەمەمەوە پەیوەست بکە، چونکە ئەمە دایکی هەموو ئەسڵەکانە، و لوتکە و ترۆپکی کاروبارەکانە.

گەر موریدێکی راستگۆ بیت و پێتخۆش بێت لە سەرئەنجامی کار و بارەکان وردببییەوە، ئەوا دەروازەی تەماع بەڕووی نەفسی خۆتدا دابخە، و دەرگای بێهیوابوونی بە روودا بکەرەوە، بۆ ئەو کارەش هەموو ویست و لێبڕانی خۆت بەگەڕ بخە، و خۆتی بۆ یەکلا بکەرەوە، وەك ئەو کەسەی کە لە هەموو دونیا تەنها یەك پێویستی هەبێت.

بە سووربوون و لێبڕانێکی دروستەوە دەست پێ بکە، بەوەی نەفست لەم بڕەی تەمەن کە ماوە بە خودا ببەخشیت، گەر وادەزانیت ئەهلی ئەو مەیدانەی، پاکێتی و شکۆمەندی بۆ خودا، چەندە بێنیازە لە ئەهلی ئاسمانەکان و زەوی، چەندە ئەوان بە خودا ئاتاج و هەژارن؟!

ئەی برای خۆم، خۆت وەك بەندەیەکی ئەسیر بێنە پێش چاو لەناو ئەهلی سەردەمدا، رۆژەکانی تەمەنت لە رازیبوونی خودا -**عز وجل**- و رزگاربوون لە بەلای نەفسپەزێری بەکاربهێنە، کەسی ئەسیر دەکرێت بە کۆیلە و خاوەنی هیچ شتێك نییە و تەماعی نییە ستەم لە هیچ کەسێك بکات، کە ستەمی لێ دەکرێت لەلایەن ستەمکارێکەوە هانا و پەنا بۆ هیچ یەکێك لە مرۆڤەکان نابات، پاشان شیرینی یادی خودا و چێژی موناجات لە عیبادەتەکاندا دەبینییەوە.

بۆیە پێم وتی: دەرهێنانی نەفسپەزێری و بڕینی لە دڵت بە بێهیوابوون لە خەڵکی، چونکە دەتگێڕێتەوە بۆ لای خودا، گەڕانەوەت بۆ لای خودا ئارامگرتنی دڵتە لەسەر خودا، ئارامی دڵیش لەسەر خودا گوێڕایەڵی زۆرتر بۆ خودا و گەیشتن بە تایبەتمەندی عیبادەت کردنی بەدوای خۆیدا دەهێنێت، گەیشتن بە تایبەتمەندی عیبادەت کردنی خودا مەنزیلەی بەندەبوون بە کەسەکە دەبەخشێت، گەیشتن بە مەنزیلەی بەندایەتی شەرەف و گەورەیی بەندایەتی بەدەست دەهێنیت، گەیشتن بە شەرەفی بەندایەتی دڵ

گەردنکەچی خودا دەکات، بۆیە بە گوێڕایەڵی گەورەیی پێ بەخشیت و تۆش بۆی گەردنکەچ بوویت، بۆیە بەو بەندایەتییە ڕێز و شەرەفی بە تۆ بەخشی، خودا -**عز وجل**- دەفەرموێت: ﴿ **وَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ** ﴾ المنافقون: ٨، دەربارەی عیززەتی زەمکراویش دەفەرموێت: ﴿ **كَذَٰلِكَ يَطۡبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلۡبِ مُتَكَبِّرٖ جَبَّارٖ ٣٥** ﴾ غافر: ٣٥

## چۆن لە نێوان ئەو دوو نەفسپەزێریدا جیاکاری دەکرێت؟

وتی: ئەوەیان کە زەمکراوە لە گوێڕایەڵی کردنی خودا دوورت دەخاتەوە، بەڵام ئەوەیان کە پەسەندە گەردنکەچیت لە گوێڕایەڵی کردنی خودادا بۆ زیاد دەکات.

بزانە، هەر کارێك گەیشتە تەنگەلانی بەرین و والا دەبێت، ئەو کارە تەنها بڕینی تەماع و بەکارهێنانی بێهیوابوونە لە خەڵکی، گەر تۆ گەیشتییە دۆڵی ئارامی و ئاسوودەیی و دڵخۆشی و لەگەڵ ئەهلی ئەم پلە و پایانەدا تام و چێژت وەرگرت بە یادی خودا و چێژ لە شیرینی موناجات و گریان لە ترسی خودا، ئەوا تۆ شیرینی یەقین و دڵخۆشی ڕازیبوون و ئاسوودەیی ڕادەستکردن و سووکی کۆڵ و بارت چەشتووە، پاشان لەوانە ورد دەبییەوە کە ئازار دەخۆن و لەناو مەملەکەتی نەفسپەزێری و موڵکی نەفسدا دەسوڕێنەوە.

ئەو کات پیرۆزت بێت، ڕۆژت لێ دەبێتەوە و ئێوارەت لێ دێت هەرچی خەم و پەژارە و دڵتەنگییە لە تۆدا بوونی نییە، مەگەر تەنها ئەوەندەی کە بۆ کار و باری دوارۆژت ڕووی لێ دەکەیت، خودا تەماشای هیممەت و ویست و هەوڵ و کۆششی تۆ دەکات لە دۆڵێك و خەڵکیش لە دۆڵێکی تر.

# خێر و شەڕ



## فیقهی ئەزموون و گرنگیدان بە نەفس:

بزانە، هەر کەس گرنگیدانی بە نەفسی خۆی پشتگوێ خست، بەڵام تێگەیشتنی ئەزموونی پێدرا گەیشتۆتە ناسینی خێر و شەڕ و دەزانێت لە کوێ و چۆن، دەردەبڕێت و وەسف دەکات و تێدەگات و دانایی بەکاردەهێنێت و بە حیکمەت قسە دەکات، ئەوەی لە ئامۆژگاری دەیبیستێت زیادەیەکە لەسەر وەسف و تێگەیشتن و ناسین و وردەکارییەکانی دانایی ئەو و نهێنی پێویستییەکانی.

هەر کەسێکیش لە ئەهلی گرنگی پێدان بوو و ئەزموونی پێ نەبەخشرا بەپێی گرنگیدانەکەی مەعریفەی خێر و شەڕی بۆ دروست دەبێت، لە سیفەت و دەربڕینی ئەزموونەکەیەوە وەسف دەکات، هەروەها لە کوێ و چۆن، بەڵام لاوازە لە گۆکردن بە حیکمەت، بۆیە ئامۆژگاری زیادەیەکە بۆ مەعریفەی خێر و شەڕی.

هەر کەس تێگەیشتنی پێ نەدرا و گرنگی پێدانیشی نەبوو، ئەو کەسە بە زمانی خۆی قسە ناکات و بەدڵ هیچ ناژنەوێت لە کاتی قسەکردندا.

**ریوایەت کراوە حیکمەت دەڵێت:** هەر کەس داوام بکات و پێم نەگات با کاربکات بە باشترینی ئەوەی دەیزانێت و دەستبەرداری خراپترینی ئەوە ببێت کە دەیزانێت.

## حیکمەت و پشکنین:

هەروەها وتی: سوودی کارەکان جۆراوجۆرە، و زیانەکانیان بە هەمان شێوە، سوود و قازانجی هەندێکیان لە هەندێکی تریان زۆرترە، هەر بەو جۆرە زیانی هەندێکیان لە هەندێکیان گەورەترە، زۆربەی خەڵکی گرنگیدانیان بە چاککردنی شتێکە کە کەمترین زیانی هەیە، ئەوان بە چاککردنی ئەوەوە سەرقاڵ بوون و بێئاگابوون لەوەی زۆرترین زیانیان پێ دەگەیەنێت، هەروەها داوایان بە دوای ئەوەی کەمترین سوود و قازانجی هەیە زۆرتر و زیاترە لە داوای ئەوەی زۆرترین سوود و قازانجی هەیە.

وازهێنان لە هەندێ کار سەختتر و دژوارترە لەسەر بەندە لە هەندێکی تریانن، خاوەن ویست و لێبڕان نابێت لەمەدا هەڵە بکات، بەڵکو هەموو کار و بارەکانی بە توندترین شێوە دەپشکنێت، گرنگییەکی زۆریان پێدەدات و دەچێتە ناو قوڵایی تێگەیشتن و وردەکارییەکانی لەتیفەکانی دانایی، تا بزانێت کامەیان لە هەموان زیاتر لەسەری گرانە، هەروەها بزانێت کامەیان لە هەموان زیاتر بۆ ئەو سەلامەتە، و قازانجی زیاترە، ئەو کات هەموو هەوڵ و سووربوونی خۆی و مەعریفە و زانستی خۆی و تێگەیشتن و زیرەکی خۆی، گرنگی پێدان و دانایی خۆی دەخاتە خزمەت ئەوەیانەوە کە قورسترینیانە بۆ وازلێهێنان و زۆرترین زیانی پێ دەگەیەنێت.

خەڵکی لەوەدا جیاوازی لە نێوانیاندا هەیەن لەوانەیە کەسێك وازهێنان لە شتێك لەلای ئاسان بێت، بەڵام لەسەر کەسێکی تر سەخت و گران بێت، یان وازهێنان لە شتێك لەلای سەخت و گران بێت، بەڵام لەلای کەسێکی تر سووك و ئاسان بێت، داوای شتێك لەلای سووك و ئاسان بێت، چونکە کۆمەڵێك شتی لەلا خۆشەویست کراوە

لەلای کەسەکەی تر خۆشەویست نەکراوە، هەر بەو جۆرە شتگەلێك لەلای جێگەی خۆشەویستکراوە کە لەلای کەسەکەی تر خۆشەویست نەکراوە، یان شتگەلێك لەلای بێزراوکراوە کە لەلای کەسانی تر بەو جۆرە نییە.

لەوانەیە هەردوو کارەکە زیانبەخش بن و یەکێکیان زیانەکەی لەویتر زۆرتر بێت، تێچوونی وازلێهێنانی لەسەر خاوەنەکەی سەختتر نەبێت لەوی تریان، بەڵام بوونی مەعریفەیە وا لە بەندە دەکات بەجوانی دەستی بۆ نەبات و تیایدا نەرمونیان نەبێت، بۆیە روو لەوە دەکات کە وازهێنانی لەسەری سەختتر و دژوارترە، ئەوەیان کەمترین زیانی هەیە تیایدا بەهێزترە بۆ وازلێهێنانی لەوەیان کە زیانەکەی گەورەترە، و وازهێنان لێی لای ئاسانترە، لەگەڵ ئەوەش ئەو لە وازهێنان لێی لاوازترین و دەستەوسانترینە.

هیچ کەس ئەمە نازانێت مەگەر کەسێك کارەکان تاوتوێ بکات و لێیان وردببێتەوە و بیان پشکنێت، سەرنج بدات بۆ روو لەمەیان دەکات و هۆیەکەی چییە؟ پاشان لەسەر نەفسی خۆی وازهێنان لەو هۆیە بە گران تەماشا نەکات، و بەخۆی بڵێت: واز لەمە ناهێنم، بەڵام ئەوە واز لێ دەهێنم کە وازهێنانی لەسەر نەفسم سەخت و گران و دژوارە، خراپەی ئەوەی سوورە لەسەر وازهێنانی و بڕیاری وازلێهێنانی داوە-کە لەسەر نەفسی سەخت و گرانە- هیچی کەمتر نییە لە خراپەی ئەو شتەی سوور نییە لەسەر وازلێهێنان و دوورکەوتنەوە لێی.

۞ ۞ ۞

# بێئاگایی و بێداری



## تایبەتمەندییەکانی بێئاگایی و بێداری:

وتم: چی وا لە تایبەتان و خەڵکی بەگشتی دەکات خاو و هێواش بن لە دەستبردن بۆ شتێك کە زۆرترین زیانی هەیە و گرانترینە لەسەر نەفسیان؟

وتی: من پێم وتی خەڵکی تیایدا جیاوازن، لەوانەیە شتێك لە شتێکی تر سەلامەتتر بێت، لەوانەیە شتێك لە شتێکی تر لەسەریان زیانبەخشتر بێت.

هیچ خەسڵەتێکم نەبینیوە زۆرتر بێت لە خەڵکیدا و زاڵتر بێت بە سەریاندا و زۆرتر زیانیان پێ بگەیەنێت و سەختتر بێت لەسەریان بۆ وازلێهێنان لە بێئاگایی، بێئاگایی لەناو تایبەتان و خەڵکی بەگشی و زانا و نەزاندا.

خراپترین بێئاگایی ئەو بێئاگاییەیە کە لێی بێئاگایت و نایزانیت و نایناسییەوە.

سەختترین بێئاگایی لەسەر خەڵکی و ئەوەی کە زۆر جێگەی سەرسوڕمانی منە بە خەڵکی بریتییە لە: خۆپەسەندی.

سەرنج بدە.. ئایا کەسێك دەبینییەوە خۆی بە نەزان بزانێت لە ئەمری دونیا و دوارۆژدا؟

سەرنج بدە، چۆن خەڵکی روو لەو شتانە دەکەن کە نایزانن، پیشەی خۆی نییە و دەڵێت: من بەو کارە زانام، کەسی نەزانی فریوخواردوو کە بانگەشەی زانستی دوارۆژ دەکات قەدر و رێزی دوارۆژ و حەرامەکانی خودا -**عز وجل**- لە دڵیدا کەم و لاوازە.

سەرنج بدە.. ئایا کەسێك لەلای ئەم کەسە بێئاگـا و فریوخـواردوو و نەزانـە بـوونی هەیە بەرزتر و بالاتر و زاناتر بێت لە نەفسی خۆی؟ مەگەر لە قولایی نەفسـیدا دانـی پێدا بنێت لەبارێکدا کە هیچ چارەیەکی نییە و هیچ رێگەیەکی لەبەردەمـدا نـەماوە و ناتوانێت دان پیادانانەکەی پالپێوە بنێت.

## بێئاگایی و بێداری:

وتم: چ شتێك دەخوازیت بۆ ئەوان باشتر و سوودبەخشتر بێت؟

وتی: بێداربوونـەوە ئەسـڵی هـەموو خێرێکـە، وەك چـۆن بێئاگـایی ئەسـڵی هـەموو شەڕێکە، زۆرن ئەوانەی خۆیان بە بێدار و بەئاگا دادەنێن و بەلام کەسانێکی بێئاگـان، ئەو بێئاگایی لە بێداربوونەوە لا شیرینترە و لەگەڵ بێئاگاییدا هۆگری هەیە.

**بزانە رۆشنترین نیشانەکانی بێداربوونـەوە بریتییـە لـە:** خـەم و دڵتـەنگی، پاشـان ئامادەباشی دروست و جوان بۆ ئەوەی کردوویەتی بە خەمی خۆی و دڵی داگیر کردووە.

**رۆشنترین نیشانەکانی بێئاگایش بریتییە لە:** لەخۆدەرچوون و زیادەڕەوی و خۆشی و رابواردنی پڕ لە بێئاگایی، هەموو ئەمانـە بـەئاگایی و بێـداری لـەبیر دەبەنـەوە، ئـەو کەسەی بێداربوونەوە واز لێ دەهێنێت خۆئامادەکردن بۆ سـەفەری دوای مـردن وازلـێ دەهێنێت.

وتم کەوابوو: بێداربوونەوە و بێئاگایی چییە؟

وتی: بێداربوونەوە بریتییە لە نزیکردنەوەی کاتی مردن و چاودێری مردن و بیرکردنەوە لەوەی بەندە رووبەڕووی دەبێتەوە لە دوای مردن، ئەمە دەرگای کارکردن بە روودا والا

دەكات، رووی لێ دەكەیت بەر لەوەی مردن رووت لێ بكات، یەك بەیەكی ساتەكانی تەمەنت دەست بەسەردا دەگری بەر لە كۆتاهاتنی تەمەن و رووتێكردنی ئەجەل.

گەر بەندە بەردەوامی لەسەر ئەمە پێ بەخشرا لەمەوە كانیاوی خێر دەتەقێ گەر خودا -**عز وجل**- بیەوێت.

**بێئاگاییش بریتییە** لە هیوا و ئاواتی دووردرێژ لە دونیادا و لەبیرچوونەوەی یادی گەڕانەوە بۆ لای خودا مەگەر بە ختوورە و خەیاڵێك كە بەندە لەسەری بەردەوام نابێت.

گەر بەندە بەردەوام بێت لەم بێئاگاییە هەموو خێرەكان هەڵدەدات بۆ پشتەوە و لەوێوە دواخستن(**التسويف**) و كەوتنە ناو گوناه و تاوان لەدایك دەبێت.

## هێزی بێداربوونەوە و وازهێنان لە بێئاگایی لە چیدایە؟

وتم: ئایا شتێك هەیە لەسەر بێداربوونەوە و وازهێنان لە بێئاگایی بەهێزم بكات؟

وتی: بەڵێ.. ئیخلاص لە دوعادا و هاوڕێیەتی ئەوانەی كە ئەوەیان دەوێت تۆ دەتەوێت و دووركەوتنەوە لەو كەسانەی ئەوەیان ناوێت تۆ دەتەوێت، هاوەڵی كەسانێك كە ئەوەیان ناوێت تۆ دەتەوێت زیانت پێ دەگەیەنێت و هەست بە خۆت ناكەیت، هاوەڵی ئەو كەسانەش كە ئەوەیان دەوێت تۆ دەتەوێ قازانجت پێ دەگەیەنێ و بە خۆت نازانی.

خەڵكی لە سێ شتەوە روویان لێ دەكرێت و زیانیان پێ دەگەیەنرێت: بێئاگایی و زاڵبوونی حەز و نەزانی..

لەوانەیە یەكێك هەر سێ خەسڵەتەكەی تێدا كۆ ببێتەوە، گەر بڵێیت: من نازانم كێ لەو سیانە بەپاك تەماشا بكەم، تۆ لە ریزی راستگۆیانیت.

- لەو کەسانەبە بلاۆوە پێکردنی خێریان پێخۆشە، و خەڵکیش لەسەر خێر ئەویان خۆشدەوێت، لەوانە مەبە حەز دەکەن بەهۆی کارە چاکەکانیانەوە خەڵکی خۆشیان گەرەکبێ.

- هەر شتێك قازانج و ئاسوودەییەکی تێدا نەبوو نیەتی ئەنجامدانیت نەبێت، هەر شتێکیش سوود و ئاسوودەیی تێدا بێت تەنها لە ڕێگەی نیەتەوە دروست و شیاوە.

- سەرمسوڕدەمێنیٚ لەو کەسانەی لە چاکەکانیاندا نیەتی لاوازیان هەیە، بەلاٚم لە حەزەکانیاندا نیەتی دروست و تەواویان هەیە، ئەو حاڵەتەش تەنها بۆ کەسانێکە فریویان خواردووە و چاوبەستیان لێکراوە، یان بۆخۆیان فریودەر و چاوبەستکەرن.

هەروەها وتی: دوو خەسڵەت هەیە هەر کەس ڕاستی بکاتەوە هەموو کاروبارەکانی دێنە ڕاستە، هەر کەس: بۆچی و لەبەرچی؟ ڕاست بکاتەوە، بڵێت: بۆچی ئەو کارەم نەکرد؟ لەبەرچی ئەو کارەم ئەنجامدا؟ بۆچی ئەنجامی نادەم؟ هەر کەس ئەمەی لەدەست بچێت و پێی نەزانێت ئەوا بەپێی ئەوە نەزان و بێئاگایە.

هەروەها وتی: لە ئەخلاقی خۆتدا هەشت خەسڵەت هەیە لێیان کەنارگیر بە: زۆر لەخۆکردن لە قسە و کرداردا، ڕووپامایی(ڕیاکردن)، دابەزین لە بنەماکانی ئیمان بۆ ڕازیکردنی بەرانبەر، تاوان، غەشکردن، فێڵکردن، شۆخیکردنی بێجیٚ، کینە.

هەروەها وتی: بێئاگایی لەوە خودا لای ناپەسەندە دڵڕەقییە، دڵڕەقی شیرینی لە کار و کردەوەکاندا هەڵدەگرێت، لە ڕۆیشتنی شیرینی ناو کار و کردەوەکات گوێڕایەڵی بۆ خودا کەم دەبێتەوە، لە کەمی گوێڕایەڵییەوە کەمی شوکر سەرهەڵدەدات، لە وازهێنان لە شوکر ئەوەی ئەنجامت داوە خراپ دەبێت و ئەوەی بەدوایدا دەگەڕێیت لێی مەحروم دەبیت، و نیعمەتی زۆرتر کۆتایی پیٚ دێت.

هەروەها وتی: تۆ لـە سـەردەمێکدای سـەلامەتترین کـەس ئـەو کەسـەیە برسـییە و نامۆبوونی لە خەڵکی هەیە، و دڵی پڕ لە تەنگی و خەم و پەژارەیە.

هـەروەها وتـی: برسـێتی نـەفس دەشـکێنێت.. تیـری پێڕاکێشـان و سـنووربەزێنی بەدوادا دێت، لە برسێتیدا هێز لەسەر هیممەت و دڵتەنگی کۆدەبێتەوە، لە هیممەت و دڵتەنگیشدا هێز لەسەر برسێتی کۆدەبێتەوە، هیممەت و دڵتـەنگیش حـەز و ئـارەزوو کۆتا پێ دەهێنن.

هەروەها وتی: مرۆڤ حەزی لە خـاوی و سـاردبوونەوەیە و ئـالوودەی دەسـتدرێژییە و عەودالّی دواخستنە، لەسەر شەکەتی و لەبیرچوونەوە بارهاتووە، ئەو بە نەبوونی ویست و لێبڕان و سووربوون وەسف کراوە، لەسەر هیوا و خۆزگە و ئاوات نەقشی گرتووە، بـە نائارامی لە کاتی تەنگانەدا، و بە کـەمی شـوکر لـە کـاتی نیعمەتـدا وەسـف کـراوە، حەزی بە خۆخەڵەتان و خۆفریودانە.

هەروەها وتی: زانستت بە نەنگی خۆت و نەنگی کەسانی تر بەرانبەرن، هـەر کـەس نەنگی کەسانی تر نەناسێت نەنگی نەفسی خۆی دەناسێتەوە، گەر هەندێك لە نـەنگی خـەڵکیت بـۆ دەرکـەوت و هەنـدێك لـە نـەنگی خۆتـت لێشـارایەوە، ئـەوا نـەنگی ئاشکرابووی خەڵکی بکە بە بەڵگەی نەنگییەکانی خۆت، گـەر لـە نـەنگی خۆتـت بـۆ دەرکەوت کە لە نموونەی ئەوانە لە نەنگی خەڵکی نەتدەبینییـەوە ئـەوا پێشـبینی ئـەو نەنگیانـە مەکـە لـە خەڵکیدایـە، تـا ئـەوەی لـە خۆتـدا دەرکـەوتووە لـە خەڵکیشـدا دەردەکەوێت، چاودێری نەفست بکـە، و بیپشـکنە و رایوەسـتێنە، و دادگـایی بکـە و لەسەر ئەوەی پێویستە ئەنجامی بدات بە توندی بیگرە، ئەو داوایـە تـەنها لـە نەفسـی خۆت بکە و رووبەڕووی کەسانی تری مەکەرەوە.

گەر شتێکت لە کەسانی تر بۆ دەرکەوت ئەوا پاساو و بیانووی بۆ بهێنەرەوە، بەڵام بۆ نەفسی خۆت هیچ پاساو و بیانوویەك مەهێنەرەوە، گەر پاساوی هێنایەوە لێی قبووڵ مەکە.



## ئیخلاص و ریا



**هەروەها وتی: هەرچی کاری چاکەیە دوو رووی هەیە:** نهێنی و ئاشکرا، هەر کەس نەتوانێت نهێنی و پەنهان لەو کارانەی ئەنجامیان دەدات راست بکاتەوە ئەوا لە راستکردنەوەی کار و کردەوە ئاشکراکانی دوورترە.. هەر کەسیش توانی لە ئاشکرادا کارەکانی راست بکاتەوە ئەوا لە کارە پەنهانەکانیدا بەهێزترە.

هەر بەو جۆرە لە کەم و لە زۆردا، هەر کەس نەتوانێت نیەتی خۆی لە کەمی کاردا راست بکاتەوە لە زۆرەکەیدا دوورترە.

هەروەها وتی: ریا دوو رووی هەیە: کەسێك کۆمەڵێك کاری چاکە ئەنجام دەدات، بەوەش مەدح و سەنا و پلە و پایە و رێز و حورمەت بەدەست دەهێنێت، لەگەڵ ئەوەش دەیەوێت ئەو کارانەی رووی لێ دەکەن ئیخلاصیان تێدا ئەنجام بدات، هەر کەس نەتوانێ لەو کارانەی رووی لێ دەکەن ریا واز لێ بهێنێت، ئەوا ئەوەی ئەنجامیداوە و بەهۆیەوە پلە و پایە و رێز و قەدری بەدەستهێناوە لە خەڵکییەوە لە ئیخلاصەوە دووررە.

هەر بەو جۆرە لە هەموو شتێکدا.. وازهێنان لەوەی تۆ خاوەنی نیت ئاسانترە لە وازهێنان لەوەی تۆ خاوەنیتی.

## نیەت لە نێوان صدق و بێئاگاییدا:

وتم: کێ لە هەموو کەس زیاتر شایستەیە بە صدق لە نیەتدا؟

وتی: ئەو کەسەیان لە هەمووان زیاتر خۆشەویستی بۆ خودا هەیە.

وتم: کێ دوورترین کەسە لە نیەتی باشەوە؟

وتی: زاهیدترینیان لە نێتی باش.. زاهیدترین زاهیدیان لە نیەتی باش ئەو کەسەیانە کە لە هەمووان زیاتر نیەت لەبیر دەبەنەوە، و نەزانترینیانە بە نیەتی باش.

هەروەها وتی: یەکەمین نیشانە لە نیشانەکانی ریا بریتییە لە: رازیبوونی کەسێك بە نەزانی صدقی نیەت لە کاروکردەوەکانیدا.. یەکەمین نیشانەش لە نیشانەکانی صدقی نیەت بریتییە لە: گرنگیدانی بە ناسینی صدقی نیەت و ئیخلاص لە کاردا.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((کار بریتییە لە نیەت))، هەروەها دەفەرموێت: ((خراپترین شتێك کە لێی دەترسم بۆ ئێوە بریتییە لە حەزی شاراوە))[١]

بۆ دەبێ بەندەیەك فێری ئەوە ببێت چۆن کار دەکات و شان بداتە ژێر ئەرك و کۆڵی کارکردن و بەوەی دەیزانێت کار بکات و بەڵام نەزانێت چۆن نیەت دەهێنێت، ئەوەندە لە زانست فێر دەبێت کاری پێ بکات و ئەوەش فێر دەبێت کە دەبێ کاری پێ نەکات، بەڵام فێری صدق لە نیەتدا نابێت، نە لەوەی کاری پێ دەکات و نە لەوەی کاری پێ ناکات.

چەندە بژی ئەژی و کەی مردن هات دەمرێت، بەڵام لای بەلای ئەمەدا نەکردۆتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) و ئەوانەی دوای ئەو لە ئیمامان و ئەهلی زانست و مەعریفە لە ریا ئاگاداریان کردووینەتەوە، هەتا هەندێکیان دەفەرموون: دەچمە ژوورێکی تاریکەوە دوو رکات نوێژی تێدا دەکەم بەڵکو لە ریا رزگارم ببێت، **"الثوري"** دەفەرموێت: (متمانەم بە کارێك نییە خەڵکی بیبینێت).

---

[١] أخرجه الإمام أحمد في مسنده.

گەر نموونەی قسەکانی ئەوان لەم بارەیەوە بنووسین پێویستمان بە چەندین کتێبە.

ئەوەی شتێکی لە ریا زانیوە کەسانی تر نەیانزانیوە، گرنگی پێداوە و شەو و رۆژی بۆ تەرخان کردووە، لەوانەیە ئەوەی تیایدا فریودەخوات و شکست دەهێنێت زۆرتر بێت لەوەی تیایدا دەگاتە ئەوەی دەیەوێت، ئەی دەبێ حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت کە نەزانە بە ریا و پشتی لە زانینی کردووە؟

لەوانەیە کەسێك کارێك ئەنجام بدات و وابزانێت ئەو لەو کارەدا کەسێکی راستگۆیە، راستگۆیی و بانگەشەی راستگۆییەکەی بۆ دەرناکەوێت پاش دە ساڵ نەبێت، گەر دەتەوێ بڵێ پەنجا ساڵ، دە و پەنجا و سەد و هەموو بۆ ئەو یەکێکە.

وتم: وەکو چ شتێك، تۆ قسەیەکی زۆر گەورەت کردووە؟

وتی: وەك ئەو کەسەی صەدەقە بە کەسێك دەکات، یان چاکەیەکی لەگەڵ ئەنجام دەدات، وا بانگەشە دەکات ئەو کارەی لە پێناوی خودایە، و پاداشت و شوکرکردنی خەڵکی ناوێت، دواتر بۆ ئەو و بۆ کەسانی تر چاکەیەك دێتە پێشەوە لەگەڵ کەسێکی تر ئەنجامی بدەن، بەڵام چاکەکەی بۆ جێبەجێ ناکات، صەدەقە و چاکەکەی خۆی لەگەڵ کەسی یەکەم دێتەوە یاد، بۆیە پێویستییەکەی ئەویش جێبەجێ دەکات، لەو کاتە صدقی لە درۆی جیادەبێتەوە و لای رۆشن دەبێتەوە، لەوانەیە دوای سەردەمێك لە چاکەکەی ئەو راستییەی بۆ دەربکەوێت.

یان پیاوێك خاوەنی عیبادەتی پەنجا ساڵە و پێیوایە ئەو لەو کارەیدا کەسێکی راستگۆیە، مەبەست و مەرامی پاداشت و شوکری خەڵکی نییە لە نهێنی و ئاشکرایدا، لەناکاو نوێنەرێك دێت و ناوی ئەو ساڵح و پیاو چاکانە دەنووسێت کە لە

ناوچەکەی ئەودان، بەڵام ناوی ئەویان تێدا نەنووسی، یان دواین کەس بوو کە ناویان نووسی، کەسانێکی تریان پێش ئەو خست کە لە عیبادەتدا وەکو ئەو نەبوون، ئەویش ئەوەی لە نەفسی خۆی لاناپەسەند بوو، و پێیناخۆش بوو کە لە یەکەمدا دایان نەناوە، لەو کاتەدا راستگۆیی و درۆزی ئەو کەسە لە عیبادەتەکەیدا دەردەکەوێت، گەر کەسێکی راستگۆ بوایە هیچ لە نەفسیدا سەریهەڵنەدەدا، و ئەوەی بە ناپەسەند نەدەبینی کە بەرانبەر بە ئەو ئەنجامدراوە، بەڵکو بە نیعمەتێکی گەورەی خودای دەزانی، لەم هەڵوێستە و هاوشێوەی ئەم هەڵوێستە دەردەکەوێت کە لە کارەکەیدا پاداشت و شوکری لە خەڵکی ویستووە.

هەر کارێك خاوەنەکەی لێی ئاگادار نەبێت و لێی ورد نەبێتەوە و نەیپشکنێت ئەوا ئەو کارە تێکەڵەیەکە لە ئیخلاص و ریا، کاری تێکەڵیش تەنها لە کاتی بەلا و ناخۆشیدا روون دەبێتەوە، خەڵکی بە ئەندازەی زانین و نەزانینیان بەوەی بۆ ئەوانە و لەسەر ئەوانە دادگایی دەکرێن، هەروەها بە ئەندازەی ئەوەی فەرمانیان پێکراوە و نەهییان لێکراوە.



# زانستەکانی رزگاربوون



## کۆی ئەوەی پێویستە لە زانست:

**سێ دەروازە لە زانست پێویستە خەڵکی شاراوە و ئاشکرایان بزانن:** دوو دەروازەیان لە نێوان ئەوان و خودادایە -**سبحانه وتعالی**- دەروازەیەکیش لە نێوان ئەوان و خەڵکیدایە.

ئەوەی لە نێوان ئەوان و خەڵکیدایە بریتییە لە نەصیحەت، بەپێی ئەو فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ): ((ئایین بریتییە لە نەصیحەت))[١] لەوەی لە شتان شاراوە و ئاشکرا و کەم و زۆرە بۆ نزیك و دوور و دوژمن و دۆست.

ئەوەش کە لە نێوان ئەوان و خودادایە: دەروازەی نیەت و راستکردنەوەی، هەروەها ویست لە کاروکردەوەکاندا، لەوەی شاراوەتەوە لەوەی ئاشکرایە، بەپێی فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ): ((کار و کردەوەکان بە نیەتن))

دەروازەی دووەم: کەسەکە خۆی بناسێت.

## راستەقینەی نەصیحەت:

دەروازەی نەصیحەت: دەبێتە نیەت و رەوشت و رەوگەی لە نهێنی و ئاشکرادا: گەر هەموو کار و بارەکانی ئوممەت بە ناخ و پەنهانی ئەوەدا گوزەر بکات پێیخۆشە هەر

---

[١] أخرجه مسلم.

هەموو کاروبارەکانی لەسەر خێر و چاکە و هیدایەت بێت و لە گوێڕایەڵی خودادا بێت، لە هەر یەکێك لەوانەدا بەشی خۆی هەیە لە حەق و عەدل.

گەر ئەمە رەوشتی بێت لە تایبەتەکانی و نیەتی بەم جۆرە بێت لە گشتییەکانیدا رجام وایە ئەو کەسە لەناو هەموو کارێکی بالاّ و نیعمەتێکی مەزندا بێت کە تەنها خودا دەزانێت چەندن.

گەر رەوشتی تایبەتی و گشتی ئەو کەسە پێچەوانەی ئەم وەسفە بوو، ئەوا هیچ بەشێکی لە ئامۆژگاری تایبەت و ئامۆژگاری گشتی بۆ نییە، و ئەوەی بانگەشەی دەکات گوایە لە پەنهان و نهێنی خۆیدا ئامۆژگاری تایبەتی و گشتی هەڵگرتووە و حەشاریداوە رەدکراوەیە و لێی وەرناگیرێت.

لە دەروازەکانی زانست هیچ فەرموودەیەك نابینین کۆکەرەوەتر بێت لەم فەرموودەیە، ئەوەش فەرموودەکەی پێغەمبەرە (ﷺ): ((ئایین بریتییە لە نەصیحەت))، هیچ شتێك نییە بە ئەندازەی ئەم فەرموودە نزیکتر و راستتر بێت بە مەبەست و مەرام و باشتر بێت لە هەموو کار و کردەوەی خێر و چاکەیەك، هەروەها رێگەیەك نییە بە ئەندازەی رێگەی ئەم فەرموودەیە باشتر بێت بۆ شوێنکەوتن و دەستپێوەگرتنی رەوگەی چاکان، ئەم فەرموودە حەق و عەدلی لەئامێز گرتووە، رازیبوونی تایبەتان و خەڵکی بە گشتی بەدەستهێناوە، ئەوەش: ئەوەی بۆ خۆت پێتخۆشە بۆ خەڵکیش پێتخۆش بێت، هەروەها ئەوەی بۆ خۆت لات ناپەسەندە بۆ خەڵکیش لات ناپەسەند بێت.

نەصیحەت لە بنەڕەتدا لە کارەکانی دڵە و لقەکانی لە کاری ئەندامەکانە، لەوانەیە بەدڵدا جاری ببێت، یان لەوانەیە تەنها بە زماندا جاری ببێت، لەوانەشە بە دڵ و زمان و ئەندامەکاندا جاری ببێت.

## ئادابگەلێك كە هەر دەبێت بن:

**هەروەها وتی:** شتێك زاڵ دەبێت بەسەر شتێكی تردا، و شتێك لە شتێكی تر سەرقاڵ دەكات، و شتێك شتێكی تر لەبیردەباتەوە، شتێك شتێكی تر دەهروژێنێت، و شتێك شتێكی تر زیاد دەكات، ئەو كەسەی دادگایی نەفسی خۆی دەكات ئەمەی زانیوە، نزمەكەی بێداربوونەوەیە، و بەرزەكەی لەبیرچوونەوەیە[1].

**بزانە شەڕ** بریتییە لە حەزلێكردن و خێر بریتییە لە حەزلێنەكردن، حەزلێكردن پێش حەزلێنەكردنە و بەسەریدا زاڵە، تا زانست و صدق دێن و حەز دەسڕنەوە، و حەزلێنەكردن لە جێگەی دادەنێن، هەر كەس لەمە تێنەگات و نەیژنەوێت -كاتێك گوێی لێ دەبێت- ئەوا پێداچونەوەی باشی نهێنی خۆی نەكردووە، ناشتوانێت ئەو پەنهانەی خۆی چاك بكات تا لە كەسێكی شارەزاوە كە باش وەسفی دەكات فێرنەبێت، گەر قسەكان درێژەیان نەكێشابایە بۆمان دەنووسین.

**هەروەها وتی:** باشترین هاوەڵ دوو هاوەڵن: خەم و دڵتەنگی بۆ دواڕۆژ، هەروەها باشترین سەرقاڵی بریتییە لە خۆدادگایی كردن، خاوەنی **خەم** و **دڵتەنگی** و **خۆدادگایی كردنە** ئەو ساتەی كە ئەو سیانەی تێدا نییە بە ساتێكی پووچ دەزانێت، كەمترین كەمی بێئاگایی لەلای ئەو وەك زۆرترین گوناه وایە لای كەسانی تر.

هەروەها لە نیشانەكانی یەقین لە بەندەدا بەردەوامی دڵتەنگییە تیایدا.

ئەی برام، گەر بەندە تەنها بۆ ئەو كار و كردەوانەش بێت رووی لێدەكەن و تیایدا سەهو بێئاگایی و كەمی صدق دەنوێنێت وەك لە فەرز و سوننەتەكانیدا ئەنجامی

---

[1] واتە نزمترین ئاستی مەعریفە بێداربوونەوەیە، بەرزترین ئاستی مەعریفە لەبیرچوونەوەی حەز و ئارەزووەكانە.

دەدات و ئەنجامیداوە، هەروەها بۆ ئەو کەمی شەرم و حەیا و کـەمی چـاودێرییە بێـت ڕووبەڕووی بووەتەوە، ئەوا حەقە دڵتەنگ ببێت و خەم دایبگرێتەوە.

گەر تەنها بۆ ئەوە دڵتەنگ ببوایـە کـە کـار و کردەوەکـانی گـەر بـە وێنـەی کـار و کردەوە باشەکانی فریشتە و جین و مرۆڤ و هەموو جیهانەکان بن هێشتا زانستی نییـە بەوەی ئایا خودا لەوی قبووڵ کردووە یان ڕەدی کردۆتـەوە، نازانێـت ئایـا بـە ئەنـدازی گەردیلەیەکی لێ قبووڵ دەکرێت یان نە، ئەوا پێویست بوو دڵتەنگ بوایە.

گەر تەنها بۆ ئەوە دڵتەنگ بوایە گەر پێی بڵێن: لە تەمەنت سـاتێك هەڵببـژێرە کـە تیایدا لە خودا یاخی نەبووبیت بە هۆیەك لە هۆیەکان، ناتوانێت ئەو ساتە لە تەمـەنی ببینێتەوە، ئەوا پێویست بوو دڵتەنگ ببێت.

گەر بۆ ئەوە دڵتەنگ بوایە گەر پێی بوترێت: ئایا ساتێك لـە تەمـەنت شـك دەبـەی هەموو ئەوەی خودا لەسەر تۆ واجبی کردووە بە جوانترین شێوە جێبەجێت کردبێت، بە دڵنیاییەوە دەڵێت: شك نابەم و نازانم، ئەوا پێویست بوو دڵتەنگ ببێت.




# دادگایی کردنی نەفس



## نەفس و ئەزموون کردنی لە مەعریفە و ئاکاردا:

وتم: چۆن دادگایی نەفسی خۆم لە ناسینیدا بکەم؟

وتی: شتەکان بە ئاماژە و بەڵگە و نیشانە و نموونە دەناسرێنەوە، نموونەیەکت لەوە بۆ دەهێنمەوە تاکو ببێت بە زانست و نیشانە بۆ ئەوەی پرسیارت دەربارەی کردووە:

خەڵکی بە تاك و کۆمەڵیانەوە دوای ناسینیان و شارەزایی پێیان و ئاستی جیاوازیان و پلە و پایەی جۆراوجۆرییان وەك سنوقێك وان لەسەر رێگەیەك دانرابێت کوپی سەربەستراوی تێدایە، خەڵکی بەلایدا تێدەپەڕن و نازانن چی تێدایە، یەکێك لەوانە بڕیاری دا بزانێت چییە و وتی: دەبێ پەردە لەسەر ئەم سندوقە لابدەم و بزانم چی تێدایە، بۆیە سندووقەکەی کردەوە و کوپی پڕی سەرداخراوی تێدا بینی نەیدەزانی ئەو کوپانە چییان تێدایە، سەری هەموویانی کردەوە، لەیەکێکیانەوە بۆنی میسکی هەست پێ کرد، و لە یەکێکی ترەوە بۆنی عەنبەر و لەویتریانەوە شیر و لە دانەیەکی تریانەوە ماست و لەوەی پێنجەمەوە بۆنی پاشەڕۆ و لە یەکێکی تریانەوە بۆنی گرانبەها و یەکێکی تر بۆنی یاسەمین و ئەویتر بۆنی گوڵ و تەواوی بۆنە خۆشەکانی تر.

لەو بۆنانە بۆنی کبریت و بۆنی نەوت و بۆنی قەترانی تێدا بوو کە مرۆڤ لەبەر بۆگەنییەکەیان خۆی پێڕاناگیرێت.

خەڵکی بە گشتی وەك ئەو سندووق و کوپانە وان، ئەوان لە ناسینیان و گەڕان بەدوای ئەخلاقیاندا بە ئەندازەی کوپەکان جیاواز و جۆراوجۆرن.

نموونەی ئەو سندووقە وەك نموونەی تۆ وایە بە تەنها، کوپەکان بریتین لە ئەخلاق و ئادابەکانی تۆ، بۆنە خۆشەکان ئەخلاقە چاکەکانی تۆ و ئادابە باشەکانی تۆیە، خۆشترین بۆنی باشترین ئەخلاقی تۆ و چاکترین ئادابی تۆن، بۆنە بۆگەن و ناخۆشەکان خراپترین ئەخلاق و ناشیرینترین ئادابی تۆن.

هەتا نەفس تاقینەکرێتەوە و تاوتوێ نەکرێت ناناسرێت.

بۆیە نەفسی خۆت ئەزموون بکە تا بزانیت چی تێدایە، گەر ئەوەی تێدا بوو تۆ دەتەوێ بە کۆکی و تەبایی مامەڵەی لەگەڵ بکە، هیممەت و هەوڵ و تێکۆشانی نەفست بپشکنە، بەتیژی لێی وردببەرەوە، تا حیلمی خۆت بناسی لەو کاتەی کە نەزانێك خراپە دەرحەقت دەکات، نەك لەو کاتەی لەگەڵ ئارەزووەکانتدا کۆك و تەبایە.

تەوازوعی خۆت بناسە لەو کاتەی کەسێکی بێباك و بێوەفا بێباکی و بێوەفایت دەرحەق دەکات، و کەسێکی بەڕێز ڕێزت لێ دەگرێت، لە هەردووکیاندا فیتنە بوونی هەیە، لەوانەیە بەندە لە کاتی ڕێز لێ گرتنیدا تەوازوع بنوێنێت تاکو زۆرتر ڕێزی لێ بگرن، لەوانەشە لە کاتی بێباکی و بێوەفایی بەرانبەری تەوازوع بنوێنێت تاکو بەوەی بەرانبەر ئەو کەسە دەینوێنێت پلە و پایە و مەنزیلەت لەلای خەڵکی بەدەست بهێنێت، لەپای هەموو ئەمانە بوەستە و هیممەتت بپشکنە.

بێدەنگی خۆت بناسەرەوە لە کاتی بوونی ترس لە بەربوونەوەی پلە و پایەت لەلای کەسێك کە پلە و پایەت لەلای هەیە.

صدقی خۆت بناسەرەوە لەو بارەدا کە خۆڕازێنەرەوان و زۆرلەخۆکەران خۆیان بۆ جوان دەکەن و زۆر لەخۆیان دەکەن.

نەصیحەتی خۆت بناسەرەوە لە کاتی خۆشەویستیت بۆ نەفسی خۆت و دۆستەکەت و دوژمنەکەت، تا بزانیت: ئایا ئەوەی بۆ خۆت پێتخۆشە بۆ کەسانی تریش پێتخۆشە؟

وەرعی خۆت لەو حاڵەتەی دەستت بەسەردا گرتووە و تیایدا دامەزراویت بناسەرەوە، ئایا دەتوانی لەگەڵ ئەو حاڵەتە بمێنیتەوە گەر شتەکانت لێ تێکەڵ بوو یان نە؟

ژیری خۆت بناسەرەوە لەپای وازهێنان لەوەی کە سوود و قازانجێکی بۆ دونیا و دوارۆژت نییە، هیچ پاداشتێکی لەلای خوداوە پێ وەرناگریت، ئایا دەتوانی واز لەو شتە بهێنی یان نە؟

ئەمانەتداری خۆت بناسەرەوە لە کاتی ئارەزووەکانتدا، ئایا بە دروستی ئەمانەتەکە دەگێڕییەوە بۆ کەسەکە یان نە؟

تەماعی خۆت بناسە لە کاتی هەڵچوونی حەزەکاندا، ئایا لەو کاتەدا دەتوانی لە تەماعی خۆت دووربکەویەوە و لێی بێهیوا بیت یان نە؟

گەر لە هەموو ئەم دۆخ و بار و کاتانەدا کەسێکی ستایشکراو بوویت، چەندە خێر و چاکەت مەزنە! بۆیە حەمدی خودای لەسەر بکە و لە فەزڵی خودا داوای زۆرتر و زیاتر بکە، لەسەر ئەو رەوگە و رێگەت برۆ و بەردەوام بە، چونکە تۆ لەسەر شارێگەی راست و دروستی، لەسەر رێگەی خۆشەویستی و بەڵگە و رۆشنایی ئیمانیت.

گەر لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا کەسێکی زەمکراو بوویت، ئەوا چاکترین و لەپێشترین کاری تۆ بریتییە لە چاککردنی ئەخلاق و ئاکارت، چونکە تێکچوونێکی مەزن لە تۆدا

بوونی هەیە، و لەسەر شاڕێگەی ڕاست و دروست و خۆشەویستی و بەڵگە و ڕۆشنایی ئیمان نیت.

بۆیە لە خودا بترسە.. پێداچوونەوەی پشکنینی نەفسی خۆت و چاککردنی تێکچوونی بکە.

وتم: کاتی وا هەیە شتێك رووم لیٚ دەکات لە هەندیٚ حاڵەتدا رکم لە نەفسی خۆم دەبێتەوە و پەشیمانی لەسەرم زۆر توند و قورس دەبێت.

وتی: رقبوونت لە نەفست لە مەعریفەی تۆیە بە ئەو، پەشیمانیت لە کار و کردەوەکانی نەفس دەرمانی نەفسە، هەر کات تەماشای هەڵەی کەسێکت کرد بیر لە هەڵەی خۆت و رقبوونت لە نەفسی خۆت بکەرەوە، گەر بەرژەوەندی نەفس و قازانجی لەوەدا بووایە کە حەزی لێدەکات ئەو کات هەموو خەڵکی دەچوونە ریزی صاڵحانەوە، بەڵام خودا چاکبوونی نەفسی لەو شتانەدا داناوە کە حەزی لیٚ ناکات، و تێکچوون و تیاچوونیشی لەوانەدا کە حەزی لیٚ دەکات.

ئەوەی کە نەفس رقی لە چاکبوون و لە خێرە، لە راستیدا رقی لەو ناڕەحەتی و سەختی و دژوارییەیە کە لە رێگەیەوە دەگاتە چاکە و خێر، گەر پلە و پایەی چاکان لەرێگەی خراپە و بەدکارییەوە بوایە نەفس دەیویست و حەزی لیٚ دەکرد، هەر بەو جۆرە شەڕی خۆشدەوێت، چونکە خەسڵەت و رێگە و هەموو ئەوەی کە تێیدایە خۆشدەوێت.

هەروەها لە دادگایی کردنت بۆ نەفسی خۆ: ئەوەیە کە لەگەڵی تەنها بکەویتەوە، کار و کردەوەکانی بەڕوودا بشکێنیتەوە، بڵێیت: ئەی نەفس، تۆ ناتوانیت خودا بخەڵەتێنیت، و ناشتوانیت زاڵ بیت بەسەریدا، بۆیە فریودانی شەیتان و زاڵبوونی بەسەر

تۆدا قبووڵ مەکە، بەدوای ئارەزوودا مەڕۆ و مەگەڕێ، چونکە رووبەڕووی هەڵدێرت دەکاتەوە و تیادەچیت.

من تۆ هەڵنانێم بۆ سەر شتێك کە توانای ئەنجامدانت نەبێت، و زانستت پێی نەبێت، من تۆ دەبینم شتێکت بۆ خۆت پێخۆشە کە لە کەسانی تر رقت لێی دەبێتەوە، هەروەها شتێکت بۆ خۆت پێناخۆشە کە بۆ خەڵکی تر پێتخۆشە.

## لوتکە فێڵی دەرونی و راستەقینەی تەوەسول کردن بە چاکان:

من تۆ دەبینم، ئەی نەفس، ئەهلی تەوازوع و راستی و ئەمانەتت خۆشدەوێت تەنانەت گەر گۆڕ و ئاسەواری ئەوان ببینیت —وەك بانگەشەی بۆ دەکەی- خۆشتدەون، بەلاّم رقت لەو سیفەت و خەسڵەتانە دەبێتەوە کە بەهۆیەوە ئەوان لای تۆ خۆشەویستبوون، تەنانەت گەر لە خراپترین دوژمنی تۆدا ئەو خەسڵەتانە بوونی هەبێت تۆ خۆشتدەوێن.

بۆیە یان تۆ دەتەوێت خودا بخەڵەتێنی ئەوەت زانی کە خودا ئاگادارە بە هەموو نهێنی و پەنهانەکانت، یان نازانیت بە باشی بە دوای خێردا بگەڕێیت.

ئەی برام... کەسی برسی نانی خۆشدەوێت، کەسی تینوو ئاوی خۆشدەوێت، گەر نان و ئاو بخرێتە سەر سفرەیەك و بخرێتە بەردەمیان یان بە گەردنیاندا هەڵبواسرێت بوونی زانست بەوەی نان و ئاویان لەگەڵە سوودێك بە ئەوان ناگەیەنێت، هەر بەو جۆرە نزیکی ئەوان لە خواردن و خواردنەوەوە قازانجێکیان پێ ناگەیەنێت، هەتا دەست نەبەن بۆ خواردن و خواردنەوەکە و تێری لێ بخۆن و بخۆنەوە.

تۆش هەر بەو جۆرەی... زانستت بە خێر سوودێکت پێ ناگەیەنێت، هەر بەو جۆرە نزیکی زانست لە تۆوە و خۆشەویستیت بۆی قازانجێکی نییە، هەتا زانست دێتە ناو تۆ و دەبیت بە ئەهلی زانست، من ناتوانم بڵێم تۆ زانستت خۆشدەوێت، بەڵکو لە بانگەشەکەتدا فریوتخواردووە یان خۆ فریودەری گوایە تۆ زانستت خۆشدەوێت.

ئەی برام... ئایا تۆ کەسێکی تینوت بینیوە بگات بە ئاوی سارد و نەیخواتەوە مەگەر کەسێك بانگەشەی تینوێتی بکات و لە راستیدا تینوی نەبێت؟

یان کەسێکی برسیت بینیوە خواردنێك ببینێتەوە و دەستی بەسەردا بگرێت و لێی نەخوات، مەگەر کەسەکە بانگەشەی برسێتی کردبێت و برسی نەبێت.

بانگەشەکەت بۆ خۆشەویستی خێر و ئەهلی خێر بە ئاشکرا پووچ و بێبنەمایە، گەر ئەوەی خۆشتدەوێت لە دونیا پێوانە بکەی بەوەی خۆشدەوێت لە دوارۆژ، چونکە من تۆ دەبینم گەر شتێکت لە دونیا خۆشویست حەز ناکەی هیچ خاوەنێکی تری هەبێت جگە لە تۆ، ئەوە بریتییە لە خۆشەویستی راستگۆیانە لە خودی خۆیدا، گەر شتێکت لە کار و کردەوەی چاکان خۆشویست-وەك بانگەشەی بۆ دەکەی- هیچ شتێك بە ئەندازەی ئەوە لات گران نییە تۆ ببیت بە خاوەنی ئەو شتە..گەر تۆ ئەو شتەت خۆشبویستبایە پێتخۆش دەبوو کەس پێشت نەکەوێت بۆ بەدەستهێنانی، کەس بە ئەندازەی تۆ لەو کار و کردەوانەی بەدەستنەهێنابایە.

ئەی برام...کاتی ئەوە نەهاتووە شەکەت و تێر ببیت لە درۆ و فریوخواردن بە خودای موتەعالەوە؟ کاتی ئەوە نەهاتووە پێتخۆش بێت ناوەکەت بۆ تەنها یەك رۆژ لە هەموو تەمەنت لەگەڵ ناوی چاکان و ئەهلی تەوازوع و موخلیصان و مۆچاران(**الناصحين**) و

شوكركەران و رازیبـوان و ئـارامگران و موسـڵمانان و متمانـەدارن و پشتبەسـتوان بـە خودا و خۆڕادەستكەران و ترساوان و موشتاقان و عاریفـان  و زانایـان و یەقینداران‌ـدا بێت بە خودا؟

بە راستی پێت دەڵێم.. گەر كەسێك لە سەرسامی و سەیر و سەمەرەدا بمردبایە دەبوا تۆ لە جێگەی خۆت بمردیتایە گەر تەماشایەكی ئەوە بكەیت تـۆ كەوتوویـە سـەری لـە هەڵبژاردنی دونیا و رووكردنە دونیا لەگەڵ ئەوەی كە تـۆ یـەقینت هەیـە ئـەم دونیایـە هیچ نییە بەراورد بە رازیبوونـت بـە وازهێنـان لـە رێگـەی صـاڵحان و ئـەهلی خێـر و هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) و ئاوسێتی ئەو لە بەهەشتدا.

گەر لە دونیادا هاوەڵی پێغەمبەرت بكردبایە و پاشان لەو پێناوەدا هـەموو دونیـات واز لێ بهێنابایە ئەوا ئەوەی پشتت تێكردووە هیچ نییە لەچاو ئەوەی بەدەستت هێنـاوە، ئـەی دەبێ هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) لە بەهەشتدا چۆن بێت لەگەڵ بەردەوامی موڵـك لـە جیرانـی خودای موتەعال و جیرانی خۆشەویستانی، لەگەڵ ئەوانەی خـودا نیعمـەتی خـۆی بەسـەردا دابارانـدن لـە پێغەمبـەران و صـددیقان و شـوهەدا و صـاڵحان، ئەوانـە باشـترین هـاوەڵ و دۆستی مرۆڤن، لەناو خۆشی و نیعمەت و سرووری هەتاهەتایی و نەبڕاوە؟

بۆیە ئەی برام، پێداچوونەوە بە نەفسی خۆتدا بكە، سەرنجی ئـەم فریوخواردنـە بـدە، بزانە چ شتێك بەسەر تۆ و یەقینەكەتدا زاڵ بووە، یان ئەو فێڵە چییە كە لە تۆ كراوە و لێت هاتۆتە ژوورەوە؟

بیربكەرەوە لەوەی بۆی دەچیت لە كێشانە و پێوانەی كارەكانت، پرسیاری خودا لە تۆ لە گەردیلە و دەنكە رەشكەوە تا بەرەوژوورتر، و بەرەوخوارتر.

بـیر لـە خێرایـی کۆتاهـاتنی تەمـەن بکـەرەوە، هیـوا و ئاواتـەکانی دونیـات کورتبکەرەوە، با چاوتروکانێك تۆ لە ئەو[١] جیانەبیتـەوە و ئـەو لـە تـۆ جیانەبێتـەوە، نەلە شەودا و نەلە رۆژدا.

**"سبحان الله"** تـۆ سەرسـام نابیـت و ئـەقڵت لەدەسـت نادەیـت لـەم دۆخـەی تـۆی تێکەوتووە؟

پێداچوونەوە بکـە بـە کارەکانتـدا.. بزانـە چیيان لـێ داواکردویـت، ئـەوەی لـە تـۆ داواکراوە ئەوەیە گەر کارێکت ئەنجامدا تەنها مەبەستت خودا بێت یان ئەنجامی مەدە، ئەمەش ناتوانی ئەنجام بدەی؟ ئەمە لە سوننەتەکانت.. فەرزەکانیشت تۆ بـۆ تیـابردنی کەمترین فەرزت هیچ پاساوێك نییە، هەتا ئەوەی فەرمانت پێکراوە ئـەنجامی دەدەی، و واز لەو شتانە دەهێنیت کە نـەهییان لێکراوە..تـۆ داوایـەکت لـێ نـەکراوە نـەتوانی ئەنجامی بدەیت، داوایەکت لێ نەکراوە لە کەسانی تر نەکرابێت.

لەگەڵ ئەوانەشدا داوات لێکراوە: خێرت بۆ خەڵکی بوێت، گـەر خێـرت بـۆ خـەڵکی ناوێت شەڕت بۆیان نەوێت، ئایا ناتوانی ئەم کارە ئـەنجام بـدەی؟ یـان پێتخۆشـە و بـۆ نەفسی خۆت رازیت خەڵکی خێریان بۆ تۆ بوێت و تۆش بۆ خەڵکی شەڕت بوێت؟

هەروەها داوات لێکراوە: نەفسی خـۆت لەسـەرو خەڵکـەوە دانـەنێیت لـەناو نەفسـی خۆتدا، نە بە دڵ و نە بە زمان، ئایـا نـاتوانی ئەمـەش ئـەنجام بـدەیت؟ تـۆ و هـەموو خەڵکی بانگراون بۆ ئەمە، نەك بە تەنها تۆ.

---

[١] واتە: بیرکردنەوە لە ئەجەل.

**فریودەران.. بازرگانانی ئایین:**

هەروەها وتی: پێم بڵێ.. گەر سەرپێچی لەم کارە بکەی و بە کارەکانت کەسانی ترت مەبەست بوو جگە لە خودا و ویستت نەفسی خۆت لەسەرو خەڵکەوە دابنێیت، یان ئەوەی بۆ نەفسی خۆت پێتخۆشە بۆ ئەوان پێتناخۆش بێت، ئایا لەو رێگەیەوە دەگەیت بەوەی دەتەوێت؟

ئایا نازانیت گەر تۆ بەو جۆرە بیت دوورترین کەسی لە خوداوە؟

لەگەڵ ئەوەش من نابینم داوای دینار و درهەم بکەی و لەم رۆژگارەدا سوود و قازانجی لێ ببینی و ژیانی خۆتی پێخۆش بکەی، بەڵکو تۆ بەو کارەت مەدح و سەنا و پلە و پایە داوا دەکەی، تۆ رەوگەیەکت هەڵبژاردووە رق و خەشمی دروستکەرەکەت بۆ خۆت واجب کردووە، هەر بەو جۆرە رق و کینەی ئەوانەش کە تەبان لەگەڵت گەر شاراوە و پەنهات لایان ئاشکرا ببێت، هەر رۆژێکیش دێت ئەو نهێنییەی ناوەوەت دەربکەوێت.

هەروەها وتی: ئارامگرتن پاساو و بەڵگەیەکی بۆ خەڵکی نەهێڵاوەتەوە، هەر کەس بە شیرینی رازیبوون لەوەی خودا فەرمانی پێکردووە بە خودا نەگات با بە ئارامگرتن بە خودا بگات، هەر کەس بە رقلێبوون لەوەی خودا نەهی لێکردووە بە خودا نەگات ناتوانێت بە خۆشەویستی ئەوەی خودا فەرمانی پێکردووە بە خودا بگات، بەڵکو بە ئارامگرتن، بۆیە ئارامگرتن بەڵگە و بیانووی خەڵکی بڕیوە.

هەروەها وتی: لە کەمەوە زۆرینە پەند و ئامۆژگاری وەردەگرن..ئەهلی دونیا کاتێك ویستیان شتێك ئەنجام بدەن بەدوایدا دەگەڕێن، ئەو ئامرازانەی کارەکەی پێ ئەنجام دەدەن ئامادە دەکەن، ئەگینا رێگەی ئەنجامدانی ئەو کارە لەبەردەمیان داخراوە.

گەر هەموو ئەهلی دونیا کۆببنەوە و ئامرازەکانی هەموو پیشەکانیان لەدەستدا بێت، ئایا دەتوانن کون بکەنە دەرزییەك بەو ئامرازانە نەبێت کە ئامرازی کون تێکردنن؟ هەموو شتەکانی تر بەو جۆرەن.

پزیشکێکی بەیتەریت بینیوە بە ئامرازەکانی دوورین کارەکەی ئەنجام بدات؟

یان بەرگدروویەکت بینیوە بە ئامرازی پزیشکی بەیتەری کارەکەی ئەنجام بدات؟

هەموو کارێك بەو جۆرەیە.. ئاسنگەر بە ئامێرەکانی دارتاشی کار ئەنجام نادات، دارتاشیش بە ئامرازەکانی پینەدۆز کار ئەنجام نادات.

کار و کردەوەی دوارۆژیش بە هەمان شێوەیە، تەنها بە ئامرازەکانی خۆی دەتوانی دەستەبەریان بکەی، بنەڕەت لە جێبەجێ کردنی کار و کردەوەی دوارۆژدا بریتییە لە: زانست و مەعریفە و پەندوەرگرتن، ئەوانە بریتین لە ئاماژەکانی جێبەجێ کردن.

## خۆشەویستی دونیا سەری هەموو بەلایەکە:

لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ریوایەت کراوە: ((خۆشەویستیت بۆ شتێك کوێر و کەڕت دەکات))[1]

لە عیساوە (**علیه السلام**) دەگێڕنەوە فەرموویەتی: ((خۆشەویستی دونیا سەری هەموو هەڵە و خراپە و گوناهێکە))

باشترین شتێك کەسی باوەڕدار چارەسەری ئایینەکەی خۆی پێ بکات: بڕینی خۆشەویستی دونیایە لە دڵی، گەر ئەو کارەی ئەنجامدا وازهێنان لە دونیا و گەڕان

---

[1] أخرجه ابن أبي الدنيا والبيهقي.

بەدوای دوارۆژدا لەسەری ئاسان دەبێت، بڕینی ئەم دونیایە ئامڕازی خۆی دەوێت.. من ناڵێم ئامڕازەکەی بریتییە لە هەژاری و کەمی شتومەك و زۆری رۆژوو و نوێژ و حەج و زەکات، بەڵکو بنەڕەتی ئامڕازەکەی بریتییە لە: بیرکردنەوە و کورتی هیوا و خۆزگە دونیاییەکان و گەڕانەوە بۆ تەوبە و پاکێتی، و دەرکردنی لوتبەرزی لە دڵدا و پابەندبوون بە تەوازوعەوە و ئاوەدانکردنەوەی دڵ بە تەقوا و بەردەوامی دڵتەنگی و زۆری خەم بۆ ئەوەی رووی تێدەکات.

زۆرن ئەوانەی ئەو کار و کردەوانە ئەنجام دەدەن کە باسمان لەبارەوە کردن، بەڵام خۆشەویستی دونیا لە دڵیاندا روو لە زیادبوونە، زۆرێك لە خەڵکی ئەو کاروکردەوانە ئەنجام نادەن کەچی خۆشەویستییەکەیان بۆ دونیا روو لە کەمبوونە، چونکە بەم شێوەیە وەریگرتووە: نەفسی خۆی پابەندی بیرکردنەوە بکات و هیوا و خۆزگەی دوورودرێژ لە دونیادا کورت بکاتەوە، ئەو شتانەش خودا موباحی کردوون لەو شوێنانەدا دادەنێت خودا فەرمانی پێکردوون، یادی جیابوونەوە لە دونیا و ئەوەی لە دونیادایە لە دڵی دەرناچێت، هەروەها بیرکردنەوەی لەوەی بۆی دەچێت لە تەنگانە و ناڕەحەتی، لە گۆڕەوە تا وەستان لەبەردەم خودادا -**عز وجل**- و درێژەکێشانی دادگایی، ئەو نازانێت لە کام دوو ریزدا سەرژمێر دەکرێت، و لە کام دوو دەستەدا ناوی نوسراوە، ئایا لەگەڵ ئەوانەی کە پۆل پۆل رەوانەی بەهەشت دەکرێن، یان لەگەڵ ئەوانەی رەوانەی دۆزەخ دەکرێن.

بیر لە گوناهەکانی دەکاتەوە، ئەو گوناهانەی گەر بە یەکێکیان ئەهلی دونیا بگیرێت تیادەچن، هەروەها بیرکردنەوە لە مانەوەی هەتاهەتایی ئەهلی دۆزەخ لە ئاگردا.

خراپتر لە هەموو ئەمانە توورەبوونی خودایە لە ئەهلی دۆزەخ.

هەروەها بیرکردنەوە لەوەی کە دەترسێت لە دەستی بچێت لە رازیبوونی خودا لە ئەهلی بەهەشت.

بیرکردنەوە لە دونیا و خۆشییەکانی کەم دەکاتەوە، دڵ بە بیرکردنەوە زیندوو دەبێتەوە گەر بیرکردنەوەکە بۆ دوارۆژ بێت، ئەو دڵە دەمرێت گەر بیرکردنەوەکەی بۆ دونیا بێت.

هەروەها وتی: چی وا لە بەندە دەکات لێبڕاوانە بڕیار دەربکات ئەو بەشەی کە هەیەتی لە دونیا -لەو بڕە کەمەی تەمەن کە ماوەتەوە- لە پلە و پایە و حەمد و سەنای خەڵك و ڕێز لەلای ئەوان کورت بکاتەوە، هەروەها ئەو نیعمەتە زیادانەی لە دونیا بەدەستی هێناون بۆ بەدترین دوژمنی خۆی و خراپترین حەسوود بەجێبهێڵێت، شتێك بەسەر خزمان و دۆستانیدا دابەش نەکات، دوای ئەوەی کە هیوا وابوو هەموو ئەوانە رزگارکەری ئەو بن لە ئاگر، تەنانەت گەر داوای لیّ بکەن و لە بەندیخانەیەکی بەرتەسکدا بەندی بکەن تاکو قبووڵی بکات رازی نابێت، بەندکردنی پێخۆشترە لە بەخشینی ئەو شتانە، و کەناردەگرێت لەو داوایە و پشتی تێدەکات و هەر وەك جاران هەوڵ و هەڵپەی بۆ دونیا هەیە.

گەر تەنها بیتوانیبایە ئەوەی وێرانی کردووە لە تەمەنی رابردوویدا چاکی بکردبایەتەوە و لەوەی رابردووە رزگاری بوایە، ئەوا کارێکی گەورەی ئەنجام دابوو، دڵتەنگی و خەم و کەمی تێکەڵبوون بە خەڵکی بکردبایە بە تویێشووی خۆی، لەگەڵ دوعا و پاڕانەوە و گەردنکەچی، مردنی لەبەر چاوی خۆی دابنابایە، پەنای ببردبایە بە

خێرایی دەرچوون لە دونیا، چەندە ئاسانە لەلای ئەو کەسەی هەوارەکەی بەجێدەهێڵێت شوێنەکەی بە جیرانەکەی ببەخشێت، چەندە بێ مەیل و بێباك دەبێت بەو بەخشینە! چەندە ترس و حەز لەلای کەسێك هەیە بۆ ئەو شوێنەی دەیەوێت تیایدا بمێنێتەوە و ئاوەدانی بکاتەوە.

## پوختەی چاکبوونی نەفس:

هەروەها وتی: کەسی خوداذۆز گەر حیکمەت و ئامۆژگاری و مۆژگاری لە دوژمن و دۆست و نەزان و حەلیم قبوولْ نەکات، ئەوا خودادۆزییەکەی خوادۆزی مەلیکەکانە.

وتم: شتێکت باس کرد شتێکی تر لەبیردەباتەوە، ئەمە وەکو چ شتێکە لە شتەکان؟

وتی: وەکو تێری، ئارەزوو دەهروژێنێت و دڵڕەقی بەرهەم دەهێنێت و قورسی لاشە و خەو بۆ مرۆڤ دەهێنێت.

هەروەها زۆری قسەکردن، دڵ رەق دەکات و هەیبەت و بەهای مرۆڤ کەم دەکاتەوە و حیکمەت نەزۆك دەکات و هەڵە بۆ مرۆڤ زۆر دەکات.

هەروەها وەك هیوا و ئاواتی دوور و درێژ لە دونیادا، دوارۆژ لەبیردەباتەوە، دونیا و بەبیر دەهێنێتەوە و جوانی دەکات و لای خۆشەویست دەکات و حەسەد و دواخستن بەرهەم دەهێنێت و ئارەزوو بەهێز دەکات و حەز زۆر دەکات.

لەمەدا دەتوانی رێنموونی بۆ دژەکانیان وەربگریت، گەر بیرت لێکردەوە ئەو شتانە دەناسیتەوە خێر و شەڕ بەرهەم دەهێنن، هەروەها ناسینەوەی ئەو سەرقاڵییانەی کە سەرقاڵی تر لەبیر دەبەنەوە، چونکە دڵ یەك دڵە، و دەتوانێت بە تەنها یەك شتەوە سەرقاڵ ببێت.

# ویست و صدق و ئارەزوو



## تەبایی ئارەزوو و صدق لەسەر کاری چاکە:

وتم: صدق و ئارەزوو لەسەر کاری چاکە تەبان..

وتی: خودا دەتوانێت ئارەزوو بۆ صدق باربهێنێت(رامبهێنێت).. گەر ئەوە رووبدات بۆ کەمێك لە خەڵکییە، ئەوانەی ئەم راستییە دەزانن لەو کەمە خەڵکە زۆر کەمن.. ئەوانەش نایزانن زۆرینەن، چونکە ویست بۆ کار پێش کارەکەیە، ئارەزوو و حەز بەدوای کاردا دێن، نیەت و صدقیش لە پشتی ئەو دوانەوەن [١].

هەر کات بەندە دەیەوێت یان هەوڵدەدات کارێك لە نزیك یان دوور ئەنجام بدات ئارەزوو و حەز لەگەڵ نیەت و صدق روو لە دڵ دەکەن، بە بیرکردنەوە و هیوا و ئاوات لەو جۆرە کارە بۆ پێویستی و حەزەکانی دونیا و قازانجەکانی و خۆشی و تامەکانی، هەروەها هۆگربوون بە هاوشێوەکانییەوە لە شتەکاندا، و ئەوەی لەلای خەڵکی شوێن و پێگەی چاك و باش دەکات، و باسکردنی ئەوان بۆ ئەو بە مەدح و سەنا و حەمد و رێز و پلە و پایە و بەرزبوونەوە و دەسەڵات.

ویستی راستگۆیانە هێشتا بزر و نادیارە، لەبەر ئەوەی ویستی راستگۆیانە نادیارە دڵ ئەو شتانە وەردەگرێت، هیچ شتێکی لێ رەد ناکاتەوە، چونکە هەر دەبێت بۆ دڵ ئاواتێك هەبێت لەو کارەی کە دەیەوێت و هەوڵی ئەنجامدانی دەدات، مرۆڤ لە هەموو شتێك

---

[١] واتە: لە پشتی ئارەزوو و حەزەوەن.

زیاتر شتی لەبیر دەچێت، زۆرترین لەبیرچوونی لەو کاتەدایە، چونکە ئەو شتانەی کە نەفس و ئارەزوو هێناویانە بۆ دڵ لەوەی باسمان کرد لە مەدح و سەنا و حەمد و ڕێز و پلەوپایە و دەسەڵات و مەنزیلەت هەموو ئەوانە دڵ جیلوەیان پێ دەکات و حەزیان لێ دەکات، ئەوەش بێئاگایی و لەبیرچوونەوە بۆ ویستێکی راستگۆ دروست دەکات.

گەر لە شوێنی ئەوەی دڵ لای شیرینە و ئارەزووی دەکات تاڵی و بێزاری هەبوایە هەگیز لەبیرچوونەوە و بێئاگایی قبووڵ نەدەکرد، بەڵام کاتێك تەبایی رووی لێ دەکات دڵ پاڵدەداتەوە بەلایاندا.

هەر کەسێك خودا -**عز وجل**- بیەوێت نیعمەتی خۆی بەسەردا دابباریێنێت: ویستی راستگۆی لەبەردەم حەز و ئارەزووی نەفسدا راستدەکاتەوە و بە کارەکەی تەنها رووی پاکی خودا و خانەی دوارۆژی مەبەستە، بۆیە ئەمە دەبێت بە کار و سەرقاڵی دڵی و بیر لە رازیبوونی خودا و پاداشتی نەبڕاوە دەکاتەوە، ئەوەش نەفس و ئارەزوو هێناویانە -لەوەی باسمان کرد- دڵ قبووڵی ناکات و دەیداتەوە بەسەریاندا، لەمەدا مەزنترین نیعمەت بوونی هەیە و لەسەر خاوەنەکەی شوکرکردنی زۆر پێویستە.

## پێشکەوتنی ئارەزوو بەسەر ویستی راستگۆیانە لە کاردا:

گەر نەفس و ئارەزوو و حەز پێشکەوتوو بوون لە ویستی راستگۆ هەر دەبێت خاوەنی ئەو ویستە وەستان و وردبوونەوە و بیرکردنەوەی هەبێت، تا دڵی پاك دەکاتەوە لەوەی نەفس و ئارەزوو و حەز تووشیان کردووە، ویستی خودا(خوداویستی) بخاتە جێگەی ئەوە و لە پێشییەوە دایبنێت، دڵ وەریدەگرێت پێیخۆش بێت یان پێیناخۆش بێت، پاشان پارێزگاری لەو ویستە راستگۆیە بکات و بەردەوام بێت لە پێداچوونەوەدا بۆی

تاکو کارەکە کە دەستی پێکردووە بە ویستی راستگۆ -هەروەکو ئەوەی یەکەم- کۆتایی پێ بهێنێت، هەروەها دوای تەواوبوون لە کارەکەش هەر بەو جۆرە بمێنێتەوە هەتا رۆحی لە جەستەدا بێت.

بزانە حوکمەکانی ئەم کارە دەگمەنتر و قورسترن لە گواستنەوەی تاشە بەردێکی گەورە و سەرکەوتن بە چیای سەختدا، مەگەر کەسێك خودا ئەو حوکمانەی پێ بەخشی بێت، و ئەویش گرنگییان پێ بدات بەهۆی ترسان لە تیاچوونی نەفس و پووچەڵبوونەوەی کارەکانی، چونکە دوژمنەکەی پێداگر و سوور و فێڵبازە لە کردنەژوورەوەی ئافەتگەلێك کە کاروکردەوەکانی تێکدەدەن، ئەو بەر لەوەی بێنە ناو کارەکەیەوە پێویستە چاودێرییان بکات و دیارییان بکات، هەروەها دوای چوونە ناو کەرەکە و پاش کۆتاهێنان بە کارەکە.

## نمایشەکانی ئارەزوو لە دوای ویستی راستگۆیانە:

گەر ویست و نیەتی راستگۆ و دروست کە هیچ دەردێکی تێدا نییە پێشکەوتن و تێکەڵ بە کاربوون، و ئارەزووی نەرێ کرد و سەرپێچی لە حەز کرد و دژ بە دوژمنەکەی کۆشا، گەر لەدوای چوونە ناو کارەکەش بەرپەرچی دانەوە، ئەوا ئەو ئافەتانەی ئاماژەمان بۆ کردن پشتهەڵدەکەن، ئەو پێویستە بەو جۆرە بمێنێتەوە تا کارەکە بە قبوولکردن کۆتایی پێدێت، بۆیە بنەڕەتە دروستەکە کە ریشەی داکوتیوە و پێیەوە چووەتە ناو کارەکە رێگە لەوانە دەبڕێتەوە.

گەر لە کارەکەیدا ئەوانەی قبووڵ نەکرد و نەرێی کردن و پاڵی پێوەنان هیچ زیانێکی پێ ناگەیەنن.

گەر قبووڵی کردن و پاشان بەئاگا هات بەر لەوەی لە کارەکەی تەواو بێت، پەشیمان بوویەوە و گەڕایەوە وبێداربوویەوە، و بێئاگاییەکەی سڕییەوە، و پاشان کارەکەی بە پەشیمانی کۆتایی پێهێنا، هیچ زیانێکی پێ ناگەیەنێت.

گەر بە صدق و دروستی کارەکەی کۆتا پێهێنا، ئەوا دوژمن بۆ تێکدانی ئەو کارە شوێنی دەکەوێت با دوای ماوەیەکی تریش بێت.

بۆیە پێویستە بەندە لە خودا بترسێت و کارەکەی پڕ بکات لە ئیخلاص و پێش هەر کارێك و دوای هەر کارێك نیەت بهێنێت، بەو جۆرە تا مردن، تا هەموو کارەکانی بۆ خودا بێت، هیچ پاداشتێك جگە لە خودا لە کەس داوا نەکات، دژ بەو دوژمنە زاڵە بجەنگێت و سەرپێچی لە ئارەزوو خۆی بکات، ئازار بخوات لە دەستی ئەو نەفسە بە سەرپێچی لێکردنی، لەو حەزە هەڵچووەی ناو دڵ خۆی بپارێزێت، بزانێت مامەڵە لەگەڵ کێدا دەکات و بۆ کێ کار دەکات و پاداشت لە کێ دەخوازێت.

کار ئەنجام بدات بە هەڵچوونی حەز و ویست بۆ پاداشتی خودا -**سبحانە وتعالی**- هەروەها هەڵچوونی ترس لە سزای خودا، ئەو گەر لەسەر ئەوە کار بکات بە حەز و خۆشەویستییەوە کارەکەی ئەنجامداوە، لەبەر ئەو هەڵچوونەی لە حەز و ترسدا روویداوە، بۆیە—وەك پێشتر ئاماژەمان پێدان- ئافەتەکانی ناو ئەو حەز و هەڵچوونەی سڕیوەتەوە، ئەو ئافەتاتەی کار و کردەوەکانیان تێکدەدا.[١]

گەر لەسەر ئەوە کاری کرد وەك ئەوەی ئارەزوو و صدقی لەگەڵ یەکتر کۆکردبێتەوە، گوێ بە تەبایی و سەرپێچی نادات لەگەڵی گەر ئارەزوو بەو جۆرە بێت، ئەو چیداوە لە

---

[١] واتە: تەنها ئەوەندەی لە حەز و ئارەزووو ترس هێلاۆەتەوە کە حەزوخۆشەویستی بۆ کار و کردەوەی خێر دروست دەکات.

ئارەزوو گەر لە شەڕی سەلامەت بووبێت و زیانی پێ نەگەیەنێت، وك ئەوە وایە لەگەڵی کۆك و تەبابێت.

پێویستە بەندە خۆی بوەستێنێت.. پرسیار بکات لەوەی ئەنجامیداوە.. بۆ کێی ئەنجامداوە؟ و چ شتێکی بە ئەنجامدانی ئەو کارە ویستووە؟

## ریا و ئیخلاص و حوکمەکانیان:

**ویست دوو ویستە:** یەکێکیان بۆ دونیایە، ئەویتریان بۆ دارۆژ.

صدق و ئیخلاصیش ئەوەیە کاتێك بەندە بە کارەکەی رووی پاکی خودای مەبەست بێت و شتێك لە مانای دونیای تێدا نەبێت.

ریاش کاتێکە هەموو ویستەکەی بۆ دونیا بێت.

جۆرێك لە ریا لەو شوێنەوەیە بەندە لە بنەڕەتی کارەکەیدا مەبەستی حەمد و سەنا و مەدح و پلە و پایە بێت لەلای خەڵکی.

جۆرێکی تر لە ریا ئەوەیە بەندە لە ئەسڵی کارەکەیدا مەبەستی رووی پاکی خودای موتەعال و خانەی دوارۆژە، بەڵام پێیخۆشە بە کارەکەی لەلای خەڵکی حەمد و سەنا بکرێت.

جۆرێکی تر: بەندە بە کارەکەی رووی خودا و خانەی دوارۆژی دەوێت، گەر بەو ئیخلاصەوە چووە ناو کارەکە هەندێ لەو ئافەتانەی ئاماژەمان پێکردن خۆیانی بۆ نمایش دەکەن، ئەویش قبووڵیان دەکات و پێیخۆشە لەسەر کارەکەی خەڵکی مەدح و سەنای بکەن و لەلای خەڵکی پلە و پایە و مەنزیلەت بەدەست بهێنێت.

جۆرێکی تـر: بەنـدە بـە کارەکـەی رووی پـاکی خـودا و خانـەی دوارۆژی گەرەکـە و کارەکەی بەوە کۆتایی پـێ دەهێنێـت، بـەڵاّم دوای ماوەیـەك لـە تـەواوبوونی کارەکـە ئافەت رووی لێ دەکات، باسی کارەکە دەکات لای خەڵکی و دەیەوێت بەو باسـکردنە خەڵکی حەمـد و مـەدح و سـەنای بکـەن و پلـە و مەنزیلـەت لـەلای ئـەوان بەدەسـت بهێنێت، ئەمەیان لە هەموو ئەوانەی باسمان کرد ئاسانترە.

خەڵکی لەمەدا جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە.

دەستەیەك دەڵێن: ئەو باسـکردنە لـە گوناهانـە و کـار تێکنـادات، چـونکە کارەکـە تێپەڕیوە و بە دروستی کۆتایی پێهاتووە، بۆیە لەدوای کۆتاهاتن ناتوانێت تێکیبدات، ئەوەی دواتر تووشی بەندە دەبێت و ئەو ئافەتانە وەردەگرێت ئەوە خودا داوای تری لـە بەندەکەی هەیە و نابێتە پووچەڵ بوونەوەی کارەکەی پێشووی.

دەسـتەیەکیش دەڵـێن: کارەکـەی پووچـەڵ دەکاتـەوە، بـا ماوەیەکیشـی بەسـەردا تێپەڕیبێت ئەگەر ئافەتەکە قبووڵ بکات و حەمد و سەنای خـەڵکی پێخـۆش بێـت، و خەڵکی خستە ناو کارەکانییەوە و داوای مەنزیلە و پلە و پایەی لێ کردن.

## کاری خاڵی لە ویستی راستگۆ:

وتم: پێم بڵێ، گەر بەندەیەك ویستی کارێکی چاکە بکات، ئەنجامیـدا و لێبوویـەوە، پێش کارەکەی و دوای کارەکەی ویستی خودا و رۆژی دوایی لەبیر نەبوو، بەڵکو لەبیری چوو و لێی بەئاگا نەبوو، ئایا ئەو کارە بێ نیەت و بێ صدقە؟

وتی: بەڵێ

وتم: چۆن دەبێت کارێك لە کارەکانی چاکە کە بە نموونەی ئەو کارە خودای تێدا مەبەست بووە بەبێ نیەت و بەبێ صدق بمێنێتەوە، لە کاتێکدا بەندە ئەنجامیداوە؟

وتی: گەر صدق بوونی نەبێت و نیەت پێش نەخات کارەکەی شتێك نییە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((کار و کردەوەکان بە نیەتن))..

گەر بڵێین: من نیەتەکەم لەبیرچوو و لێی بێئاگابووم، ئەمە بریتییە لە دانپیادانان، و نابێتە بەڵگە بۆت، ئەوەی نیەتەکەی لەبیر بردییەوە دونیابوو، دونیا بریتی بوو لە ویستی زاڵی تۆ.

بۆ بەلای ئادەم جگە لە بیرچوون و نەبوونی عەزم چیتر بوو؟ گوێ هەڵنادەی بۆ ئەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿ وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِىَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴿١١٥﴾ ﴾ طه: ١١٥

من دەڵێم: کاتێك کار بریتییە لەو کارەی خودا فەرمانی کردووە ئەنجام بدرێت و صدقی نیەت و دروستیی ویستی تێدا بێت، و پێش هەموو کار و کردەوەیەك بکەون، لەلای من ئەوە بریتییە لە کار، ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((کار و کردەوەکان بە نیەتن))

## پێویستی گرنگیدان بە کرۆکی کارەکان بە ناوەکانیان:

بزانە، وەستانت لە سەرەتای کردنەوەی کارەکەدا، و یادی صدق و راستکردنەوەی نیەت و ویست، و بێزاری و هەڵهاتننت لە ریا، و یادی بەهەشت و دۆزەخ، صدقی تۆ زیاد ناکەن، وەك چۆن ریای تۆ کەم ناکەن، هەتا تەقوا بەکاردەهێنیت و نیەت پێش دەخەی و لە ویستەکەتدا راستگۆ دەبیت.

لەو کاتەدا دەبێت تۆ خۆت لە درۆ بەدوور بگریت، مرۆڤ ناوی خێری خۆشدەوێت و رقی لە ناوی شەڕە، بەڵاَم خودی شەڕی خۆشدەوێت.

ناوی صدق زۆر لای مرۆڤ خۆشەویستە، بەڵاَم خودی صدق لەسەری سەخت و گرانە، مرۆڤ زۆر رقی لە ناوی ریا دەبێتەوە، بەڵاَم زۆری خۆشدەوێت و لەلای ئاسانە و لە بەکارهێنانیدا ئازا و بەتوانایە.

بۆیە لەو کاتەدا لە یادی نیەت کەمتەرخەم مەبە، صدق و نیەت دوو ناون، خودی ئەو دوو ناوە بریتییە لە ویستێکی راستگۆیانە، نەفس و ئارەزوو بە شیرینییەکەیان بەری کردار لە ریشە دەردەهێنن .

بزانە، ئەو چێژەی لە خواردنی حەڵوا و خواردنەکانی تر دەیبینیتەوە تەنها لەو کاتانەدا دەیبینیتەوە کە حەڵوا بخۆیت، شیرینی حەز و ئارەزوو لە بیردا تام و چێژی خۆی هەیە گەر لەسەر ئەوەی دەتەوێت شوێنپێیان هەڵبگریت، شیرینی حەز و ئارەزوو وەك خواردن و خواردنەوە نییە، بەڵکو چێژەکەیان لە شتەکاندا بەوە دەبێت لە بیر و بنەڕەتیاندا شوێنپێیان هەڵبگیرێت.

بزانە، چێژی ریا و شیرینییەکەی تامێکە دەچێتە ناو دڵەوە، و بە رەگەکاندا جاری دەبێت لە سەرەتای کارەوە لێی ئاگادار بە، هیممەتت بپشکنە و ویستت راست بکەرەوە، لە هەموو ئەوانەشدا چاودێری خودا بەتەنها بکە.

## ناسینی صدق لە گواستنەوەی ویست لە ریاوە بۆ دروستیی:

وتم: گەر ویستم کارێك ئەنجام بدەم، پێش کردنەوەی کارەکە وەستام و پێداچوونەوەی نیەت و ویستی خۆمم کرد، بینیم ریا پێش راستگۆیی کەوتووە، بینیم صدق لە من

بزر بووە، لەو بارەدا ویستم ویست وەکو خۆی بگوێزمەوە بۆ صدق و دروستیی و نیەتی باش، هەروەها لە ئارەزوو خۆم بپارێزم، بە دوورکەوتنەوە لە شیرینبیەکەی و ریا و ئاررەزووەکەی، کەی دەزانم من ئەو کارەم ئەنجامداوە و ئەوەی من دەمەوێت بەدەستم هێناوە، تۆ باسی ئەوەت کرد کە یادی نیەت و صدق سوودێك بە من ناگەیەنن تا دەستەبەری ویست لەوانەدا نەکەیت؟

وتی: لەبەر ئەوەی ئەو دوانە(نیەتی باش و ویستی راستگۆیانە) لەگەڵ ریا لە یەك دڵدا کۆنابنەوە، پاشان وتی: لەوانەیە دوو ناوەکەیان کۆببنەوە، بەڵام خودی ئەو دوانە لەگەڵ یەکتر کۆنابنەوە، گەر نەفس ئەوەی تۆ دەتویست بە کارەکە لە خودا ویستی و خانەی رۆژی دوایی ئەو نەیدەویست و حەزی لێ نەدەکرد، ئەوا بزانە نیەتی باش ئامادە بووە و ریا بزر بووە، هەر بەو جۆرە دەزانیت ریا ئەمادە بووە و نیەتی خێر بزربووە.

گەر ئەوەی بۆم وەسف کردی لات تێکەڵ بوو، ئەمرەکەت لێ هەڵوەشایەوە وەك نەتەوێت هەرگیز ئەنجامی بدەی و راستی تیا بەکاربهێنی، گەر زانیت بە هەڵوەشاندنەوەی کارەکە راستت کردووە، لەسەرەتاوە دەست پێ بکەرەوە، گەر بە هەڵوەشاندنەی کارەکە و وازلێهێنانی رازیبوون و سوکنایی و ئارامیت لە نەفسی خۆت دەبینییەوە، بزانە ئەوە نیشانەی ئامادەبوونی صدق و بزربوونی ئارەزوو و ریایە، گەر لە هەڵوەشاندنەوە و وازهێنان لێی بێزار بوون رووی لێ کردی بزانە هێشتا ئارەزووی تێدایە.

وتم: نموونەیەکم بۆ بهێنەرەوە رۆشنتر بێت لەمە:

وتی: وەك ئەو پیاوەی ویستی خواردن دروست بکات و خەڵکی بۆ بانگ بکات، پێداچوونەوەی بە نەفس و ویستی خۆیدا کرد، گەر دەیویست فلان بانگ بکات بۆ

دەعوەتەکە نەفسی -بەهۆی شتێکەوە- لەگەڵی کۆك و تەبابوو، گەر دەیویست فلاَن کەسی تر بانگهێش بکات هەندێ دواخستنی بۆ دەکرد، چونکە دەیەوێت بەکاری بهێنێت و بۆی ملکەچ ببێت، هەروەها گەر دەیویست فلاَن دەعوەت بکات تاکو پەنای پێ بگرێت لە ئەنجامدانی ستەمێك، گەر دەیویست کەسێکی تر بانگ بکات تاکو شتێکی لە دونیا لێوە بەدەست بهێنێت، گەر دەیویست یەکێکی تر بانگهێش بکات حەمد و سەنای بکات، و ناوی بەناو خەڵکیدا بلاَوە پێ بکات، یان کەسێکی تر بانگ بکات بەهۆی خۆشی وەرگرتن لێیەوە، و هاوشێوەی ئەمانە کە هیچی بۆ خودا -**سبحانه وتعالی**- ئەنجام نادرێت، بەڵکو هەمووی بۆ دونیایە.

کە لە نەفسی خۆی ئەمانە دەرکەوتن و ڕۆشن بوویەوە و تێگەیشت ویستەکەی بۆ رووی پاکی خودای موتەعال و رجای پاداشتی دوارۆژ نەبووە لە پێدانی خواردن لە نەفسی خۆیدا وتی: نا... ویستی یەکەم واز لێ دەهێنم و ویستی دووەم لە دڵدا ئامادە دەکەم کە تیایدا تەنها مەبەستم رووی پاکی خودای متەعال و خانەی دوارۆژ بێت.

پاشان وتی: لەوانەیە من لەمەدا خۆم بخەڵەتێنم و بە خۆم نەزانم..

بەلاَم لە جێگەی ئەوانە کەسانێکی تر دەعوەت دەکەم، نیەت و ویستی دروست پێش دەخەم بەر لەوەی خواردنەکە پێشکەش بکەم، بەر لەوەی هەر یەکێك لەوانە بانگێش بکەم.

گەر نەفسی خۆی لەو بارەدا بینی ململانێی لەگەڵ دەکرد بۆ ئەوەی دەعوەتیان بکات، بێزاری نەفس بۆ وازهێنان لە بانگهێش کردنیان و خۆشەویستی بۆ بانگهێش کردنیان نیشانەی ئەوەی راستگۆ نەبووە و فریوبخواردووە.

گەر بەلای واز لێ هێناندا پاڵیدایەوە و ئارامی بۆ هات، ئەوە لە نیشانەی خێرە، لەو بارەدا پێویستە کارەکە ئەنجام بدات و بڕوات لەسەری، گەر بیەوێت بانگیان دەکات و ئەگەریش بیەوێت بە نیەتێکی نوێوە کەسانێکی تر بانگهێش دەکات.

## زۆری هەڵە و شاراوەیی فریوخواردن لەم دەروازەیەوە:

فریوخواردن و تێکەوتن، و هەڵە و ئەنقەستکاری، و لەبیرچوونەوە و بەلا لەم دەروازەیەوە لە ئیخلاصی کارە، صدقی نیەت و پێشخستنی نیەت کارێکی سەخت و دژوارە، و بەلا و ناخۆشی زۆری تێدایە.

بەهۆی سەختی و دژوارییەوەیە لەسەر کارێکی کەم کە بە ئیخلاصەوە ئەنجام درابێت پاداشتێکی زۆر وەردەگرێت.

ئافەتەکانی ئیخلاص زۆرترە لەوەی کتێبێك لە ئامێزی بگرێت، دروستییەکەی دەگمەنترە لەوەی کەسێکی فریوخواردووی لەخۆبایی بە رووالەتی کیتاب و رووالەتی زانست بەدەستی بهێنێت، هەموو ئەوانە تەنها ئەهلی گرنگیدان بە نەفسی خۆیان پەی پێ دەبەن، ئەو کەسانەی ترسان لەوەی کردارەکانیان پووچ ببێتەوە، ترسان لەوەی نەفسی خۆیان تیاببەن.

کەسی ژیر و هۆشمەند نابێت لە پشکنینی هیممەت و دادگایی نەفسی خۆی خاوبوونەوە رووی لێ بکات، هەرەها لە پاککردنەوەی ناخ و ویژدان و چاودێری خودا- **سبحانه وتعالى**- لە پاڵ هەر کارێکدا دەیەوێت ئەنجامی بدات نابێت سارد ببێتەوە، ئەگەر وا نەکات با بزانێت ئەو فریوخواردووە.

کۆمەکی و لێبڕانی دروست و تێگەیشتن و ویستی راستگۆیانە لە خودا داوا دەکەین.

بزانە، بێئاگایی و کەمتەرخەمی لەم زانستە کە کارەکان پاڵفتە دەکات نەزانینێکی گەورەیە، لەخۆبایی بوون و کەمی گرنگیدانە بە نەفسی خۆ و بێباکییەتی بە ئاگاهی خودا بەسەر تێکچوونی کار و کردەوەکانیدا.. لە نێوان ئەم سیفەتە ناپەسەندانەوە -کە ئاماژەمان پێکرد- تیاچوون بەرهەم دێت.

ئێمە رێنموونی و راسترەوی لە خودا -**سبحانه وتعالى**- داوا دەکەین، هەروەها داوامانە یارمەتیمان بدات بۆ هەستان بەوەی زانیومانە و شوکر کردنی لەسەر ئەوەی تێیگەیشتین، داوای لێ دەکەین بە فەزڵی خۆی بۆمان زیاد بکات، ئێمە حەز و خۆزگەمان بۆ لای ئەوە...**ولا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم**.



## بەڵگە و نیشانەکان



بەناوی خودای رەحمان و رەحیم.. لە هەندێ لە حەکیمانەوە دەگێڕنەوە، وتوویەتی:

گەر خەڵکی واگومانیان پێ بردی تۆ کارێکی خێر ئـەنجام دەدەی و لەگـەڵ ئەوەشـدا ئەنجامت نەدەدا، یان کارێکی خێرت ئەنجام دەدا و ئەوان وا گومانیان دەبرد تۆ زۆرتـر ئەنجام دەدەی و نەتدەویست ئەوان بە راستەقینەی کارەکەت بـزانن، ئـەوا تـۆ لەوانـەی پێتخۆشە حەمد بکرێی بەوەی ئەنجامت نەداوە.

گەر پێتخۆش بوو پێت بزانن تۆ حەز دەکەی حەمدت بکەن بەوەی ئەنجامتداوە.

**هەروەها وتی:** نیشانەی خۆشویستنی خودا خۆشەویستییە بۆ هـەموو ئـەوەی خـودا خۆشیدەون.

**نیشـانەی ترسـانیش لـە خـودا** وازهێنانـە لـە هـەموو ئـەو ئەوانـەی لـەلای خـودا ناپەسەندن.

**نیشانەی حەیا لە خودا ئەوەیە:** هاتن بۆ لای خودات لەبیرنەچێتەوە، لە هەموو کار و بارەکانتدا چاودێری خودا بکەیت بە ئەندازەی نزیکی خودا لە تۆوە، و ئاگاداری بە تۆ.

**هەروەها لە نیشانەکانی گومانی باش بە خودا** توندی(گەرمی و گەشی) کۆشانە لە گوێڕایەڵی خودادا.

**نیشانەی نەصیحەت بۆ خودا:** توندی(گەرمی و گەشی) رووکردنە خودا و تێگەیشتن لـە کتێبەکـەی، و کـارپێکردنی، و شـوێنکەوتنی سـوننەتی پێغەمبەرەکـەی (ﷺ)

هەروەها پێیخۆش بێت گوێڕایەڵی لە پێغەمبەر (ﷺ) بکرێت و لێی یاخی نەبن، و یادبکرێت و لەبیرنەچێتەوە.

**نیشانەی نەصیحەت بۆ خەڵکی:** ئەوەی بۆ خۆت پێتخۆشە لە گوێڕایەڵی خودا بۆ خەڵکیش پێتخۆش بێت، هەروەها ئەوەی بۆ خۆت پێتناخۆشە لەوەی خودا لای ناپەسەندە بۆ ئەوانیش پێتناخۆش بێت.

**نیشانەی ئارامگرتن:** لە کۆی ئەو موسیبەتانەی رووت لێ دەکەن ئەوەیە سکاڵا نەبەیە لای خەڵکی.

**ئارامگرتنیش بریتییە لە:** ئارامگرتن لەسەر گوێڕایەڵی کردنی خودا، و ئارامگرتن لە یاخی نەبوون و ئەنجام نەدانی گوناه، ئارامگرتن لەسەر شاردنەوەی موسیبەت، ئەوەش بریتییە لە گەنجینەی خێر و چاکە، هەروەها ئارامگرتن لەسەر شاردنەوەی کاری چاکە، کەوابوو: ئارامگرتن بریتییە لە بەندکردنی نەفس لە هەموو ئەوانە.

**نیشانەی رازیبوون لە خودا:** رازیبوون بە قەزای خودایی، ئەوەش بریتییە سوکنایی دڵ بۆ لای بڕیارەکانی خودا و رادەستکردن بۆ لای خودا بەر لە رازیبوون و رازیبوون دوای رادەستکردن.

**لە نیشانەکانی صدق لە رجادا:** گەرمی و گەشی لە داوادا، کۆشان و سووربوون بۆ گەیشتن بەوەی رجای دەکات.

**لە نیشانەکانی ناسینی نەفس:** گومانی خراپە پێی.

**لە نیشانەکانی شوکر:** ناسینی نیعمەت بە دڵ کە لە خوداوەیە نەك لە کەسانێکی ترەوە.. حەمدکردن لەسەر نیعمەتەکە بە زمان.. نیعمەتەکە نەکات بە کۆمەك بۆ ئەنجامدانی کارێك خاوەن نیعمەتەکە پێیناخۆشە.

وتم: چی زانین و ناسینی من پشتڕاست دەكاتەوە بەوەی بزانم نیعمەتەكە لە خوداوەیە؟

وتی: هەستان بە بەخشین لە نیعمەتەكە و كۆشش كردن لە شوكركردنی.

**لە نیشانەكانی ناسینی دونیا:** وازلێهێنانی و زوهد كردن لە دونیا و نامۆبوون لێی و لە هەموو ئەو كەسانەی دونیایان خۆشویست و هەڵیانبژارد و بە مەزن تەماشایای كرد.

**لە نیشانەكانی ناسینی دوارِۆژ،** هەڵچوونی حەز و ویست بۆ دوارِۆژ و گەرمی و توندی شەوق بۆ لای دوارِۆژ و هۆگری بە باسكردنییەوە، و هۆگربوون لەگەڵ ئەوانەی راستگۆیانە بۆ دوارِۆژ كاردەكەن.

**لە نیشانەكانی ئەقڵ(هۆش):** تەگبیری باش و دانانی شتەكان لە جێگەی خۆیان لە قسە و كردار، ئەوەی ئەمە بەڕاست دەگێڕێت: هەڵبژاردنی زۆرە(دوارِۆژ) بەسەر كەمدا(دونیا).

**لە نیشانەكانی دادپەروەری:** دانەنانی دوو دادوەر لە نەفسدا، بۆ نەفسی خۆت بڕیارێك دەربكەی و بۆ خەڵكیش بڕیارێكی تر، هەتا دادوەر بۆ نەفسی خۆت و بۆ كەسانی تر دەبێت بە یەك دادوەر، و لە ناخەوە دەبیت بە خاوەنی ویژدان بەرانبەر بە خەڵكی.

**لە نیشانەكانی تەوازوع:** هەر كەس بانگی كردبیت بۆ حەقێك قبووڵت كردبێت و رەدت نەكردبێتەوە، خۆت لە هەموو موسڵمانان كەمتر تەماشا بكەیت.

خەڵكی لە هەڵبژاردنی خودا و دوارِۆژ و رازیبوون و شوكر و متمانە و ترس و یەقین و ئارامگرتندا جۆراوجۆرن، نزمترین پلەیان ئارامگرتنە و باڵاترینیان بریتییە لە یەقین.

**لە نیشانەكانی ئەخلاق جوانی:** شاندانە ژێر ئازار لەپێناوی زاتی خودای موتەعالدا، و رقخواردنەوە و زۆری كۆكی و تەبایی بۆ ئەهلی حەق لەسەر حەق، هەروەها لێخۆشبوون و لێبووردن لە هەڵەكانیان.

**لــە نیشــانەکانی ئــەخلاق ناشــیرینی:** زۆری جیــاوازی و نــاکۆکی و کــەمی دان بەخوداگرتن.

**لە نیشانەکانی ئولفەت:** کەمی ناکۆکی و کەمی جیاوازی و ئەنجامدانی چاکە.

**لە نیشانەکانی صدق:** خوداویستن بە تاکوتەنها لە کار و قسەکاندا، و وازهێنان لـە رازاندنەوەی قسـە و گوفتـار و خۆشەویسـتی بـۆ پاداشـتی خـەڵکی، و راسـتگۆیی لـە گوفتاردا.

خۆشترین و باشترین زیندەگی بریتییە لە: قەناعەت.

**زانست بریتییە لە:** ترسان لە خودا، ئەوەش بریتییە لـە هەڵبـژاردنی دوارۆژ بەسـەر دونیادا و ناسینی رێگەی بەرەوخوداچوون.

**باشبوونی دڵ** بریتییە لە سۆز و نەرمونیانی و دڵنەرمی... تێکچـوونی دڵ بریتییـە لە: دڵڕەقی و وشکی و زبری و توندی.

**بەتامترین زیندەگی** هۆگرییە بە خوداوە.

هۆگریش بریتییە لە: کۆبوونەوەی هیممەت.

**خراپترین شەڕ** کە هیچ خێرێکی تێدا نییە و هـیچ خێرێـك لەگـەڵی راوەسـتاو نییـە بریتییە لە: لوتبەرزی، خێرترین خێر کە شەڕی تێدا نییە بریتییە لە تەوازوع، ئـەوەش ئەوەیە نەفسی خۆت لەخوار خەڵکییەوە دابنێیت.

**لوتبەرزی:** ئەوەیە کە نەفست لەسەرو خەڵکییەوە دابنێیت، چ خێرێك لە بەندەیەکدا هەیە شتێکی تر بەسەر تەوازوعدا هەڵبژێرێت.

**حەزمیش:** بریتییە لە هەڵهاتن لە هەر شوێنێك تەمومـژ و لێڵـی و ناڕوونی تێدا بێت.

**ئارامگرتنیش:** سەرپێچیکردنە لە خۆشەویستی، لەگەڵ هێزی ئاراگرتن هیچ عیبادەتێك سەخت و گران نییە، هەتا بەرزدەبێتەوە لە پلەی ئارامگرتنەوە بۆ پلەی ترس، پاشان لە پلەی ترسەوە بۆ پلەی خۆشەویستی.

هەروەك چۆن هیچ شتێك لە دونیا کە پێیدراوە بۆ بەندە خۆش و بەتام نییە بە قەناعەتەوە نەبێت، هەر بەو جۆرە هیچ کار و کردەوەیەکی دوارۆژ خۆش و بەتام نییە بە ترس و خۆشەویستییەوە نەبێت،

کاتێك بەندە رووی لەوە کرد ئەرك و زەحمەتی ئارامگرتنی لەکۆڵ دەبێتەوە، و لە ترس و شەوق تام و چێژ وەردەگرێت.



# خۆشییەکانی ترس و شەوق



## مەعریفە و خۆشییەکانی ترس:

وتم: بە چ شتێك لە پلەی ئارامگرتنەوە دەگوێزێتەوە بۆ پلەی خۆشییەکانی ترس و شەوق؟

وتی: بە مەعریفەی باش.

وتم: مەعریفەی باش لە چییەوە؟

وتی: ئاتاجی و هەژاری دڵ بۆ لای خودا و نزیکبوونەوە لێی و لە خانەی دوارۆژ، تا وەك ئەوەی بە چاو بیانبینێت... ئەو گوناهانەی پێشتر لە نێوان خۆی و خودادا ئەنجامیداون لەبەرچاوی خۆی دابنێت، ئەو نیعمەتانەی خودا بە ئەوی بەخشیوە بیر لێ بکاتەوە، نیعمەتگەلێکی زۆر لە هەژمارکردن نایەن و ناتوانێت بە دڵ شوکریان بکات، بەمەزنڕاگرتنی خودا و شکۆمەندی بۆ ئەو و ترسان لە هەڕەشەکانی و ناخۆشییەکانی ڕۆژی دوایی و ئەوەی بەدوایدا دێت و ئەوەی پێشی دەکەوێت، لە بەرزەخ و مردن.

کاتێك ئەوە لە دڵیدا جێگیر بوو و دڵ بەو جۆرە و لەلای ئەو جۆرە سوکنایی بۆ هات و ئەندامەکان بۆ گوێڕایەڵی تەکانیان بەخۆدا، لەو بارەدا ئەرك و ماندووبوونی ئارامگرتن نامێنێت، و دەگوێزێتەوە بۆ پلەی ترس و خۆشەویستی لە بەندایەتیدا، لەو شوێنە شیرینی ترس و شەوق دەبینێتەوە، ئەوەش بریتییە لە عیبادەت بە مەعریفەی باش.

ئەو بەردەوام بەو جۆرە دەبێت تا بانگکەری دونیا و وەسوەسەی نەفس بانگی لێ دەکات، هەر ئەوەندە کە وەڵامی دانەوە لەو شیرینییە دایدەبڕن و دەیگێڕنەوە بۆ پلەی ئارامگرتن.

ساتێك لە سایەی ترس و خۆشەویستیدا خێرتر و باشترە لە چەندین رۆژی ئارامگرتن، چونکە ترس و خۆشەویستی و شوکر و پەشیمانی لەخۆ دەگرێت، ئەوەش بریتییە لە تەوبە و بەمەزنڕاگرتنی ئەوەی خودا بەمەزن ڕایگرتووە، و کەم و بچووك تەماشاکردنی دونیا و هۆگری بە خوداوە.

ئەوەی خاوەنی رۆژووی زۆر و نوێژی زۆر و حەج و غەزای زۆرە ناگاتە پلەی ئەم کەسە، کار بەم جۆرەیە ئەگەر بە مەعریفەیەکی بەهێزەوە ئەنجام بدرێت.

## چۆن خەڵکی لەم پلەیە بێئاگابوون؟

وتم: موریدان بۆ ئەم پلەیە لە کوێن؟ بۆچی گرنگی پێدانیان بەم پلەیە زۆرتر نییە لە گرنگی پێدانیان بە پلەکانی تر؟

وتی: ئەم پلەیە لەناو پلەکانی تردا وەك گەوهەرێك وایە لەناو کۆمەڵێکی شتی تردا، یان وەك مرواریيەکی بێوێنە لەناو هەزار دەنکە مرواریدا، رەگەزەکەشیان یەك رەگەزە، کەمی و دەگمەنی ئەهلی ئەم پلەیە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەندێ شت هەیە سەختی و دژوارییەکەی لە گرتنەبەریدایە، کە بۆی چوویت ئەوا چوویت بۆ لای ئاسانی و هەرزانی و هۆگری.. هەندێ شتیش هەیە ئاسانی و حەزلێکردنی لە رێگەکەیدایە، و سەختی و دژوارییەکەی لە خودی هەمان شتدایە کاتێك بۆی دەچیت.

خەڵکی بە گشتی گرنگی بەوە دەدەن ئاسانکاری تێدایە، کاتێك گەیشتنە توندی و تاڵی لوتیان دەتۆزێتەوە و سەرسام دەبن و زیانۆمەندی روویان لێ دەکات، پێش ئەوە بۆی هەڵدەهاتن و پەلەیان بۆ دەکرد بەهۆی ئاسانی سەرەتاکەیەوە.

نابینی داوای زانست دەکەن و کاتێك گەیشتنە بەکارهێنانی زانست و وەرعکردن کەسێك نابینی بەکاری بهێنێت، و کەسێك نابینی زانستی بوێت مەگەر دانە دانەیەك؟

نابینی فێری رۆیشتن و رێگەبڕین لە پێناوی خودا و مەزنی پلە و پایەی جیهاد دەبن، بەڵام کاتێك رۆیشتن بۆ لای مەرجەکانی جیهاد کەسێك نابینی بەو کارە هەڵبستێت؟

ئەم پلەیە رێگەی رۆیشتن بۆ لای سەخت و دژوارە، لەسەر ئەم رێگەیە دانە دانەیەك دەبینی لە زۆرێك لە خەڵکی..بۆیە ئەهلی ئەم پلەیە کەمی کردووە، و داواکارانی پلەکانی تر زیادی کردووە، چونکە ئەم پلەیە بەندە بۆ خودا ساغ دەکاتەوە، ئەوەش بریتییە لە پلەی صدق و زانستەکەی کۆچی لێکراوە، و خەڵکیش کارێکیان دەوێت هەڵگرتنی ئاسان بێت و پشکنینی ویست و هیممەت و پاکی ویژدان و وەستان و دادگایی نەفس و سەرپێچی ئارەزوو و کۆشان دژ بە دوژمنی تێدا کەم بێت.

بزانە رازیبوونی بەندە بەو دۆخ و حاڵەی ئەوی تێدایە لاوازییە و بەڵایەکە بەسەریدا داباریوە.

## ئەوەی خودای خۆشدەوێت پەلە دەکات لە کاری چاکە:

هەروەها وتی: کەسێك خودای خۆشبوێت بە هەمیشەیی تا لەژیاندا بێت ململانێ و کێبەرکێیەتی بۆ نزیکبوونەوە لێی..کەسێك بترسێت هەوڵی خۆرزگارکردن دەدات..

کاتێك دڵنیابوو لە ڕۆیشتن و کۆچکردن لـەم دونیایـە نەفسـی خـۆی ژێربـار دەکـات و دوارۆژ بەسەر دونیادا هەڵدەبژێرێت.

لە خەڵکیدا شتێك نابینمەوە کەمتر بێت لە تووڕەبوون لەبەر خودا، و ڕازیبوون بۆ خـودا و خۆشەویستی بۆ خودا و ڕق لەبەر خودا، کەمترینی ئەو کەمانە بریتییە لە ڕازیبـوون لـە خودا، و خۆڕادەستکردن بە بڕیاری ئەو و گێڕانەوەی هەموو کارو بارەکان بۆ لای ئەو.

زۆرترین سەلامەتی خەڵکی لە شەڕ لە ڕێگەی ئارامگرتنەوەیە.. زۆرترین داواکارییان بۆ خێر بەوەیە تەبابێت لەگەڵ ئارەزوویان..مرۆڤ لە زۆربەی نیعمەتەکانـدا پێچـەوانەی شوکرە.. نزیکترین خەسڵەتی خێـر لـە خـوداوە گرانترینیانـە لەسـەر بەنـدە.. گـەر بـە شوکرەوە قبووڵی بکات دەبێتە نزیکترینیان بۆ لای خودا و خۆشەویسترینیان لەلای.

ئەم بەندەیە بە کەمترین کاری چاکەوە ڕجـای بـەزەیی خـودا دەکـات وەك چـۆن بـە زۆرترین کاری چاکەوە ڕجای بە خودای خۆی هەیـە.. لـە خەشـم و تووڕەبـوونی خـودا دەترسێت بە کەمێك لە گوناهەوە وەك چۆن بە زۆرێك لە گوناهەوە لە خودا دەترسێت، هەردوو لای یەکسانە، باشی حەز و خۆشەویستی لە زۆرێك لە کارە چاکەکاندا بەدەست نایەت تا لە کەمێکی کارە چاکەکاندا باشی حەز و خۆشەویستی بەدەست نەهێنێت.

هەروەها وتی: گەر ویستت شتێك لە کار و باری خۆت چاك بکەیت لەسەرت توند و گـران دەبێتـەوە، هەرچـی کاروبـاری خۆبەخشـانەیە(نەوافلەکان) ڕابگـرە و هــەموو سەرقاڵییەکانت بکە بەو شتەی دەتەوێت چـاکی بکـەیت، بـە پشـتیوانی خـودا و گـەر خودا بیەوێت لەسەری کۆمەکی دەکرێیت.

# پلەکانی کارکردن بۆ خودا



هەروەها وتی: خەڵکی لەسەر چوار روو کاردەکەن:

روناکترین و باشترینیان: دەستەیەك کە خودایان پەرست لەسەر بەمەزنڕاگرتنی، بۆیە کارەکانیان باش و چاك و و کردارەکانیان پڕ ڕێز و بەخشندەییە لەسەر رووی مەزنی خودا لە سینەیاندا، هەروەها مەزنی قەدری خودا لە دڵیاندا، بۆیە شتێك نییە خۆشەویستر و بەتامتر بێت لەلایان لەو شتەی لە خودایان نزیك دەکاتەوە.

دەستەیەکی تر لەسەر رووی رەغبەت کاردەکەن، هەروەها سووربوون بۆ جیرانی خودا، هیچ هممەتێکی تریان نییە جگە لە وازهێنان لەوەی نەهییان لێکراوە، بۆ مەزنی پاداشتی و ترسان بە لەدەستچوونی خێرێکی مەزن کە پاداشتێکی مەزنە و بۆ ئەهلی چاکەی داناوە.

دەستەیەکی تر کار دەکەن وەك ترسان لە سزای خودا، بۆیە هەوڵ و کۆشانیان لە رەهبەت لە سزا ئەوانی لە رەغبەتی پاداشت جیاکردۆتەوە، کارەکانیان لەسەر رووی هەڵهاتنە لە سزای خودایی، پاداشت بە دڵیاندا گوزەر ناکات بەهۆی مەزنی ترسەوە لە سینەیاندا، لە ناخی خۆیاندا دەڵێن: گەر کار و کردەوەکانمان بمانگەیەنێت بە رزگاربوون لە سزا ئەوا سەرکەوتنێکی مەزنمان بەدەستهێناوە.

بۆیە بەهۆی زۆری ترسەوە رەغبەت لە دڵیان دەرچووە، بەهەشت بەدڵیاندا گوزەر ناکات بەهۆی مەزنی سزاوە لە سینەیاندا.

دەستەیەکی تر لەسەر رووی حەیا لە خودا (**سبحانە**) کارەکانیان ئەنجام دەدەن.. لە شەو و رۆژیاندا حەیا لە خودا دەکەن، کاتێك دەرگاکان دادەخرێن و پەردەکان دادەدرێنەوە، ئەوەش بەهۆی ئەو یەقینەوە کە خودا پرسیار و دادگایی ئەوان لەدەست دەگرێت.

لە هەرچی ناشیرینێك ئەنجامیان دابێت لە پەنهانیاندا شەرم لە خودا دەکەنەوە، تا وەك ئەوەی تەماشای خودا بکەن.. کاتێك بە سەیرکردنی خودا بۆ ئەوان یەقینیان پەیدا کرد وتیان: یەکسانە لەسەرمان ئەو سەیری ئێمە بکات یان ئێمە سەیری ئەو بکەین.. هەروەها یەقینیان پەیدا کرد کە خودا لە رەگی بناگوێ لە ئەوانەوە نزیکترە.

کاتێك یەقینیان بەوە پەیدا کرد یەقینەکەیان لە گەردیلەیەك و سەنگی دەنکە رەشکەیەك گوناه و ئەوەی خودا پێیناخۆشە جیایکردنەوە، ئەوەش جیایکردنەوە لە هەر باوەڕێکی دڵ گەورەکەیان لای ناپەسەند بێت بە: زانینیان بەوەی خودا ئاگادارە بە نهێنییەکانی ناخ و ویژدانیان، لە هەر جوولە و وەستان و خوتوورە و چاوتروکان و ویست و نیەت و خۆشەویستی و حەزێکدا.

بەڵام ئێمە لە کارەکانماندا بەمەزنڕاگرتنی خودا پاڵمان پێوە نانێت، حەز و رەغبەت بۆ پاداشت نامانجوڵێنێت، تاکو بە کار و کردەوەی باش و جوان لە خودا نزیك ببینەوە، هەر بەو جۆرە ترسان لە سزا وای لێ نەکردین دەست لە کار و کردەوەی خراپ بکێشینەوە، حەیاکردن وای لێ نەکردین کارە ناشیرینەکانی نێوان خۆمان و خودا واز لێ بهێنین.

داوا لە خودای "**المنان**" دەکەین کە منەتی کردووە بەسەرماندا کە منەتی زۆرتر بکات بەسەرماندا بەوەی کردی بەسەر ئەواندا، نموونەی کارەکانی ئەوان بە ئێمەش ببەخشێت، ئەو (**سبحانه**) هەرچییەکی بوێت ئەنجامی دەدات.

هەروەها وتی: صدق لەلای بەندە بەپێی ویست و لێبڕانییەتی، شوکریش لەلای بەپێی قەدری شوێنی نیعمەتەکەیە لەلای.



# ئاکارێکی سەلەفیانە



## یادی دواڕۆژ:

بەناوی خودای رەحمان و رەحیم..ریوایەتکراوە لە هەندێ لە حەکیمانەوە کە نامەیەکی بۆ برایەکی نووسیوە:

سەلامی خوات لەسەر بێت.. پاشان: بیرلەوە بکەرەوە بەجێی دەهێڵیت و بیر لەوەی رووی لێ دەکەیت، وەك یادی کەسێك کە سەرنج دەدات و پەند و ئامۆژگاری وەردەگرێت و ئاگاهی خۆی وەردەگرێت و ترس لە گوناه و خراپە رووی لێ دەکات، پەنادەگرین بە خودا لە مردنی دڵ و بێئاگابوونی لە گرنگی رێنموونی و هیدایەت و ئامادەکاری باش بۆ رۆژی دوایی.

گەر بەندەکان بیریان بکردبایەتەوە و بیانزانیبایە کە هیچ رێگەیەکی تریان لە بەردەمدا نییە جگە لە گەڕانەوە بۆ لای خودا بە شتێکەوە رازیبوونی خودای تێدابێت زانیبێتیان یان نەیانزانیبێت، هەروەها بیانزانیبایە خودا بەئاگایە بەسەر ناخ و پەنهانیاندا، بۆیە نابێت بهێڵن خودا شتێك لە پەنهانیاندا ببینێت لای ناپەسەند بێت، ئەوان دەبێت پەشیمان بن لەوەی لێیان وەشاوەتەوە و رازیبوونی خودای لەسەر نەبووە، لەوەی زانیویانە یان نەیانزانیوە، بۆیە هەر یەکێك لەوانە کە لە پەنهانەوە لە خودا دەترسێت دەست بە کۆشان دەکات بۆ ئەوەی نەزانراوەکەیان بکەن بە زانراو و زانراوەکەشیان بکەن بە کارپێکراو و پەشیمان ببنەوە لەوەی لەدەستیان چووە لەو کار و کردەوە چاکانە.

بزانە، ئەی برام، خودا رزگاری بەندەکانی لە مەعریفەدا داناوە، پاشان لە ویست و لێبڕان و پاشان لە وازهێنان لەوەی فەرمانی بە وازهێنانی کردووە و پاشان کارکردن بەوەی فەرمانی بە کارکردنی کردووە و پاشان شوکری ئەو نیعمەتانەی کە بە سەریدا دایباراندووە پێشتر و ئێستا و لە ناوەوە و لە دەرەوەیاندا.

## ناسینی خودا:

یەکەمین شتێك خودا لە بەندەکانی دەوێت: لەو رووانەوە بیناسن کە خودا خۆی بە بەندەکانی ناساندووە، خودا دروستکردنی بە دروستکراوەکانی خۆی ناساندووە، هەر بەو جۆرە دەسەلاّت و توانینی خۆی بەسەر دروستکراوەکان و لەئەستۆگرتنی رۆزی دروستکراوەکانی و مردنیان و زیندووکردنەوەیانی بۆ ئاشکرا کردوون، بۆ خودا بوون و بڕیار هەیە..**تبارك الله أحسن الخالقين**.

## خوداویستی بە کردار:

لەدوای مەعریفە خودا داوای لێکردوون: لە هەموو کار و کردەوە چاکەکانیاندا تەنها خودایان بوێت و ئەویان مەبەست بێت، کەسی تر لەو کارانەدا نەبینن و پاداشت تەنها لە ئەو داوا بکەن، گەر شتێك هەبوایە بەر لە مەعریفە ئەوا ویست پێشی مەعریفە دەکەوت، گەر بە شتێکی تر لە مەعریفە بێنیاز ببوایە ئەوا ئەو شتە ویست دەبوو.

بۆیە مەعریفە پێش هەموو شتێکە و بنەڕەتی هەموو شتێکە، پاشان "ویست" کە لە مەعریفەوە سەرچاوە وەردەگرێت، ئەوەش بریتییە لە: دەستەبەرکردنی واز هێنان لە نەهیلێکراوەکان و دەستەبەرکردنی فەرمان پێکراوەکان، و وەرگرتن و بەخشین و خۆشەویستی و رق لە هەموو کار و کردەوەکاندا.

مەعریفە سەرپەرشتیاری دامەزرانی سوودی کارکەرانە لە کار و کردەوەکانیاندا.

## شوکری نیعمەت:

شوکر بەپێی مەعریفەیە، کلیلی نیعمەتەکان و باشترین نیعمەت و یەکەمین نیعمەت بریتییە لە نیعمەتی مەعریفە، لەدوای نیعمەتی مەعریفە هیچ نیعمەتێك نابینم مەزنتر بێت لە نیعمەتی ئەقڵ... نیعمەتی "ویست"یش شوکرکردنەکەی زۆر گرانە.

دواین نیعمەت نیعمەتی حیکمەتە، بۆیە سەرئەنجامی خێر داوا لە خودا دەکەین و داوامانە هەموو نیعمەتەکانمان پێ بناسێنێت، و توانای شوکرمان لەسەریان پێ ببەخشێت، هەندێ جار بەندە بە مەعریفە و ویست دەگاتە خێر و نزیکییەك لە خوداوە -**سبحانە وتعالی**- کە خاوەن کار و کردەوەی زۆر بەدەستی ناهێنێت.

## ناسینی ئەوەی خودا پێیخۆشە و لای ناپەسەندە:

دوای ناسینی خودا هیچ شتێك بە ئەندازەی ناسینی ئەوەی خودا لای ناپەسەندە لەپێشتر نییە، ئەوەش بریتییە لە ناسینی ئەو شتانەی خودا نەهی لێکردوون، و لەسەریان هەڕەشەی لێکردوون و ئاگاداری کردوونەتەوە و ترساندوونی.

پاشان ناسینی ئەوەی خودا پێیخۆشە، ئەوەش بریتییە لەو شتانەی خودا فەرمانی پێ کردوون و هانیداون و حەز و هیوای بۆ ئەنجامدانیان پێ بەخشیون.

بۆیە ئەی برام، سەرنج بدە، گەر ڕۆژت لێ بوویەوە هیچ شتێك لەلات گرنگتر نەبێت لە مراندنی خەسڵەتێك لەو خەسڵەتانەی کە نەفست ئارەزووی دەکات و خودا لای ناپەسەندە، ئەو (**سبحانە**) لەجێگەی ئەو خەسڵەتە خەسڵەتێك کە خۆی پێیخۆشە

دەژێنێتەوە، لەپاش ئەوە خێری گەورەتر و گەورەترت بۆ هەیە لەو تێگەیشتن و نووره پەخشبووەی دڵی داگیر کردووی.

بزانە، ئەی برام، هەندێ لە دونیا حەڵاڵ و موباحە و هەندێکی شوبوهات و هەندێکی تری حەرامە.

گەر لە دڵی بەندەدا گرێیەکی زاڵ لە گرێکانی خۆشەویستی حەڵاڵی موباح بوونی هەبوو ئەوا لە کێبەرکێکەرانی شوبوهات و ناپەسەندەکان رزگاری نەبووە.

گەر لە دڵیدا گرێیەکی زاڵ لە گرێکانی خۆشەویستی بۆ شوبوهات بوونی هەبوو ئەوا لە کێبەرکێکەرانی حەرام رزگاری نەبووە، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ریوایەت کراوە، فەرموویەتی: ((هەر کەس کەوتە ناو شوبوهاتەوە خەریکە دەکەوێتە ناو حەرامەوە، وەك ئەو شوانەی ئاژەڵەکانی لە دەوروبەری قەدەغەکراوێکدا دەلەوەڕێنێت خەریکە دەکەونە ناو قەدەغەکراوەکەوە))[١]

هەر کەس شوبوهات لە دڵیدا بنجی داکوتی و پاڵیدایەوە بەلای دەست بۆبردنیانەوە دەکەوێتە ناو حەرامەوە، چونکە شوبوهات لە حەرامەوە نزیکترە تا لە حەڵاڵەوە.

وتم: خەڵکی چی بکەن بۆ بژێوی و ئاتاجییەکانیان؟

وتی: من نەهیم لێ نەکردووی لە کەسابەت و پێویستییەکان و ئەوەی تۆ پێیان ئاتاجی، بەڵکو ئاگادارت دەکەمەوە لە بەدەستهێنانی ئەوەی تۆ پێی ئاتاج نیت، هەروەها نەهیم لێکردی لە خۆشەویستی بۆ شتێك کە پێی ئاتاجی، تاکو لەڕووی ناچارییەوە وەریبگریت و

---

[١] أخرجه أبو داود والترمذي.

بۆخـۆی بـە ناچـاری رووت لـێ بکـات، و تـۆش پێـی زانـا و ئاگاداریـت، دونیـا لـەلای دروسـتکەرەکەی قـەدر و حورمـەتی کـەم و بچـووکە، دەفـەرموێت: ﴿ قُلۡ مَتَٰعُ ٱلدُّنۡيَا قَلِيلٞ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ ﴾ النساء: ٧٧

پێغەمبەری خوداش (ﷺ) دەفەرموێت: ((گەر دونیا لەلای خودا بـە ئەنـدازەی باڵـە مێشوولەیەك بەهای هەبوایە نەیدەهێڵا بێباوەڕ تیایدا قومێ ئاو بخۆنەوە))[١]

بزانە، ئەو کەسەی خۆشەویستی دونیا لە دڵیدایـە و زانسـتی پێـی هەیـە، لـە هـەر کاتێکدا ئەگەری ئەوە هەیە دەست بەسەر دڵیدا بگرێت و بیکات بە موڵکی خۆی، بۆیە لەدوای حەڵاڵ دەست بۆ شوبوهات ببات و لەدوای شوبوهات دەست بۆ حەرام ببات.

بزانە ئەو کەسەی خۆشەویستی دونیا لە دڵیدایە ئەگەر و نەگەرە بەپێی پێویستی روو لەو دوانە(شوبوهات و حەرام) دەکات، بوونی خۆشەویستی دونیا لە دڵی عاریفاندا زۆر لاواز بووە، بوونی خۆشەویستی بۆ دونیا و نەبوونی لە رۆزی بەندە زیاد و کەم ناکات.

بزانـە، بەنـدەکان فـەرمانیان پێکـراوە بـە سـەرقاڵبوون بـە کـارەوە بـەبێ پرسـیار و چەندوچوون، هەروەها فەرمانیان پێکراوە بە ئیخلاص، هیچ کەس ئەم پلەیـە بەدەسـت ناهێنێت تا نەگاتە حاڵەتێك گەر بڕیاربوو ئەوەی تـۆ پێـی ئاتـاجی وازی لـێ بهێنێـت بتوانی وازی لێ بهێنیت.

---

[١] أخرجه مسلم.

## ئافەتی خۆشەویستی پلە و پایە لەلای خەڵکی:

شوبهەیەکی تر کە خودا -**سبحانه وتعالى**- لای ناپەسەندە بریتییە لە حەز و تەماعی تۆ لە پلە و پایە و مەدح و سەنای خەڵکی، و ترست لە بەربوونەوەی مەنزیلەت لەلایان و ئەوەش ئەوەیە کە مەنزیلەتی تۆ لەلای خەڵکی دادەبەزێنێت.

خوداناسان و ئەهلی ویست و لێبڕان پێیان ناخۆشە خودا لە بارێکدا بیانبینێت کە شتێك لە خۆشەویستی دونیا لە دڵیاندا بێت.

مەعریفەکەیان بە خودا هانیدان بۆ بەمەزنڕاگرتنی خودا و هەڵبژاردنی خۆشەویستی گەورەکەیان بەوەی تەماشایان نەکات و شتێکیان تێدا مابێت لای ناپەسەند بێت لە کاروکردەوەکانیاندا، ئەوان ئەوەی خودا پێی ناخۆشە لە خەڵکانی تردا پێیان ناخۆشە، ئەی چۆن رازی دەبن ئەو شتانە لە نەفسی خۆیاندا بوونی هەبێت؟

مەعریفەی خودا رێگە نادات لەگەڵ شتێکدا نیشتەجێ ببێت کە خودا پێی ناخۆشە، "ویست"یش رێگە نادات بە شتێکەوە سەرقاڵ ببێت جگە لەوەی خودا خۆشیدەوێت، مەعریفە سەرقاڵی کردوون بە بیرکردنەوە لە نیعمەتە بێپایانەکانی خودا لەسەر ئەوان و دەستەوسانییان لە جێبەجێ کردنی شوکری ئەو نیعمەتانە، لەگەڵ دەستەوسانی لە هەژمارکردنیان، بەهۆی بە گەورەزانینی گوناهەکانیانەوە و زۆر یادکردنەوەیان لەوەی حەیا رێگەیان بدات داوای بەهەشت لە خودا بکەن، بۆیە بەهەشت و داوای بەهەشت بە بیریاندا نایەت، شەرم و حەیا لە خودا و ترسان لێی رێگەی بڕیوەتەوە لەوەی داوای بەهەشت لە خودا بکەن، موسیبەتی ئەوان لە نەفسیاندایە کە دەترسن رەزامەندی خودایان لەدەست بدات، و خەشم و تووڕەیی خودایان بەسەردا دابارێنێت، ئەمانە لە

دڵیاندا مەزنترە و بەئێشترە لە لەدەستدانی بەهەشت و ترسی ئاگر، هەروەها ترسیان لەو خەیاڵ و ختووراتانە هەیە کە شەیتان بۆیان هەڵدەدات، هەر بەو جۆرە پێشهاتەکانی دونیا و خۆشەویستی خۆڕازاندنەوە لای ئەهلی دونیا بە عیبادەت و کارە چاکەکانیان، هەروەها ترس لە زۆری تێکچوونی نیەت و ئەو ئافەتانەی رووبەڕووی دەبنەوە، ئەوان لەناو ئەمانەدا نوقمبوون و سەرقاڵ و دەستەویەخەن، لە ترسی ئەوەی خودا لە شوێنێکدا بیانبینێت کە بە کارەکانیان خۆیان لای خەڵکی جوان کردبێت.

بۆیە ئەی برام، لە هەموو شتێك زیاتر گرنگی بە مەعریفە و ویست بدە، چونکە خێر بەدوای ئەوانەدا دێت، ئەو دوانە نیشانە سەیرکردنی پڕ رەحمەتی خودان بۆ بەندەکەی، کۆمەك هەر بە خودایە.

## بیستن و ژنەوتن لە خوداوە:

پاشان وەسێتت بۆ دەکەم، ئەی برام، بە چاودێری خودا لە پاڵ هەر ویست و هەوڵێکدا کە پێی هەڵدەستیت، هەروەها لە پاڵ هەر جووڵە و وەستانێك لە تۆوە: لە خوداوە گوێبگرە، لە خوداوە بژنەوە، ئەم قورئانەی بۆمان دابەزێنراوە بەیانکەری هەموو شتێکە و زانستی هەموو شتێکە.

سەرقاڵی تێڕامان و وردبوونەوە ببە لێی بە شەو و بە رۆژ، هەوڵی تێگەیشتنی بدە و کاری پێ بکە، یەکەمجار گوێ بۆ ئەم ئایەتە بگرە: ﴿ وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُواْ مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرَ ﴾ یونس: ٦١

بێئاگـا مەبـە لـە چـاودێری ئـەو كەسـەی لـە گەردیلەیـەك گـەورەتر و بچـووكتری لا بـزر نابێـت، لێـی تێـر مەبـە و لێـی شـەكەت مەبـە، خـودای موتـەعال هیچـی لـیّ بـزر نابێـت، تەماشـات دەكـات و سـەیری نـاخ و پـەنهانت دەكـات، بـە كێشـی گەردیلـە و دەنكـە رەشـكە لەسـەرت دەنوسـێت، تـا لەسـەر ئەوانـە پاداشـتت بداتـەوە، خـودای موتـەعال دەفـەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾ ﴾ النساء: ٤٠

## كەماڵی چاودێری:

بزانە، ئەی برام، هەر شتێك چاك و باش دەبێت بە شتێكی پێش ئەو شتە و شتێكی دوای ئەو شتەوە بەستراوەتەوە.

ئەوەی پێش چاودێری دەبێتە هۆی باشكردن و چاككردنی چاودێری بریتییە لە: دابڕان و یەكلابوونەوە بۆ خودا و پابەندبوون بە گوێڕایەڵی خوداوە و چاودێری خودا لە نهێنی و ئاشكرادا.

ئەوەی دەكەوێتە پێش دابڕان و یەكلابوونەوە بۆ خودا و باش و چاكی دەكات چوار شتە: تەوبەكردن، هەڵبژاردنی ئەوەی خودا خۆشیدەوێت بەسەر ئەوەی لای ناپەسەندە، هەروەها هۆگری بە خەڵكەوە بەهۆی خوداوە و بە هۆگری بە خوداوە، دڵخۆش نەبیت بەوەی لە دونیا بۆت زیاد دەكرێت، و دڵتەنگ نەبیت بەوەی لە دونیا لێت دەگرێتەوە، ئەوەش پلە و پایەی ئەهلی وەرع و قەناعەتە.

ئەوەی لەسەر ئەو رێگەیە بەهێزت دەكات بریتییە لە: بەڕاستزانینی بەڵێنەكانی خودا

-**سبحانه وتعالی**-و متمانە بە هاتنەدی ئەو بەڵێنانە و رجای ئەوەی لەو بەڵێنانەوە تۆ بێنیاز دەکات و پێویستی خێرایی گواستنەوە لە دونیاوە.

هەڵبژاردنی ئەوەش خودا خۆشیدەوێت بەسەر ئەوەی خودا لای ناپەسەندە: هیچ کەس لە ئەو (**سبحانه**) لەپێشتر نییە بەو رازیکردنە، ئەوەش هەڵبژاردنی خۆشەویستی خودایە بەسەر ئارەزووی خۆتدا، فەرزە لەسەر پشتهەڵکەران و هەڵهاتووان بگەڕێنەوە بۆ لای خودا و لەگەڵی مامەڵە بکەن، ئەی چۆن ئەو کەسەی ئالوودەی نزیکی بووە بە خوداوە و بۆ ئەو دابڕاوە و یەکلا بوەتەوە خودا هەڵنابژێرێت بەسەر شتەکانی تردا؟

هۆگری بە خوداوە: ئەوەیە کە هۆگریت بە خوداوە زۆرتر و زیاتر بێت لە هۆگریت بە دروستکراوەکانییەوە، هەر کەس خودا و لوتفی خودا و زۆری بەخشین و حیکمەت و چاکە و بەزەیی و فەزڵی خودای ناسی پێیەوە هۆگر دەبێت.

بەندە چۆن چاودێری کەسێك دەکات کە نایناسێت؟ چۆن خۆی بۆ کەسێك یەکلا دەکاتەوە و بۆی دادەبڕێت کە متمانەی پێی نەبێت و هۆگری بە ئەوەوە نەبێت؟

ئەوەی کە شتەکان جوان دەکات لەدوای ئەوە بریتییە لە شوکر: شایەتی دەدەم گەر ئەوەی دەیخوێنی تێیبگەیشتبای و ئەم مەنزیلەت بویستبایە ئەوا بە چاوی دڵتەنگان و ترساوان تەماشات دەکرد نەبادا قبوڵت نەکات و ویست و ناخ و پەنهانت بە پیس تەماشا بکات و لە دەرگای خۆی تۆ بگەڕێنێتەوە و خەڵکانی تر بچنە پێشەوە و تۆش هەر لە دەرگاکەدا وەستابیت.

## پەندوەرگرتن:

لە هەموو کار و بارەکانتدا پەنا بۆ پەندوەرگرتن ببە، کارەکە هێشتا لە تۆ شاراوەیە و بزر و نادیارە، گەر وەك کەسێکی پەندوەرگر تەماشات کرد ئەوا خەریکە پەندوەرگرتن وەك هەواڵدەرێکی بەرچاو راست ببێتەوە و ئەوەی لێت شاراوەتەوە بۆت ئاشکرا بکات، ئەو کات تەماشای جوانی و ناشیرینی، باشی و خراپی کار و بارەکان بکەیت، بزانیت لە کوێوە چاکە بووە بە چاکە، و خراپە بووە بە خراپە، ئەو کات شوێنپێی ئەوە هەڵبگریت رزگاری تۆی تێدایە و لەوە دووربکەویتەوە سەرت تیادەبات، بە پەندوەرگرتن لە ئاوازی قسەدا خەڵکی بناسیت بەپێی ئاستەکانیان، خۆیان و مەنزیلەکانیان و مەزهەبەکانیان بە نووری پەندوەرگرتن و ئیلهامی بەخشراوی خودا- بە کۆمەکی خوداوە- بناسیتەوە.

## میانەگیری و لێبڕان:

ئەی برام، میانەگیری و لێبڕان لە هەموو کار و بارەکانتدا پێویستی سەر شانی تۆیە، میانەگیری باشترین کارێکە بۆ دامەزراوی و سەلامەتترینیانە لە ئافەت، لێبڕانیش لە کاتی تەنگانەدا سوود بە خاوەنەکەی دەگەیەنێت و لە کاتی هەرزانی و خۆشیدا زیانیان پێ ناگەیەنێت.

هەتا دەتوانی با مەعریفەت زۆرتر و زیاتر بێت، مەعریفە وەکو کار نییە، کار سنوورێکی بۆ هەیە و لەو سنوورەدا کۆتایی پێ دێت، بەڵام بۆ مەعریفە و رادە و سنوورێك بوونی نییە تیایدا کۆتایی بێت، چونکە تۆ دەتەوێت بە مەعریفە

فەرمانەکانی خودا کامڵ و تێر و تەواو بکەیت، دەتەوێت بە مافی خودا لەسەر خۆت هەڵبستی، هەرچەند کەس ناتوانێت بە تەواوی مافی خودا لەسەر خۆی جێبەجێ بکات، چونکە خودا مەزنتر و شکۆمەندترە لەوەی مرۆڤەکان بگەنە حەقیقەتی پێدانی مافی ئەو (**سبحانە**).

لەگەڵ ئەوەش بەهۆی زۆری و کەمی مەعریفەوە جیاوازی لە جێبەجێ کردنی مافی خودا لە نێوانیاندا هەیە، لەگەڵ مەعریفە و هۆگریدا، ئارامی و ئاسوودەیی و دڵخۆشیدا، زیادبوونی هەموو ئەوانە نیعمەتێکە لە خوداوە و کەمبوونەوەیان سزایەکی خودایە بەهۆی گوناهێکەوە یان بەهۆی تیابردنی شوکرەوە.

## خۆت لە گوناهی بچووك بپارێزە و خێری بچووك بە کەم مەزانە:

خۆت بپارێزە لەوەی خودا لای ناپەسەندە لە نیەت و کردارەکانتدا، لە پەنهان و نهێنی و ئاشکراتدا، لە گوناهی بچووکدا، وەك چۆن لە گوناهی گەورە خۆت دەپارێزی، هەموو ئەوەی لە دەستت دەچێت گەردیلەیەکە بە خودا پێشکەشت کردووە و سەد هەزار دینارت لەدەست دەدات.. هەموو دونیا وەك ئەو گەردیلەیە کە لە دەستت چووە، لە دەستچوونەکەیان یەکسانە و هیچ فەزڵ و گەورەییەك لە نێوانیاندا نییە.

پاشان هەر بەو جۆرە لە هەموو کار و بارەکانی تردا، تێکچوون روو لە زۆرەکەی دەکات وەك چۆن تێکچوون روو لە کەمەکەی دەکات.

خێری بچووك بە کەم مەبینە و لات خۆش و شیرین بێت، وەك چۆن خێری گەورەت لا خۆش و شیرینە، هەردوو وەك یەك حەزلێ بکە، چونکە وەك چۆن زۆر لە بەندە

قبوولّ دەکرێت کەمیش قبوولّ دەکرێت و قبوولّ کردنەکە یەك قبوولّ کردنە، هەر بەو جۆرە لە سەرجەم کار و کردەوەکانی تردا.

کاتێك خودا بچووك لە بەندە قبوولّ دەکات بەو قبوولّ کردنە سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت، لەگەلّ ئەوەی کە هەموو کار و کردەوەکانی مرۆڤ بچووکن، مەگەر ئەوەی کە خودا قبوولّی کردبێت، کاتێك شتێك لەو کارانە قبوولّ دەکات دەبێت بە کارێکی مەزن، با بەر لەوەش بچووك بوو بێت.

بزانە کارە بچووکەکان ئەنجامدانیان سەلامەتترە لە گەورەکان لە ریا و خۆپەسەندی و منەتکردن، ئاگاداری ئەمە بە و لێی بێئاگا مەبە.

بزانە لە کارەکانتدا ویست و هیوا و ئاوات بوونی هەیە، تەماشای ویستی خۆت بکە لە هەموو کار و کردەوەکانتدا، وەك ویستی ئەهلی شوکر و رازیبوون، هیوا و ئاواتیشت وەك هیوا و ئاواتی ئەوانەی زیادەڕەوییان کردە سەر نەفسی خۆیان، هیچ شتێك لەلای ئەهلی رازیبوون خۆشەویستتر نییە لەوەی کارێك ئەنجام بدەن خودا لێی رازی بێت، هەر بەو جۆرە هیچ شتێك لەلای ئەهلی شوکر خۆشەویستتر نییە لە کارێك شوکری خودای لەسەر بکەن، هیچ شتێك لەلای ئەوانەی زیادەڕەوییان کردۆتە سەر نەفسی خۆیان بە ئەندازەی ئەو کارە شیرینتر و خۆشەویستتر نییە کە رجای لێخۆشبوون و لێبووردنی خودای پێ دەکەن.

بزانە، من لە کەمی کار و کردەوە باشەکان ناترسم بۆ تۆ و هاوشێوەکانی تۆ، بەلاّم لە کەمی مەعریفە و لاوازی ویست بۆ ئێوە دەترسم.

لە کەمی کارە خۆبەخشییەکان(سوننەت و نەوافل) ناترسم بۆ ئێوە، لە وەرعکردن ناترسم بۆ ئێوە وەك چۆن خەڵك تەماشای دەکات ئێوەش هەر بەو جۆرە بن، یان واز لە حەزێك نەهێنیت خودا بۆتی حەلاڵ کردووە و کەسانی تر جگە لە تۆ لەبەر خودا لێی بکشێنەوە، بەڵکو من لە تۆ و هاوشێوەکانی تۆ دەترسم: بچنە ناو کارێکەوە و لەگەڵ کارێکدا دەستەویەخە بن خودا لای ناپەسەندە و سوود و قازانجێك بە تۆ ناگەیەنێت، کارێك لە خەڵکی شاراوەیە و لای خودا ئاشکرایە، ئەو کات هەموو ئەوەی تۆ ویستووتە لێت تێکبدات، یان وا ببینیت تۆ فەزڵ و گەورەیت بەسەر خەڵکیدا هەیە، ئەو کاتە هەموو ئەوەی تۆ لە ناویدا دەژیت لێت تێکەڵ بن.

لەوە دەترسم نەتوانی پارێزگاری لیٚ بکەیت، وەك چۆن هەستای بە زانستەکەی، ئەو کات هەموو ئەوەی تۆ لەناویدای و بینات کردووە وێران ببێت، یان نەتوانی ئەو شوکرەی لەسەرت پێویستە بۆ کارەکانت جێبەجێی بکەیت، ئەو کات بەهۆی کوفر کردن بە نیعمەتەوە ببیت بە کەسێکی زەمکراو زیاتر لەوەی بەندەیەکی حەمدکراو بیت لەلای خودا بەهۆی کار و کردەوە باشەکانتەوە.

یان کار و کردەوەکانت بە زۆر بزانیت و بەهۆیانەوە منەت بەسەر خودادا بکەیت و ئەوەش بەرتبداتەوە لەبەر چاوی خودا -**سبحانه وتعالی**-

یان بەو کارانە منەت بەسەر یەکێکدا بکەیت، یان کەسێك بەهۆیانەوە ئازار بدەیت، ئەوەی خودا -**عز وجل**- فەرموویەتی زانیوتە کە دەفەرموێت: ﴿ **يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ كَٱلَّذِي يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفۡوَانٍ عَلَيۡهِ تُرَابٞ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٞ فَتَرَكَهُۥ صَلۡدٗا** ﴾البقرة: ٢٦٤

لەوانەیە لێببڕێت بۆ کارێك کە ویستوویەتی و نەیبینێتەوە، وەك ئەوەی بەبێ لێبڕان دەیبینێتەوە.

## کەماڵی لێبڕان:

وتم: ئەی ئەو کەسە چۆنە کارێك لەو شتانەی پێیخۆشە رووی لێ دەکات بەبێ داوا و لێبڕان بۆی، هەتا دەترسم لێبڕانەکەی دژ بە ئەو بێت نەك بۆ ئەو بێت؟

وتی: ئەمە لەوانەیە کەوتمان: شتێك چاك نابێت بە شتێك نەبێت لە پێشییەوە و شتێك لە دواوەی، گەر بە مەعریفەوە لێ نەبڕێت سەرئەنجامەکەی ئەوەیە کە باسم کرد.

**مەعریفە:** ئەوەیە کە سەرەتاکەی(هەنگاوی یەکەمی) بە ئاتاجی و نیشاندانی هەژاری بۆ خودا دەست پێ کردبێت، لەو کەسانە نەبێت دەیانەوێت فەرمان بەسەر خودادا بکەن و شتی لەسەر واجب بکەن.

**تەوەکول:** بە هەست پێکردنی دڵی لە رادەست کردنی هەموو قەدەرەکان بۆ لای خودا -**سبحانه وتعالى**- تەنها بیێتەوە و خۆی لە هەوڵ و هێزی خۆی بهێنێتە دەرەوە، ئەم ئایەتە پیرۆزەت گوێ لێبووە کە دەفەرموێت: ﴿ **وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىۡءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ** ﴾الكهف: ٢٣ – ٢٤، ئەوە زیادەیەکە لەسەر تەوەکول و فەرمانێکە و خودا فەرمانی پێکردوویەت، هەروەها﴿ **وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ** ﴾آل عمران: ١٥٩، راوێژپێکردن لە پێویستییەوە نەك لە بێنیازییەوە، خودا فەرمانی کردووە بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کۆمەکی پرس و راوێژ وەربگرێت لە کەسانێك وەك ئەو نین و لە دوای ئەویش ببێت بە سوننەتێك بۆ کەسانی تر.

ئەی دەبێ نموونەی وەك من و تۆ چی بکات کاتێك لە خودا بێئاگا دەبێت لە شتێکدا کە تەنها گەردنکەچبوون و پاڕانەوە و گەڕانەوە بۆ لای خودا چارەسەری دەکات.

گوێت لەو ئایەتە پیرۆزە بووە لە چیرۆکی یەعقوبدا (**علیه السلام**) کە دەفەرموێت: ﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۖ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ﴾ یوسف: ٦٧، بۆیە سەرئەنجامی یەعقوب بریتی بوو لە تەواوی ئەو شتانەی کە دەیویست.

هەروەها فەرموودەکەی یوسف (**علیه السلام**) لە قورئاندا: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِ ۖ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٣٣﴾ فَٱسْتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ ﴾ یوسف: ٣٣ - ٣٤

خودا ئەمرەکەی بۆ تەواو کرد کاتێك یوسف (**علیه السلام**) نەفسی خۆی لە توانین و هێز و هەوڵی خۆی هێنایە دەرەوە و دانی نا بە ئاتاجی و هەژاری خۆیدا و کارەکانی خۆی رادەستی پەروەردگار کرد.

ئایەتێکی تر لە قورئاندا: ﴿لَئِنْ أَنجَيْتَنَا مِنْ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٢٢﴾﴾ یونس: ٢٢، داوایان لە خودا کرد، بەڵام ئەمرەکەیان رادەستی خودا نەکرد، نە پێش داواکردنەکە نە دوای داوا کردنەکە، فەرمووی: ﴿ فَلَمَّآ أَنجَىٰهُمْ إِذَا هُمْ يَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾ یونس: ٢٣، خودا ئەمرەکەی بۆ تەواو نەکردن.

هەروەها لە قورئاندا: ﴿لَئِنْ ءَاتَيْتَنَا صَٰلِحًا لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٨٩﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحًا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَا ﴾ الأعراف: ١٨٩ – ١٩٠، پاشان سەرنجی قسەی مرۆڤ بدە کاتێك رۆیشتە پێشەوە بۆ هەڵگرتنی کۆڵی ئەمانەت بەبێ نیشاندانی هەژاری و گەردنکەچ

بوون، بۆیە کارەکەی بۆ تێر و تەواو نەبوو، بە نەزانی و ستەم تانەی لێدرا ﴿ **إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾** ﴾ الأحزاب: ٧٢

عەزم چ قازانجێکی هەیە بۆ کەسێك کە هیچ شتێکی بەدەست نییە؟



# حیکمەتی دەگمەن



وتی: هەر کەس زانا نەبێت بەوەی لەلای خوداوە رووی لێ دەکات خەریکە نادان دەبێت بەوەی لە ئەوەوە روو لە خودا دەکات.

بزانە، ئەی برام، هەر کەس گوێڕایەڵی خودا بکات و لێی نەترسێت ئەوا لە کاردا گوێڕایەڵی خودای کردووە و لە وازهێنان لە ترس لێی یاخی بووە، ئەی دەبێ حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت لێی یاخی دەبێت و لێی ناترسێت؟

هەروەها وتی: گەر لە دونیا تەنها خۆراکەکەت وەربگریت، بەڵام بەو کارەت مەبەستت خودا نەبێت، ئەوا بەوە لە خودا دادەبڕێیت، گەر خۆراکەکەت لە دونیا واز لێ هێنا بەو کارەت مەبەستت خودا نەبوو دیسان لە خودا دادەبڕێیت.

هەروەها وتی: گەر دوو شتت لە خودا تێبگەیت بە شوکری مەزنەوە مامەڵەت لەگەڵ خودا دەکرد، بەوەی داوای بەهەشتی نەبەستۆتەوە بە وازهێنان لەوەی پێی ئاتاجی لە دونیادا، هەروەها رووکردنە دۆزەخی نەبەستۆتەوە بە داوای پێویستییەکانت لە دونیادا.

- نیعمەت بناسەوە دەبیت بە ئەهلی ئەو نیعمەتە، ئاژەڵان بۆنی میسك ناکەن با هەموو کونەلوتیشی پڕ بکەیت لە میسك.

- لە رۆڵەکانی حەق بە، خودای حەق خۆشیدەویت.

- نەفسی خۆت بکە بە شوێنکەوتەی هیدایەت، مەیکە بە پێشەوای رێگەی ئارەزووبازی.

- لە ئارەزوویەك کە نامێنێتەوە و لە پەشیمانییەك کە کۆتایی پێ نایەت خۆت بپارێزە.

- ئەوەی ئەمڕۆ هۆگری تۆیە سبەی لە گۆڕدا هـۆگری تۆیـە، کردارەکـانی ئـەمڕۆت کردارەکانی سبەینێیە، سەرنج بدە بزانە هۆگری کێی و کار و کردەوەکانت چین.

- لـە کـاتی ئـارەزوودا خـودا بپـارێزە، ئـەویش لـە کـاتی بەیـەکتر گەیشـتنەوەدا دەتپارێزێت.

- پەنابگرە بە خودا لە کارێك ڕواڵەتەکەی گوێڕایەڵی خودایە و نـاوەوەی یاخیبوونـە لە خودا.

- حەق دەستەبەری هەموو سرورێك دەکات و باتڵیش هیچ بەشـێك لـە دوارۆژدا بـۆ خاوەنەکەی ناهێڵێتەوە.

- هەر کەس بزانێت چی لەبەردەمیدایە ئەوەی لـە دەسـتیدایە کـەم بایـەخ تەماشـا دەکات.

- کاتێك مـەعریفەی کەسێك بـە دونیـا کامـڵ دەبێـت سـەری لـە ڕۆڵـەکانی دونیـا سوڕدەمێنێت، گەر لە مەعریفەی دوارۆژیش کوێر بوو لە ڕۆڵەکانی دوارۆژ سەری سوڕ دەمێنێت.

- هەر کەس دونیا بناسێت لێی دادەبڕێت، هـەر کـەس نەیناسـێت بـۆ دونیـا خـۆی یەکلادەکاتـەوە، هـەر کـەس دوارۆژ بناسـێت بـۆی یـەکلا دەبێتـەوە و هـەر کەسـیش نەیناسێت لەدوارۆژ دادەبڕێت.

- کەمترین حەزی بەسوود بۆ تۆ لە دونیادا زیانبەخشترینیانە لە دوارۆژدا، کەمترین ئارەزووی زیانبەخش لەم دونیایەدا خراپترینیانە لە دوارۆژدا لەسەر تۆ.

- چەندە کارەکە ئاسانە لەسەر کەسێك کە بە نەفسی خۆی لەبەر خودا لە پێشبڕکی کردنی ئەهلی نەفسپەزێری دونیا خۆیان بەدوور بگرن، ئەو بەو کارەی بەرز دەبێتەوە بۆ ئەو ترۆپکەی خۆشەویستان لێیەوە بۆ لای نزیکی لە خوداوە بەرز دەبنەوە.

- هەڵبژاردنی بەندایەتی بۆ بەندە شیفایە و فێنکی دڵ و دەروونە و رۆشنکەرەوەی چاوانە.

- داوای بەندە بۆ ئازادی رەها بەڵایەکە چاوی مرۆڤ کوێر دەکات.

- ئەو کەسەی کار دەکات و سەرنج دەدات و تێدەگات کارەکەی لەسەر خۆشەویستییە، و ئەو کەسەش کار دەکات و دەبیستێ و سەنج نادات کارەکەی لەسەر جەستە قورسییە، وەك ئەو کەسە کار بکە دەبیستێ و تێدەگات و سەرنج دەدات و دەبینێت، وەك ئەو کەسە کار مەکە دەبیستێ و سەرنج نادات.

- لەوانەیە نیعمەتێك بگۆڕێت بۆ سزا و نەقمەت، و لەوانەشە سزایەك ببێت بە نیعمەت.

- گەر ویستت شتێکت خۆشبوێت زۆر یادی بکە، چونکە یاد و لەبیرچوون کۆنابنەوە.

- چاکەی راستگۆیانەی شوکرکراو لە رۆژی دواییدا خاوەنەکەی پاداشت دەدرێتەوە، لە دونیاشدا بۆی زیاد دەکات، بۆی زیاد دەکات بە شوکر و پاداشت دەدرێتەوە بە صدق.

- لە بەسوودترین بەندایەتی ئەو بەندایەتییەیە بەندە مامەڵەی نەفسی خۆی بکات بە کەم تەماشا کردنی دونیا لەلای.

- **لە باشترین عیبادەت:** دڵی بەندە پڕ ببێت لە خۆشەویستی گوێڕایەڵی و ملکەچی بۆ خودا، کاتێك ئەو گوێڕایەڵییە لە دڵ سەردەکات بەسەر ئەندامەکاندا بە ئەندازەی سەرکردنی لە دڵەوە، لەوانەیە ئەندامەکان لە عیبادەتدا بن و دڵ لە بەتاڵیدا.

بەندایەتی دڵ بەبێ ئەندامەکان چۆنە؟ چۆن دڵ بە عیبادەت پڕ دەبێت و دەڕژێتە سەر ئەندامەکان؟

وتی: کاتێك دڵ ببێت بە دەفرێك بۆ خەم و دڵتەنگی، و ئاتاجی و هەژاری بۆ خودا و ترسان لە خودا، هەروەها پەشیمانی و تەوازوع و هەڵهاتن و پەنابردن بۆ لای خودا -**عز وجل**- هەروەها نەصیحەت بۆ خودا و خۆشەویستی بۆ ئەوەی خودا پێیخۆشە و رق لەو شتەی خودا رقی لێیەتی.

گەر بە دڵ لەسەر ئەمە مامەڵەی خودای کرد ئەندامەکان گەشە دەکەن بەپێی ئەوەی لە دڵ دەیبینن، بۆیە لەسەر گوێڕایەڵی دەژێنەوە، ئەوەش کاتێك لە دڵەوە سەرهەڵدەدات کە ئەوەی دواڕۆژ دەیهێنێت تێکەڵ بە قوڵایی دڵی بووبێت.

دەروازەیەکی تر: ئەوەیە دڵی بە نیعمەتەکانی خودا -**عز وجل**- پڕ بووبێت و سرور و هۆگری بە خوداوە بێت و عیبادەتی بۆ ئەو بێت، شەوقی بۆ لای ئەو شتە بێت خودا خۆشی دەوێت، خۆشەویستی بۆ لای شوکری خودا بێت و رجای بۆ لای لێخۆشبوونی خودا بێت.

گەر لە دڵەوە بەمانە مامەڵەی خودای کرد تامەزرۆ دەبێت بۆ عیبادەتی ئەندامەکان لەگەڵی، بۆیە دەبێت بە کارکەر و کارەکەشی هۆگری و سرور و شیرینی دەبێت.

- باشترین عیبادەت ئەوەیە چاودێری خودا بکەیت بەو شتەی خودا پێیخۆشە، گەر لەوە خاوبوویەوە چاودێری بکە بەو شتانەی لای ناپەسەندە، بەڵکو لەوێوە بەرز ببیتەوە

بۆ حاڵەتەکەی یەکەمت کە لەسەری بوویت، لەسەر ئەوە سوور و کۆڵنەدەر بە ئەو کات سۆزێکی توندت بۆی لەلا دروست دەبێت، ئەو کاتێك تۆ دەبینێت سۆز و حەنین و لێبڕانت بۆ ئەوەی یەکەم هەیە ئەوەی لێی وەرگرتووی بۆت دەگێڕێتەوە.

وتی: لەم بابەتە و ئەوەی پێشتریش و لە هەموو کار و کردەوەکاندا، لەسەر کارکەر پێویستە ئەوەی لەسەر دڵە و ئەوەی لەسەر ئەندامەکانە لێیان تێبگات و بیانژنەوێت، سەرەتا لە ئەوەی لەسەر دڵە دەست پێبکات، پاشان ئەوەی لەسەر ئەندامەکانە...دڵ قەدە و بنەڕەتییە و ئەندامەکان لقوپۆپن، لقوپۆپەکان تەنها بە بوونی قەدەوە خۆیان رادەگرن.

هەروەها وتی: باشترین ئەخلاق ئەوەیە ناخ و ناوەوەی بەندە تەوازوعی تێدا بێت، باشترین کرداریش ئەوەیە چاکە بکەیت لەگەڵ کەسێك خراپەی دەرحەق کردوویت.

- بکۆشە و بێهیوا مەبە، لە کاتی باس و یادی صاڵحاندا مەڵێ: گەر گوناهەکانم نەبوایە، منیش هیوای گرتنەبەری رێگەی صاڵحانم هەبوو، چونکە یادی گوناهەکانت لە ئەنجامدانی کار ساردت دەکەنەوە، خاوەنی کۆڵی قورس لەپێشترە بە کۆشان بۆ بەربوونەوەی ئەوەی هەڵیگرتووە لەو کەسەی کۆڵێ سووکی پێیە و وادەزانێت هیچی هەڵنەگرتووە.

- گەر دەتەوێ خودا بە رەحمەت سەرنجت بدات بە خۆزگە پێخواستنەوە سەرنجی صاڵحان بدە و بە بەزەییەوە سەرنجی گوناهباران بدە.

- گەر گرنگیدان بە نەفس کەوتە ناو دڵی بەندەوە ترسی زۆری بۆ ئەو نەفسە لا دروست دەبێت، رجای[1] بە خەڵکی گەورە دەبێت، کاتێکیش دڵ لە خەمی نەفس

---

[1] هیوای خێر و گومانی باش بە خەڵکی.

خاڵی دەبێتەوە گومانی باشی بە نەفس بۆ دروست دەبێت و رجای زۆری بە ئەو نەفسە لا دروست دەبێت، و ترسی لە خەڵکی بۆ دروست دەبێت[١].

- هەر کەس زۆر بیر لە چوار شت بکاتەوە دڵتەنگی و خەمی بۆ دروست دەبێت، هەندێکیان سەردەکێشن بۆ هەندێکیان، هەر خەسڵەتێك لەوانە بێنیازکەرە لەوانی تر: گەر بیرت کردەوە لە زانستی خودا بە خۆت، و ناوەکەت لە **"أم الكتاب"**دا لە کوێ نوسراوە، و ژیانت بە چی کۆتایی دێت، و بیر بکەیەوە لە گوناهەکانت.

- هەر کەس بە زۆری بیر لە چوار شت بکاتەوە ترس و لەرزینی لە خودا بۆ دروست دەبێت: هەندێکیان سەردەکێشن بۆ هەندێکی تریان، هەر یەکێك لەوانە بێنیازکەرە لەوانی تر: کەسێك بیر لە مردن بکاتەوە، و بیر لە خێرایی تێپەڕینی تەمەن بکاتەوە، و بیر لە سەرئەنجامی بۆ ناو گۆڕ بکاتەوە، و بیر لە وەستان و دادگایی و ئاگر بکاتەوە کە هیچ کەس ناتوانێت ئارامیان لەسەر بگرێت.

- کێبەرکێ مەکە لەگەڵ خودا لە خۆشویستنی خودادا، چونکە ئەو کات وەك کەسێك بیەوێت زاڵ بێت بەسەر خودادا مامەڵەت کردووە.

- هیچ کەس بەسەر خودادا هەڵمەبژێرە، چونکە رەوانەت دەکات بۆ لای ئەو کەسەی هەڵتبژاردووە.

- تاکەی سەرقاڵی و لەگەڵ ئەوەش بە کۆمەك و یارمەتی دەزانیت؟

- گەر واز لەوە نەهێنیت تووشی هەڵدێرت دەکات، ئەو کەسانەی دەیانەوێت گومڕات بکەن و فریوت بدەن رووت لێ دەکەن.

---

[١] دەترسێت خەڵکی نەگەنە ئەوەی ئەو پێیگەیشتووە.

- گەر ویستت صەدەقەیەك یان چاکەیەك بەناو خەڵکیدا دابەش بکەی، یان بەناو کەسانی نزیك بە خۆتدا دابەشی بکەیت ئەوا لەوانەوە دەست پێ بکە کە لە تۆوە نزیکن و پاشان ئەوانەی بەدوای ئەوانەدا دێن، باسی صەدەقەکەت بۆ ئەو کەسانە مەکە لە تۆوە دوورن یان بێنیازن لە صەدەقەکەت.

ئەی برام، مەنزیلەتی خۆت لە خودا نزیك بکەرەوە، هەژاری خۆت بۆ خودا دەرببڕە چاکەی خودا بە تۆ دەگات لەگەڵ ئەوانەی یەکەمجار چاکەیان لەگەڵ دەکرێت، تێبگە، ئەی برام، گەر دەتەوێ تێبگەی.

- گەر کۆمەڵێك بەندەت هەبوو ویستت هەندێکیان ئازاد بکەیت، ئایا لەوەیانەوە دەست پێ ناکەی کە رەوشت و ئاکاری لە هەموویان جوانتر بووە و لە هەموویان گوێڕایەڵتر و خزمەتکارتر بووە؟

- تۆ گەر واز نەهێنیت لەوەی خودا پێیناخۆشە خودا لای ئەوانە باست ناکات کە خۆشیدەون.

- ئەوەی خودا تۆی لێ بێنیاز کردووە بیبەخشە خودا شتێکت پێ دەبەخشێت کە لێی بێنیاز نیت.

- هەر کەس نزیکی لە خوداوە دەوێت با واز لەو شتانە بهێنێت لە خودا دووری دەخەنەوە.

- بینینت بخە بەردەمت، ئەوەی لە دواتەوەیە ئەنجامت داوە.

- تۆ گەر ئەو کەسەت ببینیبایە کە بەشی خۆی لە دوارۆژ فرۆشت لەپێناو بەشی خەڵکی لە دونیادا ئەوا سەرت سوڕ دەما، بۆیە تۆ بەشی کەسانی تر لە دونیا لەپێناو بەشی خۆتدا لە بەهەشت بفرۆشە، ئەوەی لە تۆ دەمێنێتەوە رۆزی کەسانی ترە.

- ترسی دونیا واز لێ بهێنە ئاسایشی دوارۆژ بەدەست دەهێنیت، ئاسایشی دوارۆژ بە ترسی دونیا بەدەست بهێنە.

- گەر حەزێکت بۆ هاتە پێش بیر لە سەرئەنجام بکەرەوە، زۆرن ئەو گوناهانەی چێژەکەیان ڕۆیشت و پەشیمانییەکەیان ماوەتەوە.

-ئەو شتەی دوارۆژ لە تۆ تێکدەدات ئەو شتەیە کە لە دونیادا ئاتاجی نیت، ئیتر لە چی ئەو شتە ئاسوودەی؟!

- گەر پیاوێکت لە نێوان دەستەیەکدا بینی، هەر یەکەیان بە خراپترین شێوە ئازاری دەدا، بەڵام ئەو نە دەپاڕایەوە و نە بۆیان ملکەچ دەبوو و نە هاواری بۆ کەسێك دەبرد ڕزگاری بکات، تۆ ئەو کەسە بە نەزان و گێل و گەمژە تەماشا دەکەی، بۆیە تۆ بەو جۆرە مەبە.

- هیچ کەس لە هاوەڵەکەی بۆنێکی خۆشی نەبینیوەتەوە خۆشتر بێت لە بۆنی ئەخلاق جوانی.

- سێ خەسڵەت لە هەرچی شتی ترە سەرقاڵت دەکات: چاودێری پەروەردگارت، و دادگایی نەفسی خۆت، و بیرکردنەوە لە گوناهەکانت.

- حەزە پێشهاتووەکان بە دڵتەنگی و پەشیمانی بەسەر حەزەکانی رابردوودا لابدە، ئەو حەزانەی تامەکانیان ڕۆیشتن و تاوانەکانیان مانەوە، خەم لە دڵت دەربکە بە بەڕاستزانینی بەڵێنەکانی خودا، با هەمیشە ترست لە دڵدا بێت، لە هەڕەشەکانی خودا سڵ بکەرەوە، بۆ خودا تەوازوع بنوێنە وەك نیشاندانی هەژاریی بۆ رەحمەتی خودا، و بچووك تەماشا کردنی نەفست لە کاتی باسکردنی مەزنی خودادا، خۆڕازاندنەوە بۆ

خەڵکی لە نەفست دەربکە، وەك هەڵبژاردنی خۆشەویستی خودا، شوکری خودا ئـەنجام بدە لەسەر چاکەکانی بە خۆشەویستی تۆ بۆ عیبادەت کردنـی، نـاوی تـرس بـۆ خـۆت دەستەبەر بکە بە رقبوون لە یاخیبوون لێی، نیعمەتی مەعریفەی خودا دەستەبەر بکـە بە خۆشەویستی تۆ بۆ چاودێری خودا، ناوی خۆشەویستی بەدەست بهێنە بـە چـاودێری کردنی خودا بە هۆگریەوە نەك بە هۆگری دروستکراوەکانییەوە.

- بۆ خەڵکی مەنزیلە و پلە و پایە بوونی هەیە، هەر کەس بە دوو چاوی دڵ تەماشا بکات پلە و پایە و مەنزیلەیان لەسـەر رێگـەی دوارۆژ دەبینێتـەوە، وەك چـۆن بـە دوو چاوی سەری مەنزیلە و پلە و پایەی ئەهلی دونیا دەبینێتەوە.

هیچ کەس شایسـتە نییـە بـە مەنزیلـەتێك لـە مەنزیلـەکانی دونیـا یـان دوارۆژ بـە مەعریفەی دڵی و زیکری زمانی، بەڵکو بەو کارانەی ئەهلی ئەو دوو رێگەیە ئەنجامی دەدەن و هەستان بە مەرجەکانی، وەك چۆن مەعریفە بە دەوڵەمەندی کەسی دەوڵەمەند و نیعمەت و خۆشییەکانی لە خواردن و جل و بەرگ و کۆشك و تەلار سوود و قازانج بە کەسێکی هەژار ناگەیەنێت، هەر بەو جۆر مەعریفەی تـۆ بـە کـار و کـردەوەی چـاکان سوودێکی بۆ تۆ نییە، لە کاتێکدا تۆ بە کاری ئەوان کـار ئـەنجام نـادەی، بـەڵکو ئـەو مەعریفەیە دەبێتە بەڵگە لەسەرت، داوای کۆمەکی و رەحمەتی خودا دەکەین.

۞ ۞ ۞

# لە چاوگەکانی مەعریفە



## تاقیکردنەوەی نەفس:

دەگێڕنەوە پرسیار لە حەکیمێك کرا دەربارەی تاقیکردنەوەی نەفس لە صدقدا، تا بەندە بزانێت ئایا ئەو نەفسە راستگۆیە یان ناڕاست، ئەویش وتی:

گەر بەندە زانی حەسودترین حەسودی ئەو و دوژمنترین دوژمنی بە زانستەکەی سەنا و پلە و پایەی لەناو خەڵکیدا بەدەستهێناوە و راستەقینەی کارەکەی لە خەڵکی شاراوەیە، بەلاّم ئەو کارە پڕ لە ئیخلاصەکەی بە ریا لای خەڵکی سەرژمێر دەکرێ و مەنزیلەت و پلە و پایەی لەلای ئەوان بەردەبێتەوە.. گەر نەفسی ئەوەی لا ئاسایی بوو، و ویستی کارەکەی قوتار بکات لە تێکەڵ کردن ئەوە نیشانەی صدقە، تا ئەو کاتەی زەمی خەڵکی بەسەریدا دادەبارێ و پلە و پایەی دوژمنە حەسوودەکەی راوەستا و بەرقەرار بێت کە دەزانێت بەو جۆرە نییە.

## چۆن شوکری نیعمەت دەکرێت؟

وتم: قسەم بۆ بکە دەربارەی ئەو قسەیەی خەڵکی دەیلێن: "شوکری نیعمەت بریتییە لە ناسینی نیعمەتەکە".

وتی: شوکری نیعمەت ناسینی نیعمەتەکەیە بە ئەندازەی شوێن و جێگەی لە دڵیدا، بە مەزن زانینی و گەورەیی چاکەی خاوەن نیعمەت لەسەر ئەو بە بەخشینی ئەو

نیعمەتە، نیعمەتەکە لای مەزن نابێت تا حەز و تامەزرۆبوونی بۆی نەبێت، حەز و تامەزرۆبوونی بۆی نابێت تا پێویستی خۆی بۆ نیعمەتەکە هەست پێ نەکات، ناتوانێت پێویستی خۆی بۆ نیعمەتەکە بناسێتەوە تا تێڕامان بۆ سەرئەنجامی کارەکان نەکات، و توندی و زۆری پێویستی خۆی هەست پێ نەکات بۆ ئەو شتەی رووی لێ دەکات.

لەو بارەدا نیعمەتەکە لای مەزن دەبێت لە خاوەن نیعمەتەوە بۆ سەر ئەو، ئەو کات منەت و چاکەی خودا لەو نیعمەتەدا بۆ سەر خۆی دەناسێتەوە، لەوێشەوە حەز و تامەزرۆبوونی بۆ نیعمەتەکە لا دروست دەبێت، کە خودا -**تبارك وتعالى**- ئەوەی لە بەندەکەی بینی لە نیعمەتەکەی بۆ زیاد دەکات.

بەگشتی: هەر کەس شتێکی پێ بەخشرا و هیوا و رجای وابوو لە رەزامەندی پەروەردگار و رزگاربوون لە ئاگر بەکاری بهێنێت شتەکەی لا مەزن دەبێت و دڵی پڕ دەبێت لە شەوق بۆ بەخشەری نیعمەتەکە.

ناتوانێت شوکرکەری نیعمەتەکانی دونیا بێت هەتا شوکری نیعمەتەکانی دوارۆژ نەکات، هەر بەو جۆرە ناتوانێت شوکری ئەوانە بکات کە نەفسی خۆشیدەون تا شوکری ئەوانە نەکات خودا خۆشیدەون، ناتوانێت شوکری خەڵکی بکات گەر نەتوانێ شوکری خودا بکات.

## پەندوەرگرتن بە پێش لەدایکبوون و ئەوەی دوای مردن دێت:

هەر کەس زانی هەر ئەوەندە خاوەنی خۆیەتی وەك باری پێش لەدایکبوون، یان وەك باری دوای مردن ئەوا نەفسی خۆی لە مەنزیلەتی لاوازی و هەژاریدا دادەنێت بە تەوازوع و گەردنکەچییەوە، هەر کەس نەفسی خۆی لەو مەنزیلەیە دانەنێت و بە

زانستێكی یەقینی نەزانێت ئەو بەو جۆرەیە ئەوا شایستە بووە بە رێگەی نەفامان و سزای هەڵنراوان و فریوخواردوانی بەسەردا داباریوە.

## تەنها شەرم لە خودا بكە:

- گەر دەفرێك لە دەفرەكانی شەڕت هەڵگرت ئەوا لەرز داتدەگرێتەوە لە ترسی ئەوەی نەبادا خەڵكی بە شتێك لەو شەڕە بزانن.. ئەدی كەی نێوانی خۆت و خودا چاك دەكەیت؟ زۆر دوورە.

بیر لە مردن بكەرەوە وەك ئەو بەندە بەدكارەی شەرم لە مەولاكەی ناكات و لە خراپەكانی ناگەڕێتەوە و چاكەكانی خودا لەسەر خۆی نابینێت مەگەر لە كاتی دادگایی و سزادا، بیر لە مردن و دوای مردن بكەرەوە.

- گومانت چییە بە كەسێك پێی ناخۆشە خەڵكی بزانن بەوەی لە ئەودا هەیە و خودا لای ناپەسەندە، بەڵام شەرم ناكات لەوەی خودا بەئاگایە لەو شتانەی خراپ و ناپەسەندن.

شورەیی بۆ كەسێكە بەم جۆرە بێت، ئەو جێگەی سەرسوڕمانە! هەڵی تەمەن وازلێ دەهێنێت و لەدەستی خۆی دەدات، كارگەلێك ئەنجام دەدات خودا پێی ناخۆشە، پاشان بە شتێك لە خودا نزیك دەبێتەوە فەرزی نەكردووە لەسەری، خۆی سەرقاڵی نەوافلەكان كردووە لە حەج و عومرە، فەرمان بە چاكە دەكات و رێگری لە خراپە، بە بانگەشەی خۆی خەڵكی بۆ لای خودا بانگ دەكات، بەڵام خۆی لە خودا هەڵدێت، فەرمان بە چاكە دەكات و خۆی ئەنجامی نادات، رێگری لە خراپەدەكات و خۆی لە خراپە ناگێڕێتەوە.

ئایا کەسێك ئەم حاڵی بێت خودای ناسیوە؟ دەتوانی بڵێیت رووی لە خودا کردووە؟ راستی کردووە لەوەی دەڵێت لای خودا پاداشت هەیە بۆ گوێڕایەڵان و سزا هەیە بۆ یاخیبووان؟

شوورەییە کەسێك بەم جۆرە بێت.

## حەقیقەتی تەوازوع:

وتم: قسەم بۆ بکە لەسەر ئەو قسەیەی کە دەڵێت: "تەوازوع ئەوەیە کاتێك لە ماڵەوە دەردەچیت هەموو ئەوانەی پێت دەگەن لات وابێت فەزڵ و گەورەییان بەسەر تۆوە هەیە، گەر پیاوێك بانگەشەی ئەمەی کرد و بە زمان دانی پیادا نا، بەڵام کاتێك کەوتە ناو شاندانە ژێر مەرجەکەی و تاقیکردنەوەکەی بە زۆرکردن لە نەفسی خۆی بتوانێت قبووڵی بکات، ئایا ئەو کەسە کەسێکی نەفس خۆ بەکەمزانە؟

وتی: گەر ئەو مەرجانە لە مافە پێویستەکان بوون و بە زۆرکردن لە نەفسی خۆ قبووڵی دەکردن ئەوا ئەو کەسە نەگەیشتۆتە پلەی تەوازوع و رەوشتی نەفسی خۆ بەکەمزانان.

گەر مەرجەکان لەخوار مافە پێویستەکانەوە بوو، ئەوانەی وازهێنان لە قبووڵ کردنیان نابێتە بارگرانی بۆ هیچ کەسێك، و لە قبووڵ کردنی مافە پێویستەکاندا باش و چاك و سینە پاك بوو ئەوا ئەو کەسە لەسەر رێگەی ئەهلی تەوازوعە و رەوگەی ئەوانی گرتۆتە بەر.

## ئەوەی لە نێوان خۆت و خودادایە چاکی بکە:

دەگێڕنەوە کەسێکی حەکیم بۆ یەکێك لە براکانی نووسی: ئەی برام، وەسێتت بۆ دەکەم بە چاککردنی ئەوەی لە نێوان تۆ و خودادایە، و هەڵبژاردنی خۆشەویستی خۆت بەسەر ئارەزووەکانتدا، روو لە کاری کەسێك بکە مامەڵەت لەگەڵ ئەودایە و پێویستییەکانت لەلای ئەوە.

بزانە رۆژەکانی تەمەنت زۆر کەمن، تۆش خاوەنی تەنها یەك نەفسی، گەر رۆژەکانت بەسەرچوون ناتوانی بەدەستیان بهێنیتەوە، و بەشتێکی تریش باربوو ناکرێنەوە، گەر نەفسی خۆتت تیابرد هیچ نەفسێکی تر جگە لەو نەفسە بۆ تۆ بوونی نییە.

ئایا ئەی برام دەزانی چاککردنی نێوانی خۆت و خودا مانای چییە؟

هیچ شتێك لە تۆوە ئەنجام نەدرێت رەزامەندی ئەوی لەسەر نەبێت، هیچ شتێك لە خودا روو لە تۆ نەکات رازیبوونی تۆی بۆ نەبێت.

گەر لاوازبوویت لە رازیبوون بە هەموو ئەوەی بە بڕیاری خودا رووت لێ دەکەن ئەوا لە ئارامگرتن لاواز مەبە، خودا لە حاڵی بەندەکەی رازییە هەتا بەندەکەی لە بڕیاری ئەو (**سبحانە**) رازی بێت.

خودا رازییە لە ئارامگرتنی بەندەکەی لەسەر بڕیار و فەرمانەکانی هەتا بەندە ئارامگر بێت لەسەر ئەوانە، خودا رەزامەندی لە هەردوو بارەکەدا هەیە.

با وەفاداری بیت بە پەیمانەکەی و شوکری نیعمەتەکانی لە کار و کردەوەکانتدا.

پێویستیت با ناسینی خودا و داوای ئێبوردن بێت لێی، خودا ئادەم و نەوەکانی دروست کرد و بەهەشتی وەك پاداشت بۆ ئەهلی گوێڕایەڵی و رەحمەتی خۆی دروست

کرد و ئاگری وەك سزایەك بۆ یاخیبوان و خەشملێگیراوان دروست کرد، پەنا دەگرین بە خودا لە سزا و خەشم و توورەبوونی.

وەفادار بە بە پەیمانەکەت، ئەی برام، لە شەو و لە رۆژدا و لە هەموو حاڵ و بارێکدا، ئەوەی تۆی لەناودای و ئەوەی تۆی لەسەرە.

لابکەرەوە بە لای ناخی خۆتدا، پاکی بکەرەوە و پاڵفتەی بکە و سەلامەتی بۆ بگێڕەوە، تاکو پاك و بێگەرد بێت لەوەی دەترسی رووبەڕووی سزا ببێتەوە، پڕ بێت لەوەی هیوات هەیە پاداشتی لەسەر وەربگریت، تۆ چاوتروکانێك لە خودا بزر نابیت، دەتبینێ و گەردیلەکان و دەنکە رەشکەکانت لەسەر تۆمار دەکات، تاکو بەوانە لە رۆژی دواییدا پاداشت و سزا وەربگریت، گەر خێرت ئەنجام دابوو خێر دەبینییەوە و گەر شەڕت ئەنجام دابوو شەڕ درووێنە دەکەیت.

بۆیە با یادی خودا لە تۆ بزر نەبێت، تۆ پێویستت بەخودایە، ئەو پێویستی بەتۆ نییە.

بزانە، ئەی برام، بنەڕەت و بنچینەی هەموو گوفتارێك زانستە، و بنەڕەتی هەموو کردارێك زانستە، و بنچینەی هەموو سەرکەوتنێك لەگەڵ دروستیی پێکهاتەی ئەقڵ و زۆری بیر بریتییە لە زانست، گەر توانیت بە شتێك زاناتر نەبیت وەك زانینت بە خودا ئەو کارە بکە، چونکە گوفتار و زانست و کردار و شتانی تر مەبەست و موورادی خودان -**سبحانه وتعالی**- باشترین مرۆڤ نزیکترینیانە لە خوداوە، نزیکترینیان زاناترینیانە بە خودا.

پێمانگەیشتووە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((خەڵکی بە مەعریفە جیاوازی دەکەوێتە ناو پلە و پایەیانەوە))

**"ابن مسعود"** دەفەرموێت: ((عومەر نۆبەش لە دەبەشی زانستی بۆ خۆی بردووە)) مەبەستی بەوە زانستە بە خودا.

بزانە، ئەی برام، خەڵکی بەپێی مەعریفەیان بە خودا بۆ خودا لە کارەکانیاندا دڵسۆز دەبن، هەر بەو جۆرە بە ئەندازەی مەعریفەیان بە خودا بۆ خودا تەخت و گەردنکەچ دەبن، شوکری خودا دەکەن لەسەر نیعمەتەکانی بەپێی مەعریفەیان بە خودا، رجا و هیوا و ترسیان بە خودا بۆ پەیدا دەبێت بە ئەندازەی مەعریفەیان بە خودا، گومانی باش بە خودا دەبەن بەپێی مەعریفەیان بە خودا، ئارام دەگرن لەسەر گوێڕایەڵی خودا و لەسەر یاخی نەبوون لە خودا و لەسەر شاردنەوەی کارە چاکەکان و موسیبەت و ناخۆشییەکان کە بەسەریدا دادەبارێن بەپێی مەعریفەیان بە خودا، ئەوەیان خۆشدەوێت کە خودا خۆشیدەوێت و رقیان لەوە دەبێت خودا رقی لێیەتی بەپێی مەعریفەیان بە خودا.

هەر کەس مەعریفەی بە خودا لەدەست بچێت ناتەواوی دەچێتە ناو هەموو ئەوانەوە ئاماژەمان پێکردن بەپێی لەدەستچوونی مەعریفەکە، و بەپێی بەدەستهێنانی، هەر بەو جۆرە بەشی ئەو لە خێر و شەڕدا.

ئەی برام، لە مەلیکی مەعریفەوە هەوڵی بۆ بدە وەك کەسێك خۆی بە شایستەی ئەو مەعریفەیە نەزانێت، زانایان گەیشتن بەوەی کە پێی گەیشتن لە زانست بە ئەندازەی باش دەستبردن و گەڕانی دروست بە دوای مەعریفەدا، و دانانی شتەکان لە جێگەی خۆیان.

گەر رۆژت لێ بوویەوە و ویستت شتێك لە خێر بەدەست بهێنیت تەماشای شوکری خۆت بکە بۆ ئەو نیعمەتانەی پەروەردگارت پێی بەخشیویت لە شەوەکەدا، هەروەها

سەرنجی تەوبەت بدە بۆ ئەو گوناهانەی شەوەکەی ئەنجامت داون، خودا -**تبارك وتعالى**- دەفەرمویت: ﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ﴾ إبراهيم: ٧

هەروەها دەفەرمویت:﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾﴾ النور: ٣١

گەر ڕۆیشتییە ناو شتێك لە خێرەوە سەرنج بدە و بزانە سەرەتاکەی لە کێوە بووە و تەوابوونەکەی بۆ کێ بووە، گەر پێت بوترێت: خۆشەویسترین کەس کێیە کاری بۆ بکەیت؟ دەڵێیت: الله... دەی با ناخی دڵت لەگەڵ ئەوەبێت کە زمانت رایدەگەیەنێت.

بزانە ئەی برام، ئەهلی دونیا و دواڕۆژ لە نێوان سروور و خەم و پەژارەدان، ئەهلی سرووری دواڕۆژ ئەهلی بەهەشتن، مەزنترین سروریان بریتییە لە تەماشاکردنی رووی پاکی خودای موتەعال، باشترین سروری باوەڕدار لە دونیادا بریتییە لە سرووری بە خوداوە، نیشانەی هۆگری بە کارەکانی بوونی شیرینی کارکردنە بۆ خودا، و زۆری خۆشەویستییە بۆ خزمەت کردن بە خودا.

کارێکی محاڵە کارکەر هۆگری بە کارەکەیەوە پەیدا بکات، بەڵام بەو کەسەوە هۆگری نەبێت کە کاری بۆ دەکات، یان لێی نەترسێت.

بزانە، ئەی برام، گەر ئەو شتەی داوای دەکەی و چارەسەری دەکەی لە نەفسی خۆتدا لە گوێڕایەڵی و دامەزراوی و راوەستان بۆ خودا لە یەك بە یەکی هەناسەکاندا پێیەوە سەرقاڵ بیت هێشتا بۆ خودا زۆر کەمت ئەنجامداوە..ئەی دەبێ چۆن بێت کە تەنها هەناسەیەکی بە نرخە لە چەند رۆژێکی کەمدا.

ئەی برام پابەند ببە بە پارێزگاری لێکردن و بەردەوام بوون لەسەر کاری چاودێری، گەر هەموو دونیا بۆ تۆ بێت و هەموویت لەگەڵ نەفسی خۆت بەخشی وەك شوکرێك لەسەر ئەو مەعریفەیەی خودا بە تۆی بەخشیوە، ئەو پەروەردگاری تۆیە، و تۆ بەندەی ئەوی، ئەو فەرمانی پێکردووی بە بەندایەتی، ئەوا هەموو ئەوانە لە بەردەم ئەو نیعمەتە مەزنەدا کەم و کەمبایەخن.

نەفست لە شتێکدا تیامەبە کە هیچ پێویستییەکت پێی نییە.. تۆ بێنیاز نیت لە مەعریفەی چاکەی خودایی لەسەرت، وەك چۆن بێنیاز نیت لە خراپ مامەڵە کردنی نەفسی خۆت، بەندە لە نێوان گوناه و نیعمەتدایە، لە نێوان شوکر و داوای لێخۆشبووندایە.

حەمد بۆ ئەو خودایەی نیعمەتی خۆی پێ بەخشین و فێری کردین، فەزڵ و منەتی خودا لەسەرمان مەزنە.




## راستییەکانی تەوەکول



دەگێڕنەوە حەکیمێك وتویەتی: حەمدی خودا دەکەم وەك حەمدی ئەو کەسەی هەموو چاکەیەك تەنها لە ئەوەوە دەبینێت، و پەرستراوێکی تر جگە لە ئەو ناناسێت، داوای تەوەکولی ئەو کەسانەی لێ دەکەم کە بە صدقی دابڕان بۆ خودا یەکلابوونەوە.

**پاشان:**

خودا -**سبحانه وتعالى**- ئەهلی ویلایەتی خۆی بە دابڕان بۆ لای خۆی تایبەت کردووە، تاکو زۆری نیعمەتەکانی و چاکە و فەزڵی خۆی بەوان بناسێنێت، بۆیە خەمەکانی دونیا لە دڵیان باریان کرد، کاری دوارۆژ لە دڵیاندا مەزن بوو، بەهۆی ئەو شکۆمەندی و گەورەییەی پەروەردگارییان کە دڵی داگیرکردوون، دڵیان بە ملکەچی بەندایەتی پابەند کرد، خۆیان هەڵدایە دەرگانەی تەوەکول لەسەر خودا.

بزانە، ئەی برام، تۆ تەوەکولت بە خودا نەبەستووە هەتا هەموو ئەوانەی جێگەی هیوا و خۆزگەن لەخوار خوداوە وازلێ نەهێنیت.

چۆن دەبێت نەفست ئامادە نەبێت بە بڕینی هەموو پەیوەندییەکان لە دڵدا و یەکلابوونەوەی دڵ بۆ رووکردنە خودا و راستێتی تەوەکول لەسەر ئەو لە کاتێکدا خودا بەسە بۆ ئەو کەسەی پشتی پێ دەبەستێت.

کەسی تەوەکولداری راستگۆ دڵی خۆی ملکەچی دروستکراوەکان ناکات، چونکە دڵی پڕە لە متمانە بە دەستەبەرکردنی خودا بۆ کارەکانی ئەو.

کەسی تەوەکولداری راستگۆ لە تەوەکولەکەیدا: کەمێك لـە بەخششـی خـودا لـەلای ئەو مەزنـە بـەهۆی کـەم تەماشـاکردنی نەفسـی خـۆ و مـەزن تەماشـاکردنی خـودای موتـەعال، ئەو بۆ لای رۆحی یەقین سوکنایی بۆ هاتووە، ئـەوە ئـەو مەنزیلەیـە ئـەهلی هەڵپەی دونیایی خۆزگەی پێ دەخوازن و حەسوودی پێ دەبەن.

هەر کەس دڵ ئارام بوویەوە لەسەر ئەوەی نیعمەتێك نییە لە ئاسمان و زەویدا خـودا خـاوەنی نـەبێت دڵـی ئاسـوودە دەبێـت لـە سـزای هەڵپـەکردن، گوێـت لـێ نـەبووە دەفەرموێت: ﴿ هَلْ مِنْ خَٰلِقٍ غَيْرُ ٱللَّهِ يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ﴾فاطر: ٣، هـەروەها﴿ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾ ﴾ الأعراف: ٥٤

کاتێك متمانە نیشتەجێی دڵت بوو، ئـەوا تـۆ رووت لـە خودایـە و تەماشـای خـودا دەکەیت و چاوەڕوانی ئەوی، چونکە موڵك بۆ خودایـە نـەك بـۆ دروسـتکراوەکانی، بـە ئەندازەی دوورکەوتنەوەت لە متمانە هەڵپەت بۆ دونیا مەزن دەبێت.

بۆیە سەرپێچی بکە لە هەڵپەی خۆت لەسەر دونیا بە قەناعەت کردن بـەوەی بەشـی تۆیە، چونکە تۆ پێشبڕکێ دەکەیت لە دوژمنایەتی هەڵپەکردن لەسـەر دونیـا، چـونکە هەڵپە نابەخشێت و ناگرێتەوە[1].

کەسی پشتبەستوو بە خودا بەو کەسـەی کـە بەخشـەر و لێگرەوەیـە(**المعطي المـانع**) بێنیازبووە لە لە کەسانێك کە بەخشەر و لێگرەوە نین، ئەو بـە خـوداوە بێنیـازبووە لـە غەیری خودا، هەژاری دەرگای خودایە، دڵی لـە پێکـدادان رزگـاری بـووە و سـوکنایی رووی لێکردووە، بۆیە ترس و هەڕەشەی هیچ دروستکراوێك لە دڵیدا نییە..

---

[1] واتە هەڵپەکردن ناتوانێت شتێك بە تۆ ببەخشێت وەك چۆن ناتوانێ شتێك لە تۆ بگرێتەوە.

هـەر کـەس بـە کەسـانی تـرەوە جگـە لـە خـودا پشـتقایم بـوو خـودا بێنیـازی ناکـات.. کەسـێك پشـت بـە خـودا بەسـتبێت پابەنـد دەبێـت بـە تـەقواوە، بۆیـە خـودا دەرووی لـێ دەکاتـەوە و لـە ڕێ و شـوێنێکەوە ڕۆزی بـۆ دەنێرێـت ئـەو بـە بیریـدا نـەهاتبێت، خـودای موتـەعال دەفـەرموێت: ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَـٰلِغُ أَمْرِهِۦ ۚ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا ﴿٣﴾﴾ الطلاق: ٣

کەسی پشتبەستوو بە خودا لە هەموو پێویستییەکانیدا پشتی بە خودا بەستووە، لە کاروبارەکانی دوارِۆژ و دونیایدا، هیوا و ڕجای خۆی لە هەموو کەسێك بڕیوە جگە لـە خودا، هەڵبژاردەیەك نامێنێتەوە بۆ بڕیاری نەفسی، چونکە هەڵبـژاردەکانی خـودا بـۆ ئەو بەسە، هەر کەسێکیش بەو جۆرە بێت بۆ لای ڕۆحی یەقین سوکنایی بۆهاتووە.

ئەم مەنزیلەیە هیچ مەنزیلەیەك ناکەوێتە سەریەوە لە سـوکنایی دڵ بـۆ لای خـودا و دڵنیایی بە بەڵێنی خودا، چونکە لەناو هەموو دروستکراوەکانی خودادا خودا بـۆ ئـەو بەسە و بێنیازی کردووە لە دروستکراوەکانی، هەر کەسێکیش خودای بەس بێت شتێك لەدەست نادات، چونکە خودا بۆی دەسـتەبەر کـردووە و کەسـێکە کـار و بەڵێنـەکانی خۆی دەگەیەنێتە جێگەی خۆیان.

بزانە، تۆ و هەموو دروستکراوەکان ناچاری پەنابردنن بۆ لای خودا، لە هەموو بار و لە هەموو جوڵە و وەستانێکدا، چونکە ئەو بە تەنها دەوڵەمەندە، هەر کەس متمانەی بە کەسانی تر بوو جگە لە خودا ئەو کەسە پێیوایە موڵکێك هەیە گەورەتر لە موڵکی خودا، هەر کەسیش متمانەی بە خودا بێت بە ئەوەوە بێنیاز دەبێت، چونکە خـودا بـۆ ئەو بەسە، خودا جێگەی هەموو دروستکراوەکان بۆ بەندەی خۆی دەگرێتـەوە، چـونکە ئەو تەنها دەوڵەمەندێکە.

گەر زانیت خودا بەسە بۆ ئەو کەسەی پشتی پێ دەبەستێت، ئیتر چۆن داوای بەسبوون ناکەیت بە تەوەکول لەسەر خودا -**عز وجل**-؟

ئایا نازانیت خودای رۆزیدەر ژیان و بژێوی لە نێوان بەندەکانیدا دابەش کردووە، فەزڵی هەندێکیانی لە رۆزیدا داوە بەسەر هەندێکی تردا، ئەوەی لای خودا بڕیاری لەسەر دراوە و ئەوەی بڕاوەتەوە کۆتایی پێهاتووە؟

ئیتر چۆن گرنگی دەدەیت بە شتێك کە خودا بڕیویەتەوە و کۆتایی پێهێناوە؟

دەتەوێ گوێ بگریت لە فەرموودەی خودا -**عز وجل**-: ﴿ **وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٧﴾** ﴾ الأنعام: ١٧، چۆن دەبێ داوای لابردنی زیان و بەدەستهێنانی سوود و قازانج لە کەسانێکی تر بکەیت جگە لە خودا؟

چۆن دەبێت زاڵ و بەدەسەڵات بەسەر دڵی تۆدا داوای لابردنی زیان و هێنانی سوود قازانج نەبێت تەنها لە خودای موتەعال، کاتێك زانیت هەموو ئەوانە تەنها بە دەستی خودای موتەعالە؟

چۆن دەبێت لە تیاچوونی شتێك لە خێر بترسیت خودا بۆ تۆی بوێت؟ گەر خودا پێت نەدات دەبێ کێ بێت ئەو کەسەی خێر بە تۆ بگەیەنێت؟ یان تۆ بەو خێرە بگەیەنێت؟

کەسی پشتبەستوو بە خودا لا بەلای دونیادا ناکاتەوە، چونکە دونیا بە هەڕەشە لەسەر خۆی تەماشا ناکات، ئەو دونیا و نەفسی خۆی و هەموو ئەوەی لە دونیادایە بە بەشی خودا دەزانێت، سواربوونی دەریا و رۆیشتن بەپێ لە وشکانیدا، هۆگری و نامۆبوون، کاکردن و دانیشتن لەلای ئەو یەکسانە، چونکە خودا بەسە بۆ کەسێك پشتی پێ بەستبێت، گوێت لەم ئایەتە بووە کە دەفەرموێت: ﴿ **أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ** ﴾الزمر: ٣٦

کەسی پشتبەستوو بە خودا بەهۆی زانستی بە خودا لە خەریکبوون بە غەیری خوداوە بێنیاز بووە، چونکە دەزانێت ئەو کەسەی سوود و قازانج دەگەیەنێت تەنها خودای موتەعالە و هیچ هاوەڵێکی بۆ نییە.

هەروەها گەر دڵت بۆ لای خودا سوکنایی بۆ هات ئەوا جگە لە خودا لە کەسێکی تر ناترسیت، چونکە خودا بەسە بۆ کەسێك پشتی پێ ببەستێت.

لە نیشانەکانی کەسی پشبەستوو بە خودا: صدق هەڵببژێرێت -کە زیانی پێ دەگەیەنێت- بەسەر درۆدا -کە قازانجی لێ دەکات- چونکە بۆ کەسێك تەوەکولی بە خودا هەبێت دروست نییە ترسی لە غەیری خودا بێت.

هەر بەو جۆرە کاتێك فەرمان بە چاکە دەکات و رێگری لە خراپە دەکات تەنها لە خودا دەترسێت، چونکە رجای بە خودا زۆرتر و زیاترە لە ترس لە هەڕەشەی دروستکراوەکانی خودا، کەسی پشتبەستوو بە خودا هەموو ترس و لەرزین و خەم و دڵتەنگییەکی لە دڵ دەرکردووە، بە خوداوە دەوڵەمەند و بێنیاز بووە، چونکە دەزانیت لێگرەوە و بەخشەر و زیانگەیەنەر و سوودگەیەنەر تەنها خودایە.

بە نەزانی خۆت پشت لە خودا مەکە و لێی بێنیاز مەبە، چونکە بۆ کەسانی خوار خودا ملکەچ و ژێردەستە دەبیت لەو کاتانەدا شەیتان دەترسێنێت و دواتر دەست دەگرێت بەسەرتدا، یەکەجار گوێ بۆ ئەم فەرموودەی خودا بگرە: ﴿ ٱلشَّيۡطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلۡفَقۡرَ وَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡفَحۡشَآءِۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغۡفِرَةٗ مِّنۡهُ وَفَضۡلٗا ﴾البقرة: ٢٦٨

چ هەڕەشەیەکی شەیتان -لە پاڵ دەستەبەرکردنەکانی رەحماندا- زیان بە تۆ دەگەیەنێت؟

بزانە، تۆ پشتت بە خودا نەبەستووە تا ڕێگەی ڕۆیشتن بۆ لای ئەو بە ئارامی و دڵنیاییەوە نەگریتە بەر، هەروەها هەتا خودا بپەرستیت بەوەی تۆی تێدا داناوە و تۆی پێگەیاندووە، چونکە تۆ کەسێکی تر جگە لە خودا ناناسیت.

گەر تۆ بەم مەنزیلەیە گەیشتیت ئەوا مەزنی و شکۆمەندی خودا دابارێوەتە سەر دڵت، چونکە هەموو خەڵکی لە حەقی خودادا -جل جلالە- کەمتەرخەمن.

بزانە، خودا (**سبحانە**) کەسانی پشتبەستوو بە ئەوی تایبەت کردووە بە مەنزیلەی سەلامەتی و هەموو پەشیمانییەکی لە ئەوان گرتۆتەوە، ئەوان لەو شتەی هیوا و ئاواتیانە چاویان بڕیوەتە خودا و تەماشای قاپی ئەو دەکەن.

دڵی ئەوانی لە کەسانی تر جگە لە خۆی دابڕیوە، بۆ ئەو چاکەیەی هیوایان پێیەتی، بە یادی خودا لە یادی کەسانی تر بێنیاز بوون.

بزانە، تۆ پشتت بە خودا نەبەستووە تا لە هەرچی موڵکی نەفسی خۆت و موڵك و ماڵی دونیایە خاوێن نەبییەوە، پشتت بە خودا نەبەستووە تا هەموو متمانەت بۆ خودا نەبێت کە تاکوتەنهایە و هاوەڵی بۆ نییە، تا پێویستی و ئاتاجییەکانت ڕوو لە خودا نەکەیت بە تەنها تۆ بەو جۆرە نیت، بۆیە تەماع هەڵتنەنێت بۆ لای غەیری خودا.

ئایا ئەو شتەی تۆ تەماعت هەیە لە دەستی ئەودا موڵکی خودا نییە؟

ئاسا بەربەستێك هەیە لە ئاسماندا تۆ لە خودا دابڕێت؟

بزانە تۆ ناتوانی ڕۆزییەکەی خۆت دیاری بکەیت وەك چۆن ناتوانی مردنەکەی خۆت دیاری بکەیت، گوێت لەم فەرموودەی خودا بووە: ﴿ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ﴾الروم: ٤٠

بۆیـە ئـەی بـرام، ئارامیـت هـەبێت بـۆ لای بـەڵێنی خـودا لـە ڕۆزییەکەیـدا، وەك چۆن دڵنیایـت لـە مردنەکـەی خـۆت، بـە بـڕینی هۆکـار لـە دڵـت ئـاژاوە و سـەرقاڵی لە دڵدا کۆتا پێ بهێنە..

بزانـە خـودا بـە هـۆ و بـەبێ هـۆ، ڕۆزی تـۆ دەدات، بـەڵکو بـەبێ هەرچـی هۆیـە ڕۆزی تـۆ جـێگیرە، تـۆ نـازانی کـەی ڕۆزییەکـەت بـۆ دێـت، وەك چـۆن نازانیـت کـەی مـردن ڕووت لێ دەکات.

نابینی خودا بەڵێنی داوە ڕۆزی تۆ بدات و بە بڕیـاری بـڕاوە ڕۆزییەکـەی لـێ بـزر و پەنهان کردوویت و کاتێکی هەیە ئەو ڕۆزییەی تێدا ئاشکرا دەکات؟ گەر هەرچی فێـڵ و تەگبیرە بیگریتە بەر بۆ ئەوەی پێش ئەو کاتە بێت نایەت، هـەتا کـاتی خـۆی دێتـە بەرەوە و تیایدا ئاشکرا دەبێت.

گوێت لە فەرموودەکەی خودا بووە کە دەفەرموێت: ﴿ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ إِنَّهُۥ لَحَقّٞ مِّثۡلَ مَآ أَنَّكُمۡ تَنطِقُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الذاريات: ٢٣

بزانە ئەو کەسەی متمانە و یەقینی بە خودا هەیە تۆمەتی لە دڵدا بەرانبەر بە خودا سڕیوەتەوە، گەر هێشتا لەژێر سێبەری هۆدا بوویت بـۆ ڕۆزییەکـەت بـا دڵـت لابـەلای هۆدا نەکاتەوە، و تەنها دڵت لەگەڵ خودا بێت.

بزانە کەسی مـەرد و جـوامێر تـەنها بـە مۆڵـەتی سـەردارەکەی(گەورەکەی) خـەرج دەکات، دڵت لەسەر گەورەکەت دامەزرێنە، چونکە گەر پێتببەخشێت هـەموو ئـەهلی سەر زەوی ناتوانن لێت وەربگرنەوە، هەر بەو جۆرە گـەر لێتبگرێتـەوە هـەموو ئـەهلی سەر زەوی ناتوانن پێت ببەخشن، چونکە دەسـەڵاتی ئـەو-سـبحانە وتعـالی- مەزنـە، تەوەکولی تۆش لەسەر ئەو بەسە بۆ تۆ.

کەسی پشتبەستوو بە خودا دڵی بۆ لای دەستەبەرکراو سوکنایی بۆ هاتووە، هەر کەس دڵی لە هۆ و هۆکارەکان ببڕێت شتێك نابینێتەوە جگە لە خودا، چونکە قەدەری خـودا بەسەر کەسی پشتبەستوو و کەسانی تریشدا جاری دەبێت، فەموودەی خودات بیستووە: ﴿ وَكَأَيِّن مِّن دَآبَّةٍ لَّا تَحۡمِلُ رِزۡقَهَا ٱللَّهُ يَرۡزُقُهَا وَإِيَّاكُمۡۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾ العنكبوت: ٦٠

کەسی پشتبەستوو بە خودا بە زانستێکی یەقینی دەزانێت و دڵی بەلای ئەوەدا سوکنایی بۆ هاتووە کە: ئەوەی بەشی ئەوە و بۆی دیاریکراوە گەر بەدەم باشەوە بێت ئەو پێیدەگات و بەدەستی دەهێنێت، ئەوەش کە بەشی ئەو نییە و بۆی نەبڕاوەتەوە گەر لەبەردەمیدا بێت و هەموو ئەهلی ئاسمانەکان و زەوی هەوڵبدەن گەردیلەیەك یان کێشی دەنکە ڕەشکەیەك لەوە بە ئەو بگەیەنن ناتوانن، خودای موتەعال دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُم مِّنۡ إِمۡلَٰقٖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكُمۡ وَإِيَّاهُمۡ ﴾ الأنعام: ١٥١، هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾ المائدة: ٢٣، هەروەها دەفەرموێت: ﴿ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَا ﴾ يونس: ٨٥، هەروەها: ﴿ وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ وَقَدۡ هَدَىٰنَا سُبُلَنَاۚ وَلَنَصۡبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيۡتُمُونَاۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ إبراهيم: ١٢

بۆیە تەوەکول ئیمانی ڕاستەقینەیە، چونکە فەرزە لەسەر بەندەکان، ئیمان تەنها بە تەوەکول تەواو دەبێت، تەوەکولیش زۆردەکات و کەم دەکات، وەك چۆن ئیمان زیاد دەکات و کەم دەکات، خەڵکیش بەپێی یەقین لە تەوەکول و ئیمان جیاوازیان لە نێوانیاندا هەیە.

کۆتـایی کتـێبی "ئـادابی دەروون"ی موحاسـبی-ڕەحمـەتی خـودای لەسـەر بێـت- **وصلواته علی سیدنا محمدا وآله وسلامه**، بەتەنها خودامان بەسە و ئەویش باشـترین پاڵپشتێکە بۆ مرۆڤ.

**الحمد لله علی فضله ونعمته**

دوای نوێژی بەیانی ڕۆژی دووشەممە / بەروار **٢٠١٥/٧/٢٧** لە وەرگێڕان و پێداچوونەوەی تەواو بوون.

وەرگێڕ/ سلێمانی



# بسم الله الرحمن الرحيم

# پەیامی خوازیارانی ئیرشاد



حەمد بۆ ئـەو خودایـەی یەکـەمین و دێرینـە، تـاك و تـەنها و جەلیلـە، هاوشـێوە و هاوتای بۆ نییە، حەمدی دەکـەم بـە حەمـدێك شایسـتەی نیعەتـەکانی بێـت و بگاتـە ئاستی نیعمەتە بێ پایانەکانی.

شایەتی دەدەم کە خودا تاك و تەنهایە و هیچ هاوەڵێکی بۆ نییە، وەك شایەتی کەسێك کە زانایە بە پەروەردگاریی ئەو (**سبحانه**) و بەئاگایە بەتاك و تەنهاییەکەی، شایەتی دەدەم **محەمەد** بەندەو پێغەمبەری خودایە (ﷺ)، بۆ وەحی خۆی هەڵیبژاردو پێغەمبەرایەتی پێ خەتم کرد و کردی بە بەڵگەی بەسەر هەموو دروستکراوەکانیەوە: ﴿**لِّيَهۡلِكَ مَنۡ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٖ وَيَحۡيَىٰ مَنۡ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٖ**﴾الأنفال: ٤٢، با ئەوانەی تیادەچن لەسەر بەڵگەی ڕۆشن و دیار تیابچن و ئەوانەی دەژین لەسەر بەڵگەی ڕۆشن و دیار بژین.

شایەتی دەدەم کە خودا لە بەندە باوەڕدارەکانی خاوەن ژیرییەکان و زانـا بـە ئـەمری خۆی هەڵبژاردووە، بە وەفاداری و ڕەوشتی بەرز و ترسـان لـە خـودا وەسـفی کـردوون، خودا -عز وجل- دەفـەرموێت: ﴿**أَفَمَن يَعۡلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ كَمَنۡ هُوَ أَعۡمَىٰٓۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٩ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلۡمِيثَٰقَ ٢٠ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلۡحِسَابِ ٢١**﴾ الرعد: ١٩-٢١، ئایا ئەو کەسەی کـە دەزانێـت ئەوەی لە پـەروەردگاری تـۆوە دابـەزیوە حـەق و ڕاسـتییە، وەك ئـەو کەسـە وایـە کـە

کوێرە، تەنها خاوەن کرۆك و خاوەن ژیرییەکان بەبیریان دێتەوە، ئەوانەی وەفادارن بە پەیمانی خودا و پەیماننامەکەیان ناشکێنن، هەروەها ئەو کەسانەی ئەوەی خودا فەرمانی بە گەیاندنی کردووە -لە سیلەی رەحم- دەیگەیەنن و لە پەروەردگاریان دەترسن و ترسی رۆژی دادگاییان لە دڵدایە.

هەر کەس خودا سینەی والآ بکات و تەصدیق بگاتە دڵی و حەزی گرتنەبەری وەسیلە بۆ لای خودا لەلای سەرهەڵبدات: ئەوا رێگەی خاوەن ژیرییەکان دەگرێتە بەر، ئەوەش بە پارێزگاری لە سنوورەکانی شەریعەت لە کتێبەکەی خودادا، و سوننەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) و ئەوەی ئیمامە هیدایەتدراوەکان لەسەری کۆبوونەوە.

ئەوەش بریتییە لە گرتنەبەری شاڕێگەی راست و دروست(**الصراط المستقيم**) کە خودا بەندەکانی بۆ سەر بانگ کردووە و دەفەرموێت: ﴿ **وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٥٣** ﴾ الأنعام: ١٥٣، ئەمە شاڕێگەی راست و دروستی منە و شوێنی بکەون، شوێنی توولەڕێگەکان مەکەون چونکە لە شاڕێکەی راست و دروستی خودا لاتان دەدەن و دەستە دەستەتان دەکەن، ئەمە ئەوەیە کە وەسێتتان بۆ دەکەم لەسەری، بەڵکو خۆتان بپارێزن.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((دەستبگرن بە سوننەتی من و سوننەتی خەلیفە راشیدینەکانی دوای منەوە، بە دەست و ددان و بە توندی دەستی پێوە بگرن))[١]

---

[١] **رواه الإمام أحمد.**

**بزانە فەرزی کتێبەکەی خودا بریتییە لە:** کارکردن بە حوکمی ئەمر و نەهی و ترس و رجا بۆ هەڕەشە و بەڵێنی خودا و ئیمان بە موتەشابیه و پەند و ئامۆژگاری وەرگرتن لە چیرۆك و نموونە قورئانییەکانی، گەر ئەو کارەت ئەنجامدا ئەوا لە تاریکستانی نەزانییەوە هاتویت بۆ ناو نووری زانست و لە سزا و ئازاری شك و گومانەکانەوە هاتووی بۆ ئاسوودەیی یەقین، خودای موتەعال دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾ البقرة: ٢٥٧، خودا وەلی ئەو کەسانەیە ئیمانیان هێنا، لە تاریکییەکانەوە بۆ نوور و رۆشنایی دەریان دەهێنێت.

تەنها ئەهلی ژیرییەك کە لە خوداوە وەرگیرابێت ئەوەیان (تاریکی و نوور) پێ جیا دەکرێتەوە و حەزی گرتنەبەریان لا دروست دەبێت، ئەوانەی کە بە حوکی زاهیر کاریان ئەنجامدا و خۆیان لە شوبهە پاك راگرت، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((حەلاڵ روون و ئاشکرایە و حەرامیش روون و ئاشکرایە، لە نێوانیاندا ناڕوون و لێڵ و تەمومژاویی (مشتبهات) بوونی هەیە))[١] ، وازلێهێنانی ئەو تەمومژانە چاکتر و باشترە لە دەست بۆ بردن و تێکەوتنی.

بۆیە نیەت بپشکنە و ویست و لێبڕان بناسە، پاداشتی مرۆڤ بە پێی نیەتەکەیەتی، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((کار و کردەوەکان بە نیەتن، هەر مرۆڤێکیش ئەوەی بۆ هەیە کە نیەتی لێهێناوە))[٢]

---

[١] رواه الترمذي.

[٢] رواه البخاري ومسلم.

پابەند ببە بە لە خوداترسانەوە، چونکە: ((موسڵمان کەسێکە کە خەڵکی لە دەست و دەمی سەلامەت بن، ئیمانداریش ئەو کەسەیە کە خەڵکی لە شەڕ و موسیبەتی سەلامەتن))[١]

"أبو بكر الصديق"-خوا لێی رازی بێت- دەفرمویێت: (لە خودا بترسە بە گوێڕایەڵی کردنی خودا، و گوێڕایەڵی بکە بە لە خوداترسان، با دەستت سووك و خاوێن بێت لە خوێنی موسڵمانان، و سکت لە ماڵ و سامانیان و زمانت لە حەیا و حورمەتیان).

دادگایی نەفسی خۆت بکە لە هەموو خورتە و خەیاڵێکدا.

با لە هەموو هەناسەیەکدا هەست بە چاودێریی خودایی بکەیت، عومەر-خوا لێی رازی بێت- دەفەرمویێت: (دادگایی نەفسی خۆتان بکەن بەر لەوەی دادگایی بکرێن، نەفسی خۆتان هەڵبسەنگێنن بەر لەوەی بۆتان هەڵبسەنگێنن، خۆتان جوان و ئامادە بکەن بۆ نمایشە مەزنەکە، ئەو رۆژەی هیچ شاراوەیەك لە ئێوەدا شاراوە نییە)

لە خودا بترسە لە دینەکەتدا و لە هەموو کاروبارەکانتدا هیوا و رجات بە خودا هەبێت، ئارام بگرە لەسەر ئەوەی تووشت دەبێت و رووت لێ دەکات، عەلی-خودای لێی رازی بێت- دەفەرمویێت: (تەنها لە گوناهت بترسە، و تەنها هیوا و رجات بە پەروەردگارت هەبێت، با ئەو کەسەی نازانێت شەرم نەکات تا دەزانێ و فێر دەبێت، با ئەو کەسەی پرسیاری لێ دەکرێت لە شتێك کە نایزانێت شەرم نەکات لەوەی بڵێت: "نازانم")

---

[١] رواه الإمام أحمد والنسائي والترمذي والحاكم.

**بزانە** ئارامگرتن لەگەڵ ئیماندا وەك سەری مرۆڤ وایە لەگەڵ جەستەیدا، گەر سەر ببڕرێت جەستە کۆتایی پێ دێت، گەر وشەیەکت بیست کە تووڕەی کردی لەمەڕ حەیا و حورمەتت ئەوا لە کەسەکە ببوورە و دڵت لە ئاستی ساف و بێ کینە بکە، چونکە ئەو کارە لە کارە مەزنەکانە، **"عمر بن الخطاب"**-خوا لێی رازی بێت- دەفەرموێت: (هەر کەس لە خودا بترسێت رق و داخی خۆی ناڕێژێت، هەر کەس خۆی لە خودا بپارێزێت ئەوە ئەنجام نادا کە حەزی لێ دەکات و دەیەوێت، گەر رۆژی دوایی نەبوایە -ژیان- شتێکی تر دەبوو جیا لەوەی ئێوە دەیبینن)

چاودێری حەز و ویست و لێبڕانی خۆت بکە، سەرقاڵ ببە بە چاککردنی نەفسی خۆتەوە و بێئاگا ببە لە نەنگی و ناتەواوییەکانی خەڵکی، وتراوە: بەسە نەنگی و ناتەواویی بۆ کەسێك ناتەواوییەکانی خەڵکی بۆ دەربکەوێت و ئەوەی لە نەفسی خۆیدایە لە نەگی و ناتەواویی لێی شاراوە بێت، یان رقی لە خەڵکی بێت بەهۆی کار و کردەوەیەکەوە کە لە خۆیدا بوونی هەیە، یان ئەهلی مەجلیسی خۆی ئازار بدات یان شتانێك دەربارەی خەڵکی بڵێت کە پەیوەندی بە ئەوەوە نییە و کاری ئەو نییە.

ژیریت بۆ خودا بەکاربهێنە، بەوەی هەموو متمانەیەك بە تەگبیرەکانی ژیری نەبەخشی، داوای کۆمەکی و یارمەتی بکە لەسەر لادانی قەدەرەکان، عەلی-خودای لێ رازی بێت- دەفەرموێت: (ئەی رۆڵەی ئادەم، بە دەوڵەمەندی دڵخۆش مەبە، و بە هەژاری بێهیوا مەبە، و بە هاتنی بەلا با حوزن و دڵتەنگی داتنەگرێتەوە، و بە خۆشی و هەرزانی دڵخۆش مەبە، چونکە زێڕ بە ئاگر تاقیدەکرێتەوە، و بەندەی صالح بە بەلا دادەگیرێتەوە و تاقیدەکرێتەوە، تۆ ناگەیت بەوەی کە دەتەوێت مەگەر بە وازهێنان

لەوەی حەزی لێ دەکەیت، تەنها بە ئارامگرتن لەسەر ناخۆشییەکان دەگەیت بەوەی ئاواتی بۆ دەخوازی، تێکۆشان بکە بۆ پارێزگاری و چاودێری ئەوەی لەسەرت فەرز کراوە)

رازی ببە بەوەی خودا بۆ تۆی دەوێت، "ابن مسعود"-خوا لێی رازی بێت- دەفەرموێت: (رازی ببە بەوەی خودا بۆ تۆی بڕیوەتەوە دەبیت بە دەوڵەمەندترین کەس، بەدووربە لەوەی خودا لە تۆی حەرام کردووە دەبیت بە خۆپارێزترین کەس، ئەوەی خودا لەسەری فەرز کردووی جێبەجێی بکە دەبیت بە عابیدترین کەس، سکالا مەبە لای کەسێك کە رەحمت پێ ناکات لە دەستی کەسێك کە بەرەحمترین کەسە بۆ تۆ، داوای کۆمەکی لە خودا بکە دەبیت بە ئەهلی تایبەتی خودا)، "عبادە بن الصامت"-خوا لێی رازی بێت- دەفەرموێت: (بێهیوا ببە لەوەی لە دەستی خەڵکیدایە ئەوە بۆ خۆی دەوڵەمەندییە، خۆت لە تەماعبازی و داوای پێویستییەکان بپارێزە، چونکە ئەوە بۆخۆی هەژارییە، گەر نوێژت کرد با نوێژی ماڵئاوایی بێت)

**بزانە** تۆ تام و چێژی ئیمان نابینیتەوە تا ئیمان نەهێنیت بە خێر و شەڕی قەدەر، بە حەق کار ئەنجام بدە خودا نوور و بەصیرەتت بۆ زیاد دەکات، لەوانە مەبە فەرمان بە حەق دەکەن و خۆیان لێی دوور دەکەونەوە، چونکە بەو کارەیان گوناهێکی گەورە دەکەنە گەردنی و خۆیان رووبەڕووی خەشم و تووڕەبوونی خودا دەبنەوە، خودا-عز وجل- دەفەرموێت: ﴿كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفْعَلُونَ ٣﴾ الصف: ٣- ناپەسەندترین و خراپترین قسەیەك کە رق و تووڕەیی خودای پێ هەڵبسێت ئەو قسەیە کە ئێوە بیکەن و خۆتان رەفتاری پێ نەکەن، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((هەر کەس ئامۆژگاری بکات و خۆی ئامۆژگاری وەرنەگرێت، و خەڵك دەکوت و

سەرەکۆنە بکات و نەفسی خۆی دەمکوت و سەرەکۆنە نەکات، و نەهی لە خەڵکی بکات و نەفسی خۆی لەو نەهیانە نەگرێتەوە، ئەو کەسە لەلای خودا لە ریزی شکستخواردوان و زیانۆمەندانە))[١]

تەنها تێکەڵی کەسی ژیری لە خوداترسی خۆپارێز بکە، تەنها لە مەجلیسی زانای خاوەن بەصیرەتدا دابنیشە، پرسیار لە پێغەمبەر (ﷺ) کرا: کام ئەهلی مەجلیسمان باش و چاکە؟ فەرمووی: ((هەر کەس بە بینینی خوداتان بیربخاتەوە، قسە و گوفتاری زانستتان زیاد بکات، کاروکردەوەکانی دوارۆژتان وەبیربهێننەوە))[٢]

لە ئاستی حەق خۆت بە نزم بگرە و گەردنکەچی حەق ببە، بەردەوام بە لە یادی خودا نزیکی لە خوداوە بەدەست دەهێنت، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((ئەهلی مەجلیسی خودا (هامنشینی خودا) لە رۆژی دواییدا بریتین لە: گەردنکەچان و خۆبەکەمزانان و لە خودا ترساوان و زۆر یادکرانی خودان))[٣]

ملکەچی و فەرمانبەرداریت بۆ خودا بێت و ئامۆژگاری و دۆستایەتیت بۆ باوەڕداران، لە کاروبارەکانتدا راوێژ بەوانە بکە کە لە خودا دەترسن، خودا -عز وجل- دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ﴾فاطر: ٢٨، بەندە زاناکان لە خودا دەترسن، پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت: ((ئایین بریتییە لە نەصیحەت))[٤]

---

[١] لم أجد له صلا في كتب الصحيح والضعيف والموضوع.

[٢] رواه الترمذي.

[٣] لم أجد له أصلا في المراجع.

[٤] رواه مسلم.

**بزانە** هەر كەس نەصیحەتی كردیت تۆی خۆشدەوێت، هەركەسیش مەرامی و رووپامایی بۆ كردیت غەشی لەگەڵ كردویت، هەركەس نەصیحەتی تۆ قبوولْ نەكات برای تۆ نییە، **"عمر بن الخطاب"**-خوا لێی رازی بێت- دەفەرموێت: (خێر لە دەستەیەكدا نییە نەصیحەتكەری یەكتری نەبن، هەروەها خێر لە دەستەیەكدا نییە كەسانی نەصیحەتكەریان خۆشنەوێت)

لە هەموو شوێن و جێگەیەك صدق و راستگۆیی هەڵبژێرە قازانجێكی گەورە دەكەیت، خۆت لە زیادەڕەوی كەنار بدە سەلامەت دەبیت، صدق سەری لە خێر و چاكەوە دەردەچێت و خێر و چاكەش سەردەكێشێت بۆ رەزامەندی خودای موتەعال، درۆ رێنموونی دەكات بۆ بەدكاری، بەدكاریش سەردەكێشێت بۆ خەشم و تووڕەبوونی خودا، **"عبدالله بن عباس"**-خوایان لێ رازی بێت- دەفەرموێت: (شتێك پەیوەندی بە تۆوە نییە قسەی لەسەر مەكە، نە لەگەڵ كەسی گەمژە، نە لەگەڵ كەسی حەلیم موجادەلە و دەمەقاڵە مەكە، بە شتێك ناوی براكەت بهێنە كە حەزدەكەی بەوە ناوت بهێنن)

وەك پیاوێك كار بكە كە دەزانێت بە چاكە پاداشتی دەدرێتەوە و بە خراپە و تاوان تۆڵەی لێ دەسەنرێت، بەردەوام بە لە شوكر، هیوا و ئاوات و خۆزگەت كورت بكەرەوە، بە دڵی تەنگەوە روو لە گۆڕستان بكە، بە دڵ لە كۆبوونەوەی رۆژی حەشر بترسە.

**"أبو ذر"** -خوا لێی رازی بێت- دەفەرموێت: (كار بكە وەك ئەوەی بیبینیت، نەفسی خۆت لە ریزی مردووان سەرژمێر بكە، بزانە شەڕ لەبیرناكرێت و خێریش تیاناچێت، بزانە كەمێك-لە دونیا- كە بێنیازت بكات باشترە لە زۆرێك كە بێئاگات بكات، زۆر ئاگاداری دوعای كەسی مەزڵوم بە)

بارگە و بنەت بۆ سەفەر ئامادە بکە، ئەوپەڕی هەوڵت بدە بۆ کۆکردنەوەی توێشوو، ببە بە جێبەجێکەری وەسێتەکانی نەفسی خۆت، پیاوان مەکە بە جێبەجێکەری وەسێتەکانت، کاروبارەکانت بگرە دەست و لە خەوی بێئاگایی راپەڕە، تۆ بەرپرسیاری تەمەنی خۆتی، **"أبو أمامة"**-خوا لێی رازی بێت- دەفەرموێت: (گەر رۆڵەی ئادەم لە پەروەردگارییەوە ژیری و هۆشمەندی پێ ببەخشرێت باشترە لە جیهادکردنەکەی)

**بزانە** هەر کەس خەم و لێبڕانی بۆ دوارۆژ بێت خودا خەم و پەژارەی دونیای بۆ چارەسەر دەکات، وەك لەو فەرموودەدا هاتووە، دەفەرموێت: ((هەتا دەتوانن لە خەم و پەژارەی دونیا خۆتان خاڵی بکەنەوە، چونکە هەر کەس دونیا بکات بە مەزنترین خەم و پەژارەی خودا سەرقاڵیی دونیای بەسەردا دادەبارێنێت و هەژاری دەخاتە نێوان دوو چاویەوە، هەر کەسیش دوارۆژ بکات بە مەزنترین خەمی خۆی خودا کارەکانی بۆ کۆدەکاتەوە و دەوڵەمەندییەکەی دەخاتە دڵییەوە، هەر کەس بە دڵ روو لە خودا -عز وجل- بکات دڵی باوەڕداران بە بەزەیی و خۆشەویستی بۆی گەردنکەچ دەبن))

**برای من،** ئاگاداری شك و گومان و ژاوەژاو بە لەمەڕ قورئان، و موجادەلە لە دیندا و قسە لەسەر سنووردارکردن و بەرجەستەکردنی خودا و پەنهان، لەو کەسانە بە خودای -عز وجل- لەبارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا ﴿٦٣﴾﴾ الفرقان: ٦٣- کاتێك نەفامان و نەزانان قسەیان لەگەڵ دەکەن دەڵێن: سەلامی خوداتان لێ بێت، یان شتێکیان پێ دەڵێن سەلامەتی لێ بکەوێتەوە.

پابەندی ئەدەب ببە، لە ئارەزوو و تووڕەبوون خۆت بەدوور بگرە، کار بکە لەناو هۆکارەکانی بەئاگابوون و بێداربوونەوەدا، نەرم و نیانی بکە بە رێگە و رەوگەی خۆت،

و لەسەرخۆییش بکە بە دۆستی خۆت، و سەلامەتی بکە بە ئەشکەوت(خەلۆەتگا) و سوود لە کاتە بۆشەکانت وەربگرە و دونیا بکە بە ولاخی سواریت و دوارۆژیش بکە بە مەنزلگای کۆتایی.

حەسەن-خوا لێی رازی بێت- دەفەرموێت: (خودا لە دونیادا ئاسوودەیی و ئارامی دانەناوە تا کاتی گەیشتنە بەهەشت)

لە شوێن و جێگەی بێئاگایی و فریودانی دوژمن و لێشاوی ئارەزووەکان و کلپەی حەزەکان و خۆزگە و ئاواتی نەفس خۆت کەنار بدە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((بەدکارترین دوژمنت بریتییە لە نەفست کە لە نێوان دوو لایەکەتدایە))[1]، بە هۆی گوێڕایەڵیت بۆی نەفست بووە بە خراپترین دوژمن بۆت.

هەر کارێك بە مەنهەجی حەق تیشك و رووناکییەکەیت بۆ دەرکەوت بیگێڕەرەوە بۆ سەر کیتاب و سوننەت و ئادابە چاك و پاکەکان، گەر کارێك لەلات شاراوە و ناڕوون بوو بۆچوونی ئەوانەی لەسەر وەربگرە لە دین و ئەقڵیان رازیت.

**بزانە،** لە ناخی مرۆڤدا شاهید بۆ وەرگرتنی حەق بوونی هەیە، بەپێی ئەو فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ): ((لە دڵت بپرسە، با ئەهلی فتواش فتوات بۆ بدەن))[2]

ئەندامەکانی جەستەت بە ئەحکامەکانی زانست کۆتوبەند بکە، چاودێری هیممەت و لێبڕانت بکە بە ناسین و زانینی نزیکی خودا لە تۆوە، لەبەر دەستی خودادا راست ببەرەوە وەك بەندەیەکی پەناگرتوو و هانابردوو، خودا دەبینییەوە وەك کەسێکی

---

[1] الحديث رواه البيهقي بإسناد ضعيف، واللفظ "أعدى عدوك".

[2] رواه البخاري بهذا اللفظ في "تأريخ الكبير".

میهرەبان و بە بەزەیی، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((خودا -عز وجل- بەندەکەی لە نەفسی خۆیەوە لە پلەیەکدا دادەنێت کە بەندەکە -لە نەفسی خۆیەوە- خودای تێدا داناوە))[١] ، ئەوەش بەپێی ترس و زانست و ناسینی بەندە لە خودا و بە خودا.

**بزانە،** هەر کەس خودا هەڵببژێرێت خودا ئەو هەڵدەبژێرێت، هەر کەسیش گوێڕایەڵی خودا بکات خودا خۆشیدەوێت، هەر کەسێك شتێك لەبەر خودا واز لێ بهێنێت خودا بەو شتە ئازاری نادات، وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((واز بهێنە لەو شتەی گومانت لێی هەیە بۆ ئەو شتەی گومانت لێی نییە، تۆ هەرگیز تیاچوونی شتێك نابینیتەوە بۆ خودا دەستبەرداری بوو بیت))[٢]

بە پاساو و لێکدانەوەی باش -بۆ کەسی بەرانبەر- دڵ لە گومانی خراپ بپارێزە، حەسادەت بە هیوا و ئاواتی کورت پاڵپێوە بنێ، بە شاردنەوەی عیززەت لوتبەرزی بسڕەوە، واز لە هەر کارێك بهێنە ناچارت دەکات بە عوزرخوایی، خۆت لابدە لە هەر حاڵێك دەتخاتە ناو زۆرلەخۆکردنەوە، بە شوێنکەوتنی پێغەمبەر (ﷺ) و پێشینی چاکان دینەکەی خۆت بپارێزە، ئیمان و ئەمانەتت بپارێزە بە داوا و گەڕان بەدوای زانستدا، بە ئادابی ئەهلی حیلم هۆش و ژیریت پارێزراو بکە، ئارامگرتن بۆ هەموو ناخۆشییەك ئامادە بکە، لە تەنهاییدا پابەندی یادی خودا ببە، هاوەڵی نیعمەتەکان بە شوکر بکە.

لە هەموو کار و کردەوەیەکدا داوای کۆمەکی و یارمەتی لە خودا بکە، لە هەموو حاڵێکدا ئیستیخارەی خودا بکە و هەڵبژاردەت بدە دەستی ئەو، هەر کارێك خودا تۆی

---

[١] رواه ابن أبي الدنيا وأبو يعلى والبزار والطبراني والبيهقي والحاكم.

[٢] رواه بهذا اللفظ أبو نعيم في "الحلية"، والخطيب البغدادي في "تأريخ بغداد".

بۆ ویست بەرهەڵستی مەکە، هەر کارێك دەتەوێ پێیەوە بە خودای خۆت بگەی نەفسی پێوە پابەند بکە، هەر کار و کردەوەیەك لە خەڵکیدا بە ناپەسەندی دەزانیت لە ئەخلاقی خۆت دووریبخەرەوە، هەر هاوەڵێك هەموو رۆژێك خێرت بۆ زیاد نەکات هاوەڵییەکەی فڕێ بدە و لێی دووربکەوەرەوە، بەشی خۆت لە لێبووردن و چاوداخستن لە هەڵە و کەموکورییەکانی خەڵکی بەدەست بهێنە.

**بزانە،** باوەڕدار راستگۆییەکەی -لە هەموو بارێکدا- تاقیدەکرێتەوە، نەفسی بۆ بەلا و ناخۆشییەکان ئامادە دەکات، خودا دەکات بە چاودێر بەسەر نەفسی خۆیەوە، بۆیە لەسەر بەڵگە و بورهانی رۆشنی حەق دامەزراو ببە، چونکە بەو کارەت جێگەی کۆمەکی و یارمەتی خوداییت.

لە داواکەتدا راستگۆ بە زانستی بەصیرەت بەدەست دەهێنیت، و سەرچاوەی ناسینی خودات بۆ دەردەکەوێت، بە پوختە و پاڵفتەی یارمەتی و کۆمەکی خودایی ئەوەی رووت لێ دەکات بۆ خۆت زانستەکەی جیا بکەرەوە، کەسێك پێش دەکەوێت کار ئەنجام بدات، دڵ پڕ بوون بە ترس بۆ کەسێکە بزانێت، تەوەکولیش بۆ کەسێکە متمانەی هەبێت، ترسیش بۆ کەسێکە یەقینی هەبێت، زیادکردنیش بۆ کەسێکە شوکری خودا بکات.

**بزانە** ئەوەی بەندە لە تێگەیشتن پێی دەگات بە ئەندازەی پێشخستنی ئەقڵی بەسەر ئارەزوودا و بوونی زانستییەتی بە تەقوا و گوێڕایەڵی خودای موتەعال، هەر کەس خودا ئەقڵی پێ ببەخشێت و دواتر بە زانست -لە دوای ئیمان- زیندووی بکاتەوە، و نەنگی و ناتەواوییەکانی خۆیی پێ نیشان بدات: ئەوا ئەو کەسە خەسڵەتەکانی چاکەی لە خۆیدا

داڕشتووە، بۆیە لە تەقوادا بەدوای چاکەدا بگەڕێ، و زانست لە کەسانێك وەربگرە ئەهلی ترس لە خودا و خۆپارێزین، بە گەڕان و لێکۆڵینەوە لە صدق، صدق بەدەستبهێنە لە شوێن و جێگەی بیرکردنەوەدا، خودا -عز وجل- دەفەرموێت: ﴿ **وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ٧٥** ﴾ الأنعام: ٧٥، بەو جۆرە مەلەکوتی ئاسمانەکان و زەویمان پیشانی ئیبراهیم دا، تاکو بگەڕێ لە ریزی خاوەن یەقینان، هەروەها پێغەمبە (ﷺ) دەفەرموێت: ((فێری یەقین بن، چونکە من فێری دەبم))[١]

**بزانە،** هەر ئەقڵێك سێ شت هاوەڵی نەکات ئەو ئەقڵە ئەقڵێکی فێڵبازە: هەڵبژاردنی گوێڕایەڵی بەسەر یاخیبووندا، و هەڵبژاردنی زانست بەسەر نەزانیدا، و هەڵبژاردنی دین بەسەر دونیادا، هەر زانستێکیش سێ شتی لەگەڵ نەبێت دەبێت بە بەڵگەیەکی زیاتر بەسەر کەسەکەوە: وازهێنان لە ئازار بە بڕینی رەغبەت، و بوونی کردار بە ترسان لە خودا و بوونی ویژدان و دادپەروەری بە بەخشینی سۆز و بەزەیی.

**بزانە،** هیچ کەس خۆی بە شتێك نەڕازاندۆتەوە جوانتر بێت لە ئەقڵ، پۆشاکێکی نەپۆشیوە جوانتر بێت لە زانست، چونکە تەنها لە رێگەی ئەقڵەوە خودا ناسراوە، و بە زانستیش گوێڕایەڵی لێکراوە.

**بزانە،** ئەهلی مەعریفەت بنەماکانی حاڵی دڵیان لەسەر شایەتی زانست و شارەزایی لە لقەکانیدا بیناکردووە، گوێت لەو فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) بووە کە دەفەرموێت: ((هەر کەس کار بکات بەوەی زانیویەتی خودا زانستێکی پێ دەبەخشێت کە نەیزانیوە))[٢]

---

[١] أخرجه أبو نعيم في "الحلية".

[٢] ذكره الإمام أحمد هذا الكلام عن بعض التابعين عن عيسى بن مريم–عليه السلام– وأبو نعيم في "الحلية".

نیشانەی ئەوە بریتییە لە زۆربوونی زانست بە سۆز و بەزەیی و زۆربوونی زانست بە توانا و توانین، بۆیە تا زانستی زیاد بکات ترسی زۆرتر دەبێت، و تا کار و کردەوەی چاکی زۆرتر بێت خۆبەکەم زانینی زۆرتر دەبێت.

ئەو ئەسڵەی کە ئەهلی ڕێگە ڕێگەکەیان لەسەر بیناکردووە بریتییە لە پابەندبوون بە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە بە ئەوپەڕی صدقەوە، و پێشخستنی زانست بەسەر حەزەکانی نەفسدا، و بێنیازبوون بە خوداوە لە هەموو دروستکراوەکانی.

بەدوای ئەسەردا بگەڕێ لەلای کەسێك کە زانست ترسانی لە خودا زیاتر کردووە و کار و کردەوەکانی دەرگای بەصیرەتی بە ڕوودا کردۆتەوە، و ئەقڵی مەعریفەی بۆ زیاد کردووە، گەر نەبوونی ئەدەب ڕێگەو ڕەوگەی ئەوانەی لێ شاردییەوە ئەوا لۆمەی نەفسی خۆت بکە و بە زەم داییبگرەوە، سیفەتی موخلیصان لای ئەهلی زانست شراوە نییە.

**بزانە،** بۆ هەموو بیرێك ئەدەبێك بوونی هەیە، و هەموو ئاماژەیەکیش زانستێك هەیە بۆی، ئەو کەسەی مەبەست و مەرامی خودا حاڵی بووبێت و سوودەکانی یەقینی لە وتاری خودادا بەدەست هێنابێت دەتوانێت ئەوە جیابکاتەوە.

**نیشانەی ئەوە لە کەسی ڕاستگۆدا:** کاتێك ورد دەبێتەوە پەند و ئامۆژگاری وەردەگرێت، کاتێك بێدەنگ دەبێت بیردەکاتەوە، کاتێك دێتە گۆ یادی خودا دەکات، کاتێك لێی دەگیرێتەوە ئارام دەگرێت، کاتێك پێی دەدرێت شوکر دەکات، کاتێك تووشی بەلا دەبێت بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە، کاتێك نەزانی و نەفامی بەرانبەر ئەنجام دەدرێت حەلیمانە مامەڵە دەکات، کاتێك دەزانێت و فێردەبێت تەوازوع دەنوێنێت، کاتێك خەڵکی فێر دەکات نەرم و نیانە، کاتێك پرسیاری لێ دەکرێت دەبەخشێت.

بۆ ئەو کەسەی رووی لێ دەکات شیفایە و بۆ ئـەو کەسـەی داوای ئیرشـادی لـێ دەکـات کۆمەکی و یارمەتییە، هەمیشە هاوپەیمانی صدق و ئەشکەوتی چاکەیە، لە حەقی نەفسی خۆیدا لە رازیبوونەوە زۆر نزیکە، و لە حەقی خودادا تا ئەوپەڕی لێبڕان خاوەنی لێبڕانە.

نیەتەکـەی بـۆی باشـترە لـە کردارەکـەی، کردارەکـەی کاریگـەرترە لـە قسـەکەی، نیشتمانی بریتییە لە حەق و قەڵاکەی بریتییە لە حەیا و زانراوەکەی بریتییە لە وەرع و شاهیدەکەی بریتییە لە متمانە، خاوەنی بەصیرەتێکە کە رێگەی خۆیی پێ دەبینێـت، کۆمەڵێك حەقیقەتی لە زانستەوە بەدەست هێناوە کە قسەیان پێ دەکات، و کۆمـەڵێك بەڵگەی لە یەقینەوە دەستەبەر کردووە کە تەعبیریان لێ دەکات.

کەسێك دەتوانێت بەمانە بگـات کـە بـۆ خـودا -تبـارك وتعـالی- تێکۆشـان لەگـەڵ نەفسی خۆی بکات و نیەتەکەی لە گوێڕایەڵی خودادا راوەستاو بووبێت و لە نهـێنی و ئاشکرایدا لە خودا بترسێت و خۆزگە و ئاواتی کورت کردبێتەوە و بە حـەزەرەوە خـۆی بۆ بەرێکەوتن و کەوتنەگەڕ هەڵکردبێت و بە شنەبای رزگـاری لـە دەریـای پاڕانـەوەدا کەشتییەکەی بەگەڕ خستبێت، کاتەکانی پڕ لە خێر و چاکەن و حاڵ و باری سەلامەت و تەندروست، بە رازاوەکانی خانـەی فریودەر(دونیـا) فریـو نـاخوات، بـە زرق و برقـی سەرابی شتەبای لە مەترسییەکانی رۆژی زیندووبوونەوە بێئاگا نابێت.

**بزانە،** کەسی ژیـر و هۆشمەنـد کاتێـك زانسـتەکەی دروسـت دەبێـت و یەقینەکـەی دادەمەزرێت: دەزانێت کە تەنها صدق لـەلای پـەروەردگار رزگـاری دەکـات، بۆیـە بـۆ بەدەستهێنانی دەکۆشێت، و دەکەوێتە گەڕان بـەدوای ئـەخلاقی ئـەهلی صـدقدا تـاکو خۆی پێ زیندوو بکاتەوە بەر لەوەی مردن دەرگای پێ بگرێت، نەفس و ماڵی خۆی بە

پەروەردگاری فرۆشت کاتێك گوێی لێ بوو دەیفەرموو: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَ﴾التوبة: ١١، خودا نەفس و ماڵی لە باوەڕداران کڕیوە بەوەی بەهەشت بۆ ئەوانە.

بۆیە لەدوای نەزانی بوو بە خاوەنی زانست و لەدوای هەژاری بێنیاز و دەوڵەمەند بوو، لەدوای وەحشەت و نامۆیی هۆگری بە خوداوە پەیدا کرد، و لەدوای ماندووبوون پشوو و ئارامی رووی لێ کرد، سەرئەنجام کارەکانی بۆ جەنگوجۆر بوو و هەوڵ و خەم و لێبڕانی لەسەر یەك مەبەست کۆبوونەوە.

بۆیە دروشمەکەی بریتییە لە متمانە و حاڵی بریتییە لە چاودێری، گوێت لەو فەرموودەیە بووە کە دەفەرموێت: ((خودا بپەرستە وەك ئەوەی دەیبینیت، گەر تۆ ئەو نەبینیت ئەو تۆ دەبینێت))[1]، کەسی نەزان بە حاڵی ئەو وادەزانێت کەڕ و لاڵە، بەڵام حیکمەتەکەی بێدەنگی کردووە، کەسی گەمژە و نەزان بە فرەوێژی تێدەگات، بەڵام نەصیحەت بۆ خودا هێناویەتە قسە، وادەزانن کەسێکی دەوڵەمەندە، بەڵام پاکی و عیففەت بێنیازی کردووە، وادەزانن کەسێکی گەدایە، بەڵام خۆبەکەم زانین دایبەزاندووە و تەختی کردووە.

شتێك پەیوەندی بە ئەوەوە نەبێت پێیەوە خەریك نابێت، بە ئەندازەی ئەوەی بەشی دەکات زۆر لە خۆی دەکات، ئەو شتەی پێی ئاتاج نییە وەریناگرێت، دەستبەرداری شتێك نابێت داوای لێکرابێت پارێزگاری لێ بکات، خەڵکی لە ئەو زۆر ئاسوودەن، ئەویش لە دەست نەفسی خۆی زۆر ماندووە، بە ئەخلاقی وەرع هەڵپەی نەفسی مراندووە، تەماعی بە تەقوا بڕاندۆتەوە، بە نووری زانست ئارەزووەکانی تیابردووە.

---

[1] جاء بنحو هذا اللفظ في صحيح مسلم.

تۆش بەم جۆرە بە، هاوەڵی ئەو جۆرە مرۆڤانە بکە و شوێن پێی ئەوانە هەڵبگرە و بە ئەخلاقی ئەوانە ئەدەب وەربگرە، ئەوانە گەنجینەیەکی بێگۆبەندی شاراوەن، فرۆشتنی ئەوانە بە هەموو دونیا زیانۆمەندییە، ئەوانە لە کاتی بەلاّدا چەك و زەخیرەن، لەناو دۆستاندا متمانەدارەکانن، گەر هەژار کەوتی دەوڵەمەندت دەکەن، کاتێك دوعا و داوا لە پەروەردگاریان دەکەن تۆیان لەبیرناچێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱللَّهِۚ أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٢٢﴾ المجادلة: ٢٢، ئەوانە حیزبی خودان، دەزانن حیزبی خودا سەرفەراز و سەرکەوتووە.

**بزانە** -خودا بە تێگەیشتن دڵ و دەروونت بەرین بکات و بە زانست سینەت والاّ بکا و خەم و هەوڵ و لێبڕانت بە یەقین کۆبکاتەوە- من بەوە گەیشتم کە هەرچی بەلاّیە دەچێتە ناو دڵەوە بەهۆی زیادەڕەوییەوە، ئەسڵ و ریشەی ئەوەش بریتییە لە چوونە ژوورەوە لە دونیا بە نەزانی و لەبیرچوونەوەی رۆژی دوایی لەدوای زانست بە گەڕانەوە بۆ لای خودا.

رزگاربوون لە دەستی ئەمە بریتییە لە وازهێنان لە هەرچی نەزانراو و نەناسراوە لە رێگەی وەرعەوە، و وەرگرتنی هەموو زانراوێك بە یەقین[١]، بینیم تێکچوونی دڵ تێکچوونی دینە، گوێت لەو فەرموودەی پێغەمبەر بووە کە دەفەرموێت: ((دەزانن لە جەستەدا پارچە گۆشتێك هەیە ئەگەر چاکبوو هەموو جەستە چاك دەبێت، ئەگەر تێکچوو هەموو جەستە تێکدەچێت، دەزانن ئەو پارچە گۆشتە بریتییە لە دڵ))[٢]،

---

[١] واتە تا یەقینت نەبێت ئەو کە شتە حەلاڵە دەستی بۆ نەبەیت.

[٢] رواه البخاري ومسلم.

مانای جەستە -لێرەدا- بریتییە لە "دین"، چونکە بەهۆی دینەوە هەموو ئەندامەکان چاك دەبن یان تێکدەچن.

ریشەی تێکچوونی دڵ بریتییە لە وازهێنان لە دادگایی کردنی نەفس و لێپێچانەوەی، هەروەها فریوخواردن بە هیوا و ئاواتی دوور و درێژ، گەر چاکبوونی دڵی خۆتت دەوێت ئەوا لەپای ویست و لێبڕاندا رابوەستە، ئەو ختوورانەی روو لە ناخت دەکەن، کامەیان بۆ خودا بوو وەریبگرە و کامەیان بۆ غەیری خودا بوو وازی لێ بهێنە، بەردەوامی لە یادی مردن بکە بە کۆمەکی بۆ کورتبوونەوەی هیوا و خۆزگەکانت.

من بەوە گەیشتم ریشەی زیادەڕەوی بزواو لە دڵدا لەسەر بیستن و بینین و زمان و خواردن و پۆشاك دەردەکەوێت و رەنگ دەداتەوە، زیادەڕەوی لە بیستندا سەردەکێشێت بۆ سەهوکردن و بێئاگایی، و زیادەڕەوی لە بینیندا سەردەکێشێت بۆ بێئاگایی و وێڵی و سەراسیمەبوون، هەروەها زیادەڕەوی لە زماندا دەبێتە هۆی پێڕاکێشان و بیدعە لە ئاییندا، و زیادەڕەوی لە خۆراکدا سەردەکێشێت بۆ چڵێسی و حەزی زۆر، هەر بەو جۆرە زیادەڕەوی لە پۆشاکدا سەردەکێشێت بۆ لوتبەرزی و خۆبادان و فەخرکردن.

**بزانە،** پارێزگاری لە ئەندامەکانی جەستە فەرزە، و وازهێنان لە زیادەڕەویی فەزیلەتە، تەوبەش بەر لەوە فەرزە، خودا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) فەرزیان کردووە، خودای موتەعال دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا ﴾ التحریم: ٨، مانای "نصوحا" بریتییە لە وازهێنان لەو کارەی تەوبەی لێکردووە بۆ لای پەروەردگاری و نەگەڕانەوە بۆ سەری، پێغەمبەری خوداش (ﷺ) دەفەرموێت: ((ئەی

خەڵکینە، تەوبە بکەن بۆ لای پەروەردگارتان بەر لەوەی بمرن، بە کار و کردەوەی چاکە لە خودا نزیك ببنەوە بەر لەوەی سەرقاڵی رووتان لێ بکات))[١]

**تەوبە بە چوار شت دروست دەبێت:** کۆتاهاتنی سووربوونی دڵ لەسەر گەڕانەوە بۆ سەر گوناهان، و داوای لێخۆشبوون بە پەشیمانییەوە و گێڕانەوەی مافی ستەملێکراوان و حەقخوراوان، و پارێزگاری ئەندامەکان لە حەوت هەستەکە: بیستن و بینین و زمان و بۆن و دوو دەست و دوو لاق و دڵ کە ئەمیری هەموویانە و چاکبوونی جەستە و تێکچوونی جەستە بەهۆی ئەوەوەیە.

**خودا(سبحانه) لەسەر هەر ئەندامێك ئەمرێك و نەهییەکی فەرز کردووە، لەنێوانیان بەرینی زەمینەی موباحاتی داناوە و وازهێنان لێی دەبێتە فەزیلەت بۆ کەسەکە.**

**فەرزی دڵ-دوای ئیمان و تەوبەکردن-:** بریتییە لە ئیخلاص لە کاروکردەوەکاندا بۆ خودای موتەعال و باوەڕی دامەزراو و گومانی باش لە کاتی تەمومژ و لێڵیدا و متمانە بە خودا و ترسان لە سزای و رجا و هیوا بە فەزڵ و لێخۆشبوونی.

لەسەر مانای دڵ قسە و باسێکی زۆر ریوایەت کراون، لەوانە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەندێ لە باوەڕداران دڵم بۆی نەرم دەبێت))[٢].

هەروەها دەفەرموێت: ((حەق دێت و نوورێکی لەسەرە، ئاگاداری نهێنی و پەنهانەکانی دڵ بن))[٣]

---

[١] أخرجه ابن ماجة.

[٢] رواه الإمام أحمد.

[٣] لم أجد له أصلا في المراجع.

"ابن مسعود"-خوا لێی رازی بێت- دەفەرموێت: حەز و رووتێکردن و خاوبوونەوە و پشتهەڵکردن بۆ دڵان بوونیان هەیە، کاتی حەز و رووتێکردنی دڵ بەدەست بهێنن، و لە کاتی خاوبوونەوە و پشتهەڵکردنیش وازی لێ بهێنن.

"ابن مبارك"-رەحمەتی خودای لێ بێت- دەفەرموێت: دڵ وەك ئاوێنە وایە، گەر زۆر لە بەردەستدا بوو ژەنگ دەکات، هەروەها وەك ئاژەڵ گەر لێی بێئاگا بیت لادەدات.

**هەندێ لە حەکیمان دەڵێن:** دڵ وەك خانوویەك وایە کە شەش دەرگای هەیە، پاشان پێت وترا: ئاگادار بە لە یەکێك لەو شەش دەرگاوە شتێکی نەیار نەیەتە ژوورەوە و ماڵەکەت لێ تێکبدات، دڵ بریتییە لەو ماڵە و دەرگاکانیش بریتین لە: دوو چاو و زمان و بیستن و بینین و دوو دەست و دوو لاق، هەر کات یەکێك لەم دەرگانە نەزانانە کرایەوە ماڵەکەت لەدەست دەچێت.

**فەرزی زمان:** راستگۆیی لە رازیبوون و تووڕەبووندا، و وازهێنان لە بەکارهێنانی ئازاربەخشانە لە نهێنی و ئاشکرادا و گرتنەوەی لە فرەوێژی لە خێر و شەڕدا، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((هەر کەس نێوان دوو گۆنای و نێوان دوو لاقیم بۆ بپارێزێت لەسەر خودا بەهەشتی بۆ دەستەبەر دەکەم))[١]

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) بە "معاذ بن جبل"ی وت-خوا لێی رازی بێت-: ((بۆ مەگەر ئەوانەی بە روودا لە ئاگردا رادەکێشرێن چیترە جگە لە دروێنەی بەری زمانیان))[٢]

---

[١] أخرجه البخاري في صحيحه.

[٢] أخرجه الإمام أحمد والنسائي وابن ماجة والترمذي، وقال الترمذي "حديث حسن صحيح".

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((لە قسەی زیادە ئاگادارتان دەکەمەوە، ئەوەندە قسەکردن بەسە بۆ یەکێك لە ئێوە کە پێویستییەکانی پێ جێبەجێ بکات، مرۆڤ لە قسە زیادەکانی پرسیاری لێ دەکرێت وەك چۆن لە ماڵە زیادەکەی پرسیاری لێ دەکرێت))[١]

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((خودا لەگەڵ زمانی هەموو قسەکەرێکدایە، با هەر کەسێك لە خودا بترسێت لەوەی دەیەوێت بیڵێت))[٢]

**فەرزی بینین:** بریتییە لە چاوداخستن لە حەرام و وازهێنان لە سەرکێشان بۆ بینینی ئەو شتانەی شاراونەتەوە و پەردەیان بەسەردا دراوە، **"حذيفة"**-خوا لێی رازی بێت- دەفەرموێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ((نەزەر تیرێکی ژەهراوییە لە تیرە ژەهراوییەکانی ئیبلیس، هەر کەس لە ترسی خودا وازی لێ بهێنێت خودا ئیمانێکی پێ دەبەخشێت شیرینییەکەی لە دڵیدا دەبینێتەوە))[٣].

"أبو الدرداو"-خوا لێی رازی بێت- دەفەرموێت: هەر کەس چاوی لە نەزەری حەرام دابخات، چەندی بوێت لە حورلعەین لێی مارە دەکرێت، هەر کەس بڕوانێت بەسەر ماڵی خەڵکیدا خودا لە رۆژی دواییدا بە کوێری حەشری دەکات.

**"داود الطائي"** بەپیاوێکی وت- کە سەرنجێکی تیژی ئەوانەی دەدا کە سەرنجیان دەدا: (ئەی فلان، بینینت بگێڕەوە بۆ لای خۆت، چونکە پێمگەیشتووە مرۆڤ لەسەر بینینی زۆر پرسیاری لێ دەکرێت، وەك چۆن لەسەر کار و کردەوەی زیادە پرسیاری لێ دەکرێت).

---

[١] هذا ليس بحديث وإنما من كلام الصحابي عبدالله بن مسعود.

[٢] رواه أبو نعيم في "الحلية".

[٣] رواه الحاكم في المستدرك.

**وتراوە:** (بینینی یەكەم بۆ تۆیە، بەڵام بینینی دوای ئەوە بۆ تۆ نییە)، ئەوەی هێرش دەكاتە سەر بینین بەندە لێی بەرپرسیار نییە، ئەوەش بە هۆش و تێگەیشتنەوە چاو سەرنجی دەدات پرسیار لە بەندە دەكرێت دەربارەی.

**فەرزی بیستن:** شوێنی قسە و سەرنج دەكەوێت، هەر شتێك دروست نەبێت بیكەی بە قسە و سەرنجی بدەی بۆت حەڵاڵ نییە بیبیستی و گوێی بۆ بگری و چێژی لێ ببینیت، گەڕان بەدوای ئەوەی لێت شاراوەتەوە بریتییە لە تەجەسوس.

گوێگرتن لە لەهو و بەزم و گۆرانی و ئازاردانی موسڵمانان: هەروەك خوێن و مردارەوە بوو حەرامە.

**"عبدالله بن عمر"**-خوا لێیان رازی بێت- دەفەرموێت: (نەهیمان لێكرا لە غەیبەت و گوێگرتن بۆی و قسە ئەمبەرەبەر پێكردن و گوێگرتن بۆی).

پرسیار كرا لە **"القاسم بن محمد"** دەربارەی گوێگرتن لە گۆرانی؟ فەرمووی: (كاتێك لە رۆژی دواییدا خودا حەق لە باتڵ جیا دەكاتەوە، گۆرانی دەكەوێتە كام بەرەیانەوە؟ وترا: لە بەرەی باتڵدایە، فەرمووی: كەوابوو خۆت فتوا بۆ خۆت بكە).

هیچ ئەندامێكی جەستە -لەدوای زمان- بە قەدەر گوێ زیان بە بەندە ناگەیەنێت، چونكە خێراترین نێرراوە بۆ لای دڵ، و نزیكترینە لە تێكەوتنی فیتنەوە، لە **"وكیع بن الجراح"**ەوە باس كراوە، وتویەتی: بیست ساڵ لەمەوبەر قسەیەكم لە كەسێكی بیدعەچی بیست، تاكو ئێستا ناتوانم لە گوێم دەریبكەم، كاتێك كەسێكی بیدعەچی رووی لە **"طاووس"** بكردبایە هەردوو گوێی خۆی دەئاخنی تاكو قسەكانی نەبیستێت.

**فـەرزی بـۆنکردن:** دوای بیسـتن و بیـنین دەکـەوێت، هـەر شـتێك گـوێگرتن لێـی و سەرنجدانی حەلاڵ بێت بۆنکردنی دروستە، لە **"عمر بن عبدالعزیز"**ەوە-خوا لێـی رازی بێت- دەگێڕنەوە: میسکیان بـۆ هێنـا، ئـەویش لـوتی خـۆی گـرت، لـەو هەڵوێسـتەی پرسیاریان لێ کرد، ئەویش فەرمووی: بۆ سوود و قازانجەکەی چیترە جگە لە بۆنەکەی.

**فەرزی دوو دەست و دوو لاق:**_ئەوەیە کە درێژیان نەکەیت بۆ نـاو قەدەغـەکراوەکان و لە حـەق نەیانکێشـیتەوە، "مسـروق" دەفـەرمویت: بەنـدە هـیچ هـەنگاوێکی نـەناوە چاکەیەك یان خراپەیەکی بۆ نەنوسرابێت، کچەکەی سولەیمان بۆ "عبده بنت خالـد بـن معدان"ی نووسی: "سەردانم بکە"، "عبده"ش بۆی نووسی: "پاشان: باوکم -رەحمەتی خودای لێ بێت- لای ناپەسەند بوو هەنگاوێك هەڵبگرێت و رێگەیەك بگرێتە بـەر بـۆ خودای ئەنجام نەدابێت، یان خـواردنێکی خواردبێـت گـەر لـە رۆژی دواییـدا پرسـیاری لێکرا وەڵامێکی بـۆی نـەبێت، منـیش ئـەوەی بـاوکم لای ناپەسـەندە لام ناپەسـەندە، سەلامی خودا لێ بێت".

**گەر کەسێك بڵێت: چ رێگەیەك بوونی هەیە بۆ کارکردن بە ئەوە؟**

**دەوترێـت:** پەیوەسـت بـوون بـە رێگـە و رەوگـەی ئیمامـە خۆپارێزەکـان، هـەروەها سەرنجدان لە ئادابی ئەوانەی عەوداڵی ئیرشادکردنن و بێداربوونەوە لە خۆدادگایی کردن و کارکردنی میانەگیرانە و خۆگرتنەوە لە ئازاردانی خەڵکی و بەخشین بە بێ منـەت و رێگە و رەوگەی پەسەند بەبێ حەسادەت و قەناعەت بە خۆشەویسـتی خامۆشـییەوە و درێژی بێدەنگی بەهۆی حەزی سەلامەتییەوە و تەوازوع بۆ خـەڵکی بـەبێ نـامۆبوون و هۆگری بە یادی خوداوە لە تەنهاییدا و یەکلابوونەوەی دڵ بـۆ خزمـەت و کۆبوونـەوەی هیممەت بەهۆی چاودێرییەوە و داوای رزگاری لە رێگەی ئیستیقامەوە.

خودا -عز وجل- دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٣﴾ ﴾ الأحقاف: ١٣ -ئەوانەی وتیان: پەروەردگارمان"الله"یە و دواتر ئیستیقامەیان وەرگرت نە ترسیان لەسەرە و نە دڵتەنگ دەبن.

**"سفيان بن عبدالله الثقفي"** فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) شتێکم بۆ باس بکە دەستی پێوە بگرم، فەرمووی: ((بڵێ: ئیمانم هێنا بە خودا و پاشان لەسەری راوەستاو و دامەزراو بە))[1].

**"عمر بن الخطاب"**-خوا لێی رازی بێت- دەفەرموێت: **"استقاموا**-راوەستان و دامەزران" بۆ خودا بە گوێڕایەڵی کردنی و وەك پێچلێدانی رێوی پێچیان لێ نەدا.

**"أبو العالية الرياحي"** دەڵێت: **"استقاموا"** دین و بانگەواز و کرداریان بۆ خودا پاڵفتە کرد، بنچینەی ئیستیقامە لە سێ شتدایە: شوێنکەوتنی کتێبەکەی خودا، و سوننەت و پابەندبوون بە کۆمەڵی موسڵمانانەوە.

**بزانە،** رزگارترین رێگە بۆ بەندە بریتییە لە: کارکردن بە زانست و خۆکەناردان بە ترسەوە و بێنیازبوون بە خوداوە-عز وجل-، بە چاککردنی حاڵی خۆتەوە سەرقاڵ ببە، و هەژاری و ئاتاجی بۆ لای پەروەردگارت دەرببڕە، خۆت لە شوبوهات بەدوور بگرە، و ئاتاجییەکانت بۆ لای خەڵکی کەم بکەرەوە، ئەوەی بۆ نەفسی خۆت پێتخۆشە بۆ ئەوانیش پێتخۆش بێت، هەر بەو جۆرە ئەوەی بۆ خۆت پێتناخۆشە بۆ ئەوانیش پێت ناخۆش بێت، پەردە لەسەر داپۆشراوەکان لامەدە.

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه؟

لە ناوەوە گفتوگۆی گوناه لەگەڵ خۆت ئەنجام مەدە و بیری لێ مەکەرەوە، و لەسەر گوناهە بچووکەکان بەردەوام مەبە، و لە هەر تەنگانە و ترسێکدا بۆ لای خودا هەڵبێ، و لە هەموو حاڵ و بارێکدا پێی ئاتاج ببە، و لە هەموو کارێکدا تەوەکولی پێ ببەستە، و لە ئارەزوو کەنارگیر ببە و رازی مەبە بە تەنها چاوەڕوانی بۆ نەفسی خۆت، ناوی خۆت بشارەوە، و شوکرت بۆ خودا بەردەوام بکە، و زۆر داوای لێخۆشبوون لە خودا بکە و بە تێڕامان پەند و ئامۆژگاری وەربگرە.

لە میانەی پەلەکردندا هێواش و لەسەرخۆ بە، لە تێکەڵبووندا ئەدەبی جوان و باشت هەبێت، بۆ نەفسی خۆت تووڕەیی بەسەر خەڵکیدا مەڕێژە، بۆ خودا لە نەفسی خۆت تووڕە ببە، لە خراپەدا مەبە بە هاوتا و هاوشانی هیچ کەسێك، خۆت لە مەدح کردنی کەسی نەزان بە نەفسی بپارێزە، و لە هیچ کەسێك بۆ نەفسی خۆت قبووڵی مەکە، پێکەنین کەم بکەرەوە و خۆت لە شۆخیکردن بەدوور بگرە.

ئێش و ئازارەکانت بشارەوە، و عیففەت نیشان بدە و متمانە بخەرە ناوەوە، هەست بە دەستەوسانی و هەژاری باشی خۆت بکە، لەسەر ئەوەی تووشت دەبێت ئارام بگرە، و رازی ببە بەوەی خودا بۆ تۆی بڕیوەتەوە، یەقینت بە بەڵێنەکانی خودا هەبێت و ترست لە ئاسەواری کردەوەکانی خۆت هەبێت، ئەو شتەی بەشت دەکات زۆر لەخۆکردنی تێدا مەکە، ئەو شتەی داوات لێکراوە لەدەستی مەدە، لە هەموو بەخششەکانی خودا هەست بە هەژاری بکە بۆ لای، و هیوای رزگاربوون و سەرفرازی لە خودا بکە.

لەوەی ستەمی لێکردووی خۆشببە، ئەوەی بێبەشی کردووی پێی ببەخشە، ئەو کەسەی پەتی پەیوەندی لەگەڵ پچڕیویت سەردانی بکە، ئەو کەسەی تۆی خۆشدەوێت

تۆش لەبەر خودا لە خۆت پێشتر مامەڵەی لەگەڵ بکە، بۆ براکانت نەفس و ماڵت ببەخشە، مافەکانی خودا لە دینەکەتدا پارێزگاری لێ بکە، ئەنجامدانی کارە گەورەکانت لە چاکە لا سەخت و دژوار نەبێت، کارە بچووکەکانیش لە خراپە بە کەم تەماشا مەکە.

خۆت بپارێزە لە زرق و برقی خۆڕازاندنەوە بە زانست، وەك چۆن خۆت بە دوور دەگریت لە خۆپەسەندی لە کار و کردەوەکاندا، باوەڕت بە ئەدەبێکی ناوەکی نەبێت ئاشکرایەك لە زانست هەڵیدەوەشێنێتەوە، گوێڕایەڵی خودا ببە بە یاخیبوون لە خەڵکی، گوێڕایەڵی خەڵکی مەکە بە یاخیبوون لە خودا، هەرچی تێکۆشانتە بۆ خودا بەختی بکە و شتێك پاشەکەوت مەکە، بۆ خودا لە کارەکانت رازی مەبە، لە نوێژەکانتدا بە گشتی خۆت بخە بەردەستی خودا، ئەو زەکاتەی خودا لەسەرت فەرزی کردووە چالاکانە و خۆشحاڵانە دەریبکە، رۆژووەکەت لە درۆ و غەیبەت بپارێزە.

ریعایەتی مافی جیران و گەدا و خزم و کەسوکار بکە، خانەوادەی خۆت ئەدەب دابدە، و لەگەڵ ئەوانەی ژێردەستەی تۆن نەرم و نیان بە، راوەستاو بە چالاکانە وەك چۆن فەرمانت پێکراوە، گەر بۆ خێرێك بزوێنرایت بە پەلە ئەنجامی بدە، ئەوەی لێت ئالۆز دەبێت و تەمومژاوییە وازی لێ بهێنە، پەیوەست ببە بە بەزەییەوە بۆ باوەڕداران، لە هەر کوێ بوویت حەق بڵێ.

سوێندی زۆر مەخۆ با راستیش بکەیت، زۆر قسە مەکە با زمانیشت رەوان بێت، زۆر لەخۆکردن لە ئاییندا مەنوێنە با کەسێکی زاناش بیت، بەر لە هەموو گوفتارێك زانست پێش بخە، پەیوەست ببە بە سۆز و بەزەییەوە لەدوای تێکۆشان، موداراتی

خەڵکی بکە تا ئەو شوێنەی دینەکەت سەلامەتە، لە رەگوریشەوە خۆت لە رووپامایی بەدوور بگرە.

بەرەوشتی جوان تێکەڵ ببە خەڵکی ببە، شەرم مەکە لەوەی بڵێیت "خودا باشتر دەزانێت" لەو شتەی کە نایزانیت.

قسەکانت لای ئەوانە باس مەکە کە نایانەوێت، دینەکەت مەبەخشە بە کەسێك دینت لا ناشیرین دەکات، خۆت رووبەڕووی بەڵایەك مەکەرەوە کە لە توانای تۆدا نییە، نەفسی خۆت بەڕێز رابگرە لە کەسانێك سووکایەتی پێ دەکەن، هیممەت لە ئەخلاقی نزم بە پاك رابگرە، تەنها برایەتی کەسی ئەمین بکە، نهێنییەکانت بۆ هەموو خەڵکی والا مەکە، سنوور بەزێنی مەکە بۆ سەر حاڵی هیچ کەس، و بە زانستێك گفتوگۆی لەگەڵ مەکە ئەقڵی پەی پێ نابات و تێیناگات، مەچۆ ناو کار و بارێکەوە بانگ نەکراوی بۆ سەری.

مەجلیسی زانایان بە گەورە و مەزن تەماشا بکە، رێز و پلە و پایەی حەکیمەکان بزانە، بەخشین و کاری چاکە و خزمەت واز لێ مەهێنە، پشت هەڵبکە لە نەزانان، و لەگەڵ گێل و گەمژەکاندا حەلیم بە، و لە کار و بارەکانتدا راوێژ بەوانە بکە ترسی خودایان لە دڵدایە.

برا ستەملێکراوەکەت سەربخە، بیگێڕەرەوە بۆ سەر حەق ئەگەر ستەمکار بوو، ئەو مافەی ئەو لەسەر تۆ هەیەتی پێی ببەخشە، و داوای مافی خۆت لە ئەو مەکە، لەگەڵ کەسی قەرزداردا ئاسانکاری بکە، لەگەڵ بێوەژنان و هەتیواندا دڵنەرم و لەسەرخۆ بە، رێزی ئارامگران لە هەژاران بگرە، و بەزەییت بێتەوە بە ئەهلی بەلا لە دەوڵەمەندان، حەسوودی بە هیچ کەسێك مەبە لەسەر نیعمەتێك.

غەیبەتی هیچ کەسێك مەکە، بە ترسان لە پرسیاری خودایی دەرگای گومانی خراپ لەسەر نەفسی خۆت دابخە، دەرگای گومانی باش بە بەرینی پاساو و بیانوو بکەرەوە، دەرگای تەماع بە بێهیوا بوون دابخە، بە قەناعەتەوە لە دەرگای دەوڵەمەندی و بێنیازبوون بدە، یادی خودا پاك رابگرە لە شتی ناپەسەند دانە پاڵ خودا.

کاتەکانت بەدەستبهێنە، بزانە شەو و رۆژ بە چییەوە دەڕۆن، هەموو کاتێك تەوبە نوێ بکەرەوە، **تەمەنی خۆت بکە بە سێ سات،** ساتێك بۆ زانست، ساتێك بۆ کردار، ساتێکیش بۆ مافی نەفسی خۆت و ئەوەی بە تۆوە پەیوەستە، پەند و ئامۆژگاری وەربگرە لەوەی گوزەری کردووە، بیر لە چارەنووسی ئەو دەستەیە بکەرەوە لە بەردەم خودادا رادەوەستێنرێن: دەستەیەك بە رازیبوونی خوداوە بۆ بەهەشت و دەستەیەك بە خەشم و تووڕەیی خوداوە بۆ دۆزەخ، نزیکی خودا لە خۆتەوە بناسەرەوە، رێزی ئەو فریشتانە بگرە لەگەڵ تۆن و کار و کردەوەکانت تۆمار دەکەن، نیعمەتەکانی خودا بە تێگەیشتنەوە دەست بۆ ببە، بە مەدح و سەنا و شوکرکردنی بیگێڕەرەوە بۆ لای خودا، خۆت بەدوور بگرە لە تۆمەتبار کردنی نەفس بە بینینی مەقامەکان و سووك تەماشاکردنی حەق بەهۆی بێباکی خەڵکەوە، چونکە ژەهرێکی کوشندەیە، بە نزیکبوونەوەی کاتی مردن خۆت رزگار بکە لە ترسی بەربوونەوە لەبەر چاوی خەڵکی بە ترسان لە تووڕەبوونیان و ترسان لە هەژاری و ئاتاجی، چەندە دەتوانی شوێنەواری خۆت بزر بکە، لە کاتی راوێژکردندا تێکۆشانی خۆت بکە، لێبڕاوانە خۆشویستنەکانت لەبەر خودا بێت و دابڕانەکانت بۆ خودا بێت، تەنها هاوەڵی کەسی خۆپارێز و زانا بکە، ببە بە فێرکەری ئەوانەی لە دوای تۆوەن لە ئوممەتی موسڵمان، ئیمامی تەقواداران و ئەشکەوتی عەودالاَتی ئیرشاد بە.

سکالاّی خۆت لای هیچ کەس دەرمەبڕە، بە دینەکەت دونیا بەدەست مەهێنە، بەشی خۆت لە کانارگێری بەدەست بهێنە، و تەنها دەست بۆ حەلاڵ ببە و دووربکەوەرەوە لە ئیسراف، لە دونیادا بە ژیانێکی سەروبەر رازی ببە.

لە بێستانی زانستدا بە دوای ئەدەبدا بگەڕێ، هەر بەو جۆرە لە شوێن و جێگەی تەنهاییدا بەدوای هۆگریدا، لە شیوەکانی نەفسدا بەدوای حەیادا، و لە دۆڵەکانی بیردا بەدوای پەند و ئامۆژگاری، و لە باخچەی ترسان لە خودادا بەدوای حیکمەتدا بگەڕێ، بەردەوامی چاکەی خودا لەسەر خۆت بناسەرەوە لەگەڵ سەرپێچییەکانی تۆ لە فەرمانەکانی، هەروەها حیلمی خودا بەرانبەر بە تۆ لەگەڵ پشتهەڵکردنت لە یادی ئەو، هەر بەو جۆرە ستری خودا لەسەر تۆ لەگەڵ بێشەرمی تۆ بەرانبەر بە خودا، لە کۆتاییشدا بێنیازی خودا لە تۆ و ئاتاجی و هەژاری تۆ بە خودا.

زانا بە پەروەردگاری لە کوێیە؟ ترساو لە گوناهانی لە کوێیە؟ دڵخۆش بە نزیکی لە خودا لە کوێیە؟ سەرقاڵ بە زیکری خوداوە لە کوێوە؟ گریاو و دڵتەنگ لە دووری خودا لە کوێیە؟ ئەمە ئەوانەیە کە خودا لێیان خۆش دەبێت ئەی مرۆڤی لەخۆبایی بوو! ئایا خودای بەرز و شکۆمەند تۆ نابینێت کە هەتکی داپۆشراوەکانت کردووە و پەردەت لەسەر لاداون؟!

**بزانە،** ئەی برام، گوناه غەفڵەت بەرهەم دەهێنێت، بێئاگاییش دڵڕەقی لێوە پەیدا دەبێت، و دڵڕەقیش دوورکەوتنەوە لە خودا پەیدا دەکات، و دوورکەوتنەوەش لە خودا سەرئەنجامەکەی ئاگرە، تەنها کەسە زیندووەکان بیر لەم راستییە دەکەنەوە، بەلاّم مردووان بە خۆشەویستی دونیا دڵی خۆیان مراندووە.

**بزانه،** وەك چۆن تیشكی خۆر سوودێكی بۆ كەسی كوێر نییە، هەر بەو جۆرە تەنها ئەهلی تەقوا بە زانست روناك دەبنەوە، وەك چۆن مردوو سوود و قازانجێك لە دەوادا نابینێتەوە، هەر بەو جۆرە ئەدەب سوودێك بە ئەهلی بانگەشە ناگەیەنێت، هەروەها وەك چۆن بارانی لێزمە لەسەر بەردی ساف و لووس هیچ نارِوێنێت بەهەمان شێوە دڵی پڕ بوو لە خۆشەویستی دونیا حیكمەت بەرهەم ناهێنێت، هەر كەس ئالوودەی ئارەزووەكانی بوو ئەدەبی كەم دەبێتەوە، هەر كەس سەرپێچی رێنومایی زانستی خۆی بكات نەزانینی زۆر دەبێت، هەر كەسێك دەوا و دەرمانەكانی سوود بە خۆی نەگەیەنن چۆن دەتوانێت خەڵكی تری پێ چارەسەر بكات؟!

**بزانه،** ئاسوودەترین جەستە ئەهلی زوهدن لە دونیا، ماندووترین دڵان و سەرقاڵترینیان ئەهلی گرنگیدانن بە دونیا، كۆمەكترین ئەخلاقێك بە زوهد بریتییە لە كورتی خۆزگە و ئاواتەكان، نزیكترین حاڵی ئەهلی مەعریفەت بریتییە لە یادی راستبوونەوە بۆ خودا -عز وجل- خودای موتەعال دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ۝١﴾ النساء: ١ -خودا لەسەر ئێوە چاودێرە.

**بزانه،** هیچ رێگەیەك نزیكتر نییە بۆ گەیشتن بە خودا لە رێگەی "صدق"، هیچ رێنومایی و بەڵگە و نیشانەیەك لە زانست سەركەوتووتر نییە، هیچ توێشوویەك بە ئەندازەی تەقوا كاریگەرتر نییە، هیچ شتێكم نەبینیوە بە ئەندازەی وازهێنان لە زیادەڕەوی لابەر و تیابەری وەسوەسە بێت، هیچ شتێك بە قەدەر سەلامەتی سینە دڵ رۆشن ناكاتەوە، من ئەوەم زانی رێز و پایەی باوەڕدار بە تەقواكەیەوەیە، وحیلمەكەی لە ئارامگرتندایە و ئەقڵ و هۆشی لە جوانكاریدایە و خۆشەویستییەكەی لە لێبووردەیی و تێپەڕاندندایە، و گەورەییەكەی لە تەوازوع و نەرمونیانیدایە.

**بزانه**، خۆشەویستی بۆ دەوڵەمەندی-لەگەڵ هەڵبژاردنی هەژاری بۆ تۆ لەلای خوداوە- خۆ خستنە ناو خەشم وتووڕەیی خودایە، هەر بەو جۆرە خۆشەویستی بۆ هەژاریی-لەگەڵ هەڵبژاردنی دەوڵەمەندی بۆ تۆ لە لای خوداوە- زوڵم و زۆرە، هەموو ئەوەش هەڵهاتنە لە شوکر بەهۆی کەمی مەعریفەوە، و تیابردنی کاتەکانە بەهۆی کەموکورتی زانستەوە.

ئەوەش چونکە ئیمانی دەوڵەمەند هەژاری چاك و بەهێزی ناکات، و ئیمانی هەژاریش دەوڵەمەندی چاك و بەهێزی ناکات، وەك لە فەرموودەدا هاتووە، خودای موتەعال دەفەرموێت: ((هەندێ لە بەندەکانم تەنها هەژاری ئیمانەکەیان چاك و باش دەکات، گەر دەوڵەمەندی بکەم دەوڵەمەندییەکەی ئیمانەکەی تێکدەدات، هەندێك لە بەندەکانم تەنها دەوڵەمەندی ئیمانەکەی چاك و بەهێز دەکات، گەر هەژاری بکەم هەژارییەکە ئیمانەکەی تێکدەدات))[١]

هەر بەو جۆرە لە تەندروستی و نەخۆشیدا، هەر کەس خودا بناسێت تۆمەتباری ناکات، هەر کەس لە خوداوە تێگەیشت بە بڕیارەکانی رازی دەبێت، گەر تەنها ئەم ئایەتە بۆ ئەهلی زانست بوونی هەبوایە بەسیان بوو: ﴿وَرَبُّكَ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخۡتَارُۗ مَا كَانَ لَهُمُ ٱلۡخِيَرَةُ﴾القصص: ٦٨، پەروەردگارت ئەوەی بیەوێت دروستی دەکات و هەڵیدەبژێرێت، ئەوان هەڵبژاردنیان بۆ نییە.

لە ئەخلاقی نەفامان و مەجلیسی گوناهباران، و بانگەشەی خۆپەسەندان و بێهیوایی رەشبینان خۆت بەدوور بگرە، کار بە حەق بکە و متمانەت بە خودا هەبێت و ئەمر بە

---

[١] هذا جزء من حديث قدسي ضعيف، رواه أبو يعلى والبزار والطبراني وابن أبي الدنيا والترمذي وأبو نعيم والبيهقي وابن عساكر.

چاکە و نەهی لە خراپە بکە، چونکە هەر کەس لەگەڵ خودادا ڕاست بکات خودا ئامۆژگاری دەکات، هەر کەس لای غەیری خودا خۆی جوان و باش بکات سووك و رسوای دەکات، هەر کەس پشت بە خودا ببەستێت خودا بێنیازی دەکات، هەر کەس متمانەی بە غەیری خودا بێت خەشمی لێ دەگرێت، هەر کەس لێی بترسێت ئاسایشی پێ دەبەخشێت، هەر کەس شوکری بکات بۆی زیاد دەکات، هەر کەس گوێڕایەڵی خودا بکات خودا ڕێزی لێ دەگرێت، هەر کەس خودا هەڵیبژێرێت خودا خۆشی دەوێت.

خۆت بەدوور بگرە لە دینداری بۆ خودا بە ئەقڵ و کارکردن بە ئارەزوو، چونکە واز لە حەق دەهێنی و لەناو باتڵدا نیشتەجێ دەبیت، ئەو کات تۆ داوای لێخۆشبوون لە خودا دەکەی و ڕێگەی تەوبەکردنت لەبیرچۆتەوە.

**بزانە،** تەنها ئەوەی لە زانست و کردار بە یەقین ئەسڵەکەی جێگیر بووە و لقەکەی بە صدق بەرزبووەتەوە و رووەکەکەی بە وەرع بەری گرتووە و بەڵگەکەی بە بەخشینی بەزەیی راوەستاوە و بە ترسان لە خودا پەردەکانی دادراونەتەوە جێگەی رەزامەندی خودایە، بۆیە رازی مەبە بە خاوبوونەوە و تەمبەڵی لە نەفست، چونکە بیانوو و پاساو بۆ هیچ کەسێك لە زیادەڕەویدا بوونی نییە، و هیچ کەسێکیش ناتوانێت لە خودا بێنیاز ببێت.

**بزانە، لە بەختەوەری مرۆڤ ئەوەیە کە:**

**یەکەم:** نیەتی باش بێت لە هەموو ئەوانەی لەلای خودایە.

**و دووەم:** خودا کۆمەکی و یارمەتی بکات لە هەموو ئەو کار و کردەوانەی کە خودا خۆشیدەون، هەر کەس خودا خێری بۆ بوێت ئەقڵی پێ دەبەخشێت و زانستی لا شیرین دەکات، و ترس لە خودا لە دڵیدا دەڕوێنێت و لە رەوشتی نەرمونیایدا بەکاری دەهێنێت و بە قەناعەت دەوڵەمەندی دەکات و نەنگی و ناتەواوییەکانی خۆی پێ نیشان دەدات.

**بزانە-خودا رەحمت پێ بکات- صدق و ئیخلاص: ئەسڵی هەموو حاڵێکن، لە صدقەوە** ئارامگرتن و قەناعەت و زوهد و رازیبوون و هۆگری بە خوداوە پەیدا دەبێت، لە **ئیخلاصەوە** یەقین و ترس و خۆشەویستی و شکۆمەندی دانە پاڵ خودا و حەیا و بەمەزنڕاگرتن سەرهەڵدەدەن.

لە هەریەك لەم مەقامانەدا بۆ کەسی باوەڕدار جێگەیەك هەیە حاڵی ئەو کەسەی پێ دەناسرێتەوە، بۆ نموونە دەوترێت: لەخوداترسە و رجای تێدایە، کەسێکی خاوەن رجایە و ترسی تێدایە، هەروەها کەسێکی ئارامگرە و رازیبوونی تێدایە و خۆشەویستە و حەیای تێدایە، بەهێزی و لاوازی هەر حاڵێك لەم حاڵانە بەپێی ئیمان و مەعریفەی کەسەکەیە.

**بۆ هەر ئەسڵێك لەم حاڵانە سێ نیشانە بوونی هەیە حاڵەکەی پێ دەناسرێتەوە:**

- **صدق لە سێ شتدایە و دەستەبەر نابێت بەو سیانەوە نەبێت:**

١. صدقی دڵ بە دەستەبەربوونی ئیمان.

٢. و صدقی نیەت لە کار و کردەوەکاندا.

٣. و صدقی قسە لە دەربڕیندا.

- **ئارامگرتنیش لە سێ شتدایە** کە تەنها بەو سیانەوە دەستەبەر دەبێت:

١. ئارامگرتن لەسەر نزیکنەبوونەوە لە حەرامەکان کە سنوورەکانی خودان.

٢. ئارامگرتن لە شوێنکەوتنی ئەمری خودا.

٣. و ئارامگرتن لەسەر بەلا و موسیبەتەکان لە پێناوی خودادا.

- **قەناعەتیش لە سێ شتدایە:**

١. کەمی خۆراك لەدوای بوون و بەدەستهێنانی.

٢. و پارێزگاری لە هەژاری لە کاتی نەبوونی و کەمی هۆکارەکانیدا.

٣. و سوکنایی بۆ لای کاتەکانی خودا -عز وجل- لەگەڵ داباریینی نەبوونی و پێویستیدا.

**بۆ قەناعەتیش یەکەمین و دواهەمین هەیە،**

**یەکەمینی بریتییە لە:** وازهێنان لە زیادەڕەوی لەگەڵ بوونی بەرینیدا.

**دواهەمینیان بریتییە لە** دەوڵەمەندی لەگەڵ لەدەستدانی هۆکارەکانیدا.

لێرەدا هەندێکیان دەڵێن: "قەناعەت بالاترە لە رازیبوون"، مەبەستی لە تەواوی قەناعەتە، چونکە کەسی رازی رووبەڕووی لێگرتنەوە و پێبەخشین نابێتەوە، کەسی قانعیش بە پەروەردگارییەوە دەوڵەمەندە، حەزی بە زیادەیەك نییە لەگەڵی تاکو ئەو بۆ زیادەکە بێت، مەگەر لە خوداوە بێت بۆ ئەو.

- **زوهدیش لە سێ شتدایە**-پێی ناوترێت زاهید بەو سیانە نەبێت:

١. رووتکردنەوەی دەست لە ئەملاك.

٢. و پاکێتی نەفس لە حەلاڵ.

٣. و خۆ وێڵکردن لە دونیا بە بوونی کاتی زۆر لەگەڵ خودادا.

- **بە سێ شتی تر دەبێت بە کەسێکی زۆرلەخۆکەر لە زوهددا:**

١. گەرم داهاتنی نەفس لە کاتی بەدواییەکتردا هاتنی ویستەکان.

٢. و هەڵهاتن لە شوێن و جێگەی دەوڵەمەندی.

٣. و وەرگرتنی زانراو لە کاتی پێویستدا.

- **هۆگریش لە سێ شتدایە:**

١. هۆگری بە زانست و زیکرەوە لە تەنھاییدا.

٢. هۆگری بە یەقین و مەعریفەوە لەگەڵ تەنھاییدا.

٣. و هۆگری بە خوداوە -عز وجل- لە هەموو حاڵ و بارێکدا.

رازیبوون رشتەی خۆشەویستی و گیانی تەوەکول و رۆحی یەقینە، لە **"أيوب السختياني و الفضيل بن عياض"**ەوە -رەحمەتی خودایان لێ بێت- گێڕراوەتەوە وتویانە: رازیبوون بریتییە لە تەوەکول.

ئەمە بریتی بوو لە لقەکانی صدق کە بە وەسفی زانستەوە دەستی بۆ دەبرێت، **"سفيان الثوري"**-رەحمەتی خودای لێ بێت- دەیفەرموو: گەر صدقی کەسی صادق کامڵ بوو نابێتە خاوەنی ئەوەی لەدەستیدایە.

**لقەکانی ئیخلاصیش:** کەسی موخلیص پێی ناوترێت موخلیص تا خودا لە هاوشێوە و هاوشان و دژ و هاوسەر و منداڵ تاکوتەنها نەکاتەوە، پاشان خوداویستی بە راستکردنەوەی یەکتاپەرستی، و کۆکردنەوەی هیممەت و هەوڵی بۆ خودا و بە خوداوە لە فەرزەکان و سوننەتەکاندا.

- **دروستیی یەقین لە سێ شتدایە:**

١. سوکنایی دڵ بۆ لای متمانە بە خودا.

٢. و گەردنکەچبوون و ملدان بە فەرمانەکانی خودا.

٣. و ترس و لەرزین لە زانستی پێشکەوتووی خودا لەسەر تۆ.

**یەقینیش یەکەمین و دواهەمینی بۆ هەیە،**

**یەکەمینەکەی:** دڵنیاییە، **دواهەمینەکەی:** تەنها کردنەوەی خودایە بۆ خۆت و بەسبوونی خودا بۆ تۆ، خودا -عز وجل- دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسۡبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٦٤ ﴾ الأنفال: ٦٤، "الحسب" بریتییە لە "الکافی-کەسێك کە لە هەموو شتێکی تر بێنیازت بکات و بەشت بکات"، "المکتفی"یش بریتییە لە بەندەیەکی رازی بە بڕیاری خودا.

وتمان: دواهەمین یەقین لە بوونی وەسفی بەندەوەیە لە مەقامی ئیماندا نەك لە دواهەمینی یەقیندا لە زانستدا، هیچ یەکێك لە دروستکراوەکانی خودا ناگاتە ئەوە، وەك پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرموێت: ((هیچ کەس ناتوانێت بگاتە کونە و حەقیقەتی خودا)) وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا: ئێمە پێمان گەیشتووە عیسای کوڕی مەریەم (**علیه السلام**) بەسەر ئاودا دەڕۆیشت؟ فەرمووی: ((گەر کەسێك یەقین و ترسی زیاد بکات بە هەواشدا دەڕوات))[1]

ترس لە دوای یەقینەوەیە، ئایا کەسێکت بینیوە لەخودا بترسێت و یەقینی پێی نەبێت؟

---

[1] قال الحافظ العراقي في تخريجه"المعروف أنه من قول بكر بن عبدالله المزني"، رواه ابن أبي الدنيا في "كتاب اليقين".

- **ترس لە سێ شتدایە:**

١. **ترسی ئیمان** کە نیشانەکەی بریتییە لە دوورکەوتنەوە لە یاخیبوون و گوناه، ئەمەش بریتییە لە ترسی موریدان.

٢. **ترسی پێشین** کە نیشانەکەی بریتییە لە خۆپارێزی و وەرع، ئەمەش بریتییە لە ترسی زانایان.

٣. لەگەڵ **ترسی تیاچوون** کە نیشانەکەی بریتییە لە بەختکردنی هەوڵ و کۆشان لە رەزامەندی خودادا بە بوونی هەیبەت و شکۆمەندی بۆ خودا -عز وجل-، ئەمەشیان بریتییە لە ترسی راستگۆیان (خوف الصديقين).

**مەقامی چوارەم** لە ترس خودا فریشتەکان و پێغەمبەرانی (**عليهم السلام**) پێ تایبەت کردووە، ئەوەش بریتییە لە **ترسی بەمەزنڕاگرتن**، چونکە لە ناخیاندا بە ئاسایشی خودا بۆیان ئاسایشیان وەرگرتووە، بۆیە ترسەکەیان بریتییە لە بەندایەتی کردن بۆ خودا بە دانەپاڵی شکۆمەندی و مەزنی بۆ خودای موتەعال.

- **خۆشەویستیش لە سێ شتدایە -پێی ناوترێت خوداویست تا ئەو سیانەی تێدا نەبێت-**

١. **خۆشەویستی بۆ باوەڕداران** لە پێناوی خودادا -عز وجل- نیشانەی ئەمە: کێشانەوەی دەستی ئازارە لە ئەوان، و راکێشانی سوود و قازانجە بۆیان.

٢. **خۆشەویستی پێغەمبەر** (ﷺ) **لە پێناوی خودادا -عز وجل-:** نیشانەی ئەمە شوێنکەوتنی سوننەتەکانییەتی، خودا -عز وجل- دەفەرموێت: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ

تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ ﴾ آل عمران: ٣١- بڵێ گەر خوداتان خۆشدەوێت شوێنی من بکەون خودا خۆشیدەوون.

٣. لەگەڵ **خۆشەویستی خودا -عز وجل-** لە هەڵبژاردنی گوێڕایەڵی بەسەر یاخیبووندا، وتراوە: "یادی نیعمەت خۆشەویستی پەیدا دەکات".

**بۆ خۆشەویستیش یەکەمین و دواهەمین هەیە،**

**یەکەمینی:** بریتییە لە خۆشەویستی خودا بەهۆی ئەو گشتە نیعمەت و منەتەوە لەسەرمان، "ابن مسعود" دەفەرموێت: (دڵ راهاتووە لەسەر خۆشویستنی ئەو کەسەی چاکەی لەگەڵ دەکات).

**لوتکەی خۆشەویستی خودا** بریتییە لە خۆشەویستی بۆ واجبوونی حەقی خودا -عز وجل- "**علي بن الفضيل**"-رەحمەتی خودای لێ بێت- دەفەرموێت: بۆیە "الله" خۆشدەویسترێت، چونکە "الله"یە.

پیاوێك بە "**طاووس**"ی وت: ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی: ئامۆژگاریت دەکەم بەجۆرێك خودات خۆشبوێت تا هیچ شتێك بوونی نەبێت بە ئەندازەی ئەو خۆشتبوێت، بەجۆرێك لێی بترسە تا هیچ شتێك بوونی نەبێت بە ئەندازەی ئەو لێی بترسیت، ئەوەی بۆ خۆت پێی رازیت بۆ خەڵکیش پێی رازی بە، هەستە و بڕۆ تەورات و ئینجیل و زەبوور و فورقانم -لەو چەند وشەدا- بۆ کۆکردییەوە.

بەشکۆمەندزانین و بەمەزنزانین بەرانبەر بە حەیا وەکو سەر وایە بەرانبەر بە جەستە کە هیچ کامیان بەبێ ئەویتریان بوون و زیندەگی بۆ نییە، کاتێك بەندە لە پەروەردگاری شەرم بکات بە مەزن رایدەگرێت، باشترین حەیا بریتییە لە چاودێری خودا -عز وجل-

- **چاودێری خودا لە سێ شتدایە:**

١. چاودێری خودا لە گوێڕایەڵی کردنیدا بە کردار.

٢. و چاودێری خودا لە یاخیبوونیدا بە وازهێنان لە حەرامەکان و چاودێری خودا لە هیممەت و خەیاڵ و خوتوورەتی دەروونـدا، بەپێی ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەفەرموێت: ((خودا بپەرستە وەك ئەوەی دەیبینیت، گەر تۆ ئەو نەبینیت ئەوا ئەو تۆ دەبینێت))[١]

٣. چاودێری دڵ بۆ خودا -عز وجل- ماندووبوونی لەسەر جەستە زۆر زیاترە لە هەستان بۆ شەونوێژ و رۆژووگرتن و بەخشینی ماڵ لە رێگەی خودادا.

لە **"علي بن أبي الطالب"**ەوە -خوا لێی رازی بێت- دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: (بۆ خودا لە زەوییەکەیدا کۆمەڵێك دەفر هەن، لە هەندێك لەو دەفرانەدا دڵان بوونیان هەیە، تەنها ئەوانە قبووڵ دەکات کە پاك و دامەزراو و نەرمن)[٢]

مانای ئەمە ئەوەیە کە بۆ خودا -عز وجل- دڵ خاوێن بکرێتەوە بە شوێنکەوتنی ئەمر و نەهی و بینینی صدق و ترس، هەروەها بۆ پێغەمبەر (ﷺ) خاوێن بکرێتەوە بە قبولْ کردنی ئەوەی هێناویەتی لە قسە و کردار و نیەت، هەروەها بۆ باوەڕداران پاکی بکاتەوە بە گرتنەوەی ئازار لێیان و پێگەیاندنی سوود و قازانج پێیان.

مانای ئەو قسەی ئیمام عەلی کە دەفەرموێت"دامەزراو" بێت ئەوەیە: کە لە جێبەجێ کردنی سنوورەکانی خودادا و لە راپەڕاندنی ئەمر بە چاکە و رێگری لە خراپەدا بەهێز بێت.

---

[١] تقدم تخريجه.

[٢] رواه الإمام أحمد في "كتاب الزهد" من كلام خالد بن معدان بنحو هذا اللفظ.

**ئەو بەشەی قسەکەی کە دەفەرموێت: "نەرم و نیان بێت": نەرم و نیانی دوو رووی هەیە:**

١. نەرم و نیانییەك کە گریان دادەبارێنێت.

٢. لەگەڵ نەرم و نیانییەك کە سۆز و بەزەیی لەگەڵ خۆی دەهێنێت، کۆمەك هەر بە خودایە و حسبنا الله ونعم الوكيل.

**الحمد لله على فضله ونعمته**

لە بەرواری ٢٠١٥/٦/٢٦

وەرگێڕان و پێداچوونەوەی تەواو بوون.

وەرگێڕ/ سلێمانی

  

## بسم الله الرحمن الرحیم

داوای کۆمەکیت لێدەکەین ئەی خودای موتەعال.

## سەرەتای گەڕانەوە بۆ لای خودا



**"أبو عبدالله الحارث بن أسد المحاسبي"** دەفەرموێت:

وتم: سەرەتای ئەو کەسانەی بۆ لای خودا دەگەڕێنەوە چۆنە؟

وتی: سەرەتای ئەو کەسەی روو لە پەروەردگاری دەکات و کار بۆ رەزامەندی ئەو دەکات بریتییە لە: ناسینی خودا -عز وجل- و ئەوەی بەڵێنی داوە لە پاداشت و سزا و هەڕەشە،و ناسینی(ئاشنایی) بە خودی خۆی، خراپەی حەزەکانی نەفس و لاوازییەکانی لەدەستبردن بۆ رزگاری خۆی لە دوارۆژدا، بە ئەدەبی خودایی ئەدەبی ئەو نەفسە دادەدات، و بۆ لای خۆشەویستی خودا -عز وجل- رێگەی راست و دروست دەگرێتە بەر.

### ناسینی خودا:

وتم سەرەتای هەموو ئەوانە چۆنە، تا بە ئەدەبی مەولای خۆی ئەدەبی نەفسی دادات؟

وتی: سەرەتای هەموو ئەوانە: خودا -سبحانه وتعالی- یادی خۆی و یادی دوارۆژ دەخاتە ناو دڵی بەندەی عاریفەوە، بەرەو بیرکردنەوە و یادکردنەوە بۆ مەزنی و

شکۆمەندی پلە و پایەی مەولای خۆی و قەدری رازیبوون و تووڕەبوونی و ئەوەی بەڵێنی داوە لە هەڕەشە و سزا و پاداشت دەیبزوێنێت و بەوەش دڵی رۆشن دەبێتەوە.

## رەوشتەکانی نەفسی فەرمانکەر بە خراپە:

پاشان بەرەو خۆناسی بێداری دەکاتەوە، سەرەتای ئەمەش: ئاگاداری دەکاتەوە بۆ هێنانەوە یادی ئەوەی لە رابردوودا ئەنجامیداوە، لە تاوانەکانی نەفسی خۆی لەسەر خۆی، لە زۆری ئەو هەموو گوناه و تاوانەی کە لە لاپەڕەی کار و کردەوەکانیدا نووسراون، ئەو گوناهانەی کە ناسڕێنەوە تا پێیانەوە لەبەردەم پەروەردگاریدا دەوەستێت، لە هەموو ئەو گوناهانەی نەفسی ئەنجامیداوە پرسیاری لێ دەکات، ئەو گوناهانەی لەسەری نووسراون و جێگیرکراون، بە مەزنترین شەرمەزاری و توندترین هەڕەشە و گەورەترین ترس و لەرزینەوە دان بە گوناهەکانی خۆیدا دەنێت.

لە کاتی خوێندنەوەی لاپەڕەی گوناهەکانیدا بەهۆی ئەو گوناهانەوە لە تووڕەبوونی خودا سەلامەت نابێت، لەبەردەم خودادا زنجیر دەکرێت و بەرەو سزای هەتاهەتایی رادەکێشرێت.

پاشان خودا بەیادی دەهێنێتەوە کە: لە هەموو ئەوەی نەفسی بەدەستیهێناوە لە تەمەنی رابردوودا هێشتا بە خۆشی و چالاکییەوە روویان لێ دەکات، هێشتا روو لە گوناهان دەکات و حەزی لە گوناهانە، هێشتا ئەو نەفسە وریا و فێڵباز و بەئاگایە بۆ ئەنجامدانی گوناهان تا دواجار رووبەڕووی تیاچوونی دەکاتەوە لە رۆژی دواییدا، دەبینێت هێشتا نەفسی خۆشحاڵە و چێژ وەردەگرێت لە خەشم و تووڕەیی خودا، وەك

ئەوەی خودا ئەو نەمرێنێ و رووبەڕووی تیاچوونی نەکاتەوە، وەك ئەوەی خودا ئەو نەفسەی دەکوت نەکردبێت و هەڕەشەی لێ نەکردبێت.

یان وەك ئەوەی دەمکوتی کردووە و هەڕەشەی لێکردووە، بەلاّم ناتوانێت سزای بدات بەوەی هەڕەشەی لێ کردووە، یان ڕێگر هەیە لەو سزایە و سەرخەرێك هەیە ئەو سەردەخات.

ئەم نەفسە -لەگەڵ خۆشی و سرور و چالاکی بە هەموو ئەوەی پەروەردگاری لای ناپەسەندە- پشتی هەڵکردووە لە ڕێگەی رزگاربوونی خۆی لە دوارۆژ، بۆ کەمترین شت کە خودا رازی بکات پێی قورسە و پشتهەڵکەر و بێزارە، رقی لە هەموو ئەو هۆکارانە دەبێتەوە کە لە لای پەروەردگار ڕێز و شکۆمەندی پێ دەدەن، گەر بە کەمێك لە گوێڕایەڵی پەروەردگاری کاری کرد ئەوا ناچاری و زۆرلەخۆکردنە، ئەوەش دوای ئەوەی نەفسی بەزۆر رادەکێشێ و بەرانبەری تێدەکۆشێت.

گەر لە گوێڕایەڵی ئەوەی لە پەروەردگاری نزیکی دەکاتەوە بۆ ماوەیەکی زۆر مایەوە نەفسی ململانێ دەکات بۆ وازهێنان لەو گوێڕایەڵییە و ئەوەی ئەو تێیدایە لە کار و کردەوەی دوارۆژ بە قورسی دەزانێت، ئاسوودەیی جەستەی بیردەخاتەوە لە وازهێنان لە گوێڕایەڵی پەروەردگاری، و بە تیاچوونی هەندێ لە پێویستییەکان دەیترسێنێت.

کاتێك بیەوێت کەمێك لە موڵك و دارایی خۆی بۆ دوارۆژی ببەخشێت بە غەم و پەژارەی کەمکردنیماڵەکەی دایدەگرێتەوە و بە هەژاری دەیترسێنێت گەر بەردەوام بێت لەسەر ئەو جۆرە بەخشینە.

گەر کەسەکە بە گوێی نەکرد و بۆ دوارۆژی خۆی لە ماڵ و داراییەکەی بەخشی هەوڵدەدات وای لێ بکات کەم ببەخشێت، گەر بە گوێی نەکرد و بەبێ کەموکورتی بەخشینەکەی ئەنجامدا بۆ ئەو کارەی غەم و پەژارە دایدەگرێتەوە، بەردەوام ترسی کەمکردنی ماڵەکەی دێنێتە پێش چاو تاکو جارێکی تر نەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەو جۆرە بەخشینە، ئەو کارەشی لەلا گەورە دەکات گەر کەسەکە بە گوێی نەکرد و بەردەوام بوو لە بەخشین ئەوا سووربوون لەسەر ئەدەبدادانی نەفس دێتە پێشەوە.



## سووربوون لەسەر ئەدەبدادانی نەفس



که ئەوەی بۆ روون بوویەوە و بۆی دەرکەوت گوێڕایەڵی نەفس تیاچوونی رۆژی دواییە و یاخیبوون لەو نەفسە رزگاری دوارۆژە و ئەو نەفسە رێگەیەکی گرتۆتەبەر کە سەرئەنجامەکەی تیاچوونە و هۆگر بووە بە دوورکەوتنەوە و بێزاری لەو شتانەی رەزامەندی خودایان تێدایە، و ئەو گەر مردن هێرش بکاتە سەری -کە هیچ دالدەیەك بۆ خێرایی هێرشەکەی نییە- بە خودا دەگات لەسەر شتێك کە خەشم و تووڕەیی ئەوی تێدایە، خۆ گەر مردن لە ناکاو یەخەی پێ بگرێت لەسەر ئەم حاڵەی ئەوا تیاچوون و ناسەلامەتی ئەوی تێدایە، مەگەر پەروەردگاری لێی ببورێت، ئەو لە مردن قوتاری نابێت، و هەر دەبێت بگات بە لیقای پەروەردگاری، لە دوای مردن و پەشیمانی و گەیشتن بە لیقای پەروەردگاری جارێکی تر ناتوانێت بگەڕێتەوە بۆ سەر زەوی، فریودانی نەفسی بە لاوازی جەستەی هەڵەیەکی مەزنە و نەفامییەکی رۆشنە و تیاچوون و ناسەلامەتییە.

### ئامۆژگاری و بیرهێنانەوە:

لێرەوە دڵ سوور دەبێت لەسەر ئەدەبدادانی ئەو نەفسە، و بەردەوامبوون لە راگرتن و راوەستانی، و پێداگری لەسەر لۆمەکردنی و بەردەوامی ئامۆژگاری کردنی و خودا وەبیرهێنانەوەی و بیرخستنەوەی بۆ ئەو ترسە مەزنانەی لەبەردەمی ئەودان و هەر دەبێت بگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگاری.

گەر نەیتوانی لە سەرزەنشت و لۆمەکردنی بەردەوام بێت، ئەوا نەفس پشت هەڵدەکات لەوەی یادی دەختەوە و دەیهێنایە پێش چاوی.

## کەنارگیر کردنی نەفس لە شوێن و جێی یاخیبوون:

یەکەمین شتێك دەستی پێ دەکات بە ئەدەب دادانی تاکو ئەوەی پێی دەڵێت تێیبگات و بیژنەوێت بریتییە لە بێدەنگی، بەبێدەنگی نەفسی جیادەکاتەوە لەوەی خەریکی دەکات لە قسەکردن.

گەر نەفس شتێك نەبینێتەوە قسەی لەگەڵ بکات بێدەنگ دەبێت، کە بێدەنگی درێژەی کێشا کپ و بێ زمان دەبێت، کە کپی و بێ زمانی درێژەی کێشا زۆربەی ئەوەی تیایدا نغرۆ بوو بوو لە هەڵە و خلیسکان بۆی رۆشن دەبێتەوە، نەفس هەست بە شکانی خۆی دەکات کاتێك دەزانێت تا ئێستا لە پووچیدا رۆچووە و خۆی رووبەڕووی تووڕەبوونی پەروەردگاری کردۆتەوە.

## ئالوودەبوون بە سەرزەنشتکردن و ترساندنی:

پاشان دەست دەکات بە سەرزەنشت کردنی و داننان بەو خراپانەی ئەنجامی داون، هەروەها ئەوەی ئەو رووی تێدەکات لە کەم و لە زۆر.

بەردەوام پێداگری لێ دەکات تا نەرم دەبێت و دان بە گوناهەکان و خراپەکان و بەردەوامی بێئاگایی خۆیدا لە رزگاربوون دەنێت.

کە دانی بەوەدانا تاوانە گەورەکان و زۆری گوناهەکانی یاد دەخاتەوە، لەسەر ئەم یادخستنەوەی بەردەوام دەبێت و دەیکات بەکاری خۆی و هیچ کارێکی تری نابێت جگەلەوە.

ئەوەش ویژدانی ئازار دەدات و فرمێسك هەڵدەورێنێت و داوای لێخۆشبوون لە خودا دەكات بۆ ئەو كارە خراپانەی ئەنجامیداون و پێش خۆی خستوون.

هێرش دەكاتە سەری و یادی دەخاتەوە و پێی دەڵێت: مانەوە لەسەر ئەمەی كە دەیزانیت و دانی پیادا دەنێیت رووبەڕووی تووڕەبوونی خودات دەكاتەوە.

**پاشان هەواڵی پێدەدات:** كە هیچ ئەمانێك بوونی نییە گەر پەروەردگاری لێی تووڕە و زویر بێت بە هۆی ئەو كار و كردەوە خراپانەی پێشتر ئەنجامیداون، ئیتر لەدوای ئەوە چۆن دەتوانێت لەسەر ئەو كارە خراپانە راوەستاو بێت؟ بۆیە نەفس گەردنكەچ دەبێت و بڕیاری وازهێنان لەو گوناهانە دەدات كە دەقی پێوە گرتوون.

## نەفس نایەوێت لە حەزەكانی جیابێتەوە:

دڵی لە سووربوون لەسەر گوناهان پاك دەكاتەوە، رووناك و نوورانی دەبێت، پێداچوونەوە دەكات و بەردەوام بیردەكاتەوە، بە قووڵی بیر لەو هۆكارەكانە دەكاتەوە كە بەهۆیانەوە نەفس یاخیبووەكان بەدەست دەهێنێت، لە هاوەڵان و خانەوادە و خزم و كەسوكار و هاودەمان كە دەیگێڕنەوە بۆ سەر حەزەكان، بانگی دەكات بۆ دابڕان لە هەموو ئەوانە و جیابوونەوە لێیان، هەواڵی پێ دەدات كە تەوبەكەی دروست نابێت و ناتوانێت بۆ لای دروستكەرەكەی بگەڕێتەوە ئەگەر كۆچ لە هەموو ئەوانە نەكات.

نەفس دووركەوتنەوە و بێزاری و پێچ لێدان و ملكەچ نەبوونی نواند.

## چارەسەری بە ڕۆژوو و برسێتی و بیرخستنەوە:

بە ئالوودەبوون بە ڕۆژووەوە نەفسی شکاند، و هێزی سروشتی کە بەدەستی هێناوە بە تام و چێژی خواردنی چەور تێکوپێک شکاند، بۆیە لە چالاکی وەستا هەرچەند لەدوای ئەوە خۆزگەی بۆ حەزەکان ماوە.

کاتێك بینی ئەوە کاریگەری تەواوی نابێت بۆ ئەدەب دادانی دەست دەکات بە کەمکردنەوەی خواردن پێدانی، کە برسێتی زۆری بۆ هێنا نەفس زەلیل دەبێت و خشوع رووی لێ دەکات، لەو بارەدا سەرزەنشت کردن کاریگەری دەبێت، هەوڵدەدات کارەکەی پێ ئەنجام بدات و ئەویش قبووڵی ناکات، بۆیە سزای خودا و سەرئەنجامی خراپی وەبیر دەهێنێتەوە بۆ کەسانێك کە پشت لە خودا دەکەن و خۆیان دەخەنە بەر خەشم و تووڕەبوونی.

کەمێك نەفس بۆی نەرم دەبێت و هەوڵی دواخستن دەدات و بەڵێنی وازهێنانی کەمێك لەوە دەدات بۆ ئەنجامدانی کارە پێویستەکانی و سەردانی هەندێ لە خۆشەویستانی.

بە هەڕەشە کارەکەی پێ ئەنجام دەدات وەك چۆن پاڵەوان هێرش دەکاتە سەر هاوشانەکەی خۆی لە جەنگدا، لە دەمکوت کردن و بیرخستنەوەی پێداگری دەکات، مەزنی خودای بەبیر دەهێنێتەوە و توندی سزا و مەزنی ئازاری بۆ دووبارە دەکاتەوە.

## ئارەزوو و خۆزگە بۆ هەندێ لە حەزەکان جیا لە هەندێکی تریان:

نەفس گەردنکەچ دەبێ و گوێڕایەڵ دەبێت بۆ بڕینی ئەو هۆیانە، بەڵام نایەوێت هۆی یاخیبووەکانی تری ببڕێت.

دەستیان پێوە دەگرێت و لەناو یاخیبوونی خۆیدا بێهۆشە، بۆیە کەسەکە بڕیار دەدات هەر کات نەفسی دەستی بۆ ئەو هۆیانە برد کە نایەوێت دەستیان لێ بەر بدات رایبگرێت و لە هۆیەکان دایببڕێت.

کاتێك هەندێ لەو هۆیانەی لێبڕی و بە دژی ئەوانە ئاڵوگۆڕی کردن: برادەری رێنیشادەری چاکەی بە برادەری رێنیشاندەری خراپە ئاڵوگۆڕ کرد، بێداربوونەوەو هاتنەوە یاد دوای بێئاگایی و لەبیرچوون، ئارامی و وردبوونەوە و لەسەرخۆیی دوای هەڵەشە و پەلەپەل، ئالوودەبوون بە موناجاتی پەروەردگارەوە -یادی شکۆمەند بێت- بەشیرینی خوێندنەوەی کتێبەکەی و وردبوونەوە لە زانست لە ئاسەواری پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) و ئادابی صالحان لەدوای زۆری رۆچوون و پاڵدانەوە بەلای گفتوگۆی تێکدەرانەوە.

قسەی زۆری بە بێدەنگی ئاڵوگۆڕ کرد، سەرنج و تەماشاکردنی زۆر بۆ ئەو شتانەی خودا پێیخۆش نییە بە چاوداخستن ئاڵوگۆڕ کرد، دەستی کرد بە وازهێنان لە زۆرێك لە حەزەکانی کە لە پەروەردگاری دووری دەخەنەوە، خۆی لە زۆرێك لە کار و کەسابەتی پیس و ئەوەی خواردن و خواردنەوەی پاك راناگرن پاککردەوە.

کە گەیشتە ئەمە و نووری ئەوانەی لە دڵدا بۆ کۆبوویەوە و میراتی گوێڕایەڵی لە ئەقڵیدا رۆشنبوویەوە و خودا بە کۆمەکی خۆی کۆمەکی کرد، هەر خودایە لە سەرەتاوە بەئاگای هێنا و دڵی بزوان بۆ وردبوونەوە لە نەفسی و خراپەی حەزەکانی پێ ناساند و

کەمی لاکردنەوەی نەفسی بەلای دوارۆژدا خستە پێش چاوی.

کاتێك لە دڵیدا ئەوەی خودا پێی بەخشی بوو لە نووری گوێڕایەڵی و دڵخۆشی بەوەی دەیەوێت ئەنجامی بدات جێگیر بوو، ئەوا دڵی زیندوو دەبێتەوە و ویست و لێبڕانی بەهێز دەبێت و نووری گوێڕایەڵی ئارەزووی ژێردەستە دەکات.

## سزای رەوا بۆ نەفس:

نەفس لەدوای ئەوە هەندێ لە هۆگرییەکانی بۆ دەخرێتە روو، لەو شتانەی چێژیان لێ دەبینێت، هەندێکیان خۆبەخشانە وازیان لێ دەهێنێت و هەندێکیان ململانێی بۆ دەکات تاکو بچێتەوە سەریان.

ئەوەی نەفسی خۆبەخشانە وازی لێ دەهێنێت حەمد و سەنای خودای لەسەر دەکات بەوەی منەتی کردووە لەسەری، ئەوەش نەفس کێبەرکێی لەسەر دەکات هێرش دەکاتە سەری و لەگەڵ ئارەزووەکانیدا دەجەنگێ وەك جەنگانی هاوتاکەی خۆی لە شەڕدا، گەر نەفسی بەزۆر دەستبەرداری ئەوە بوو ئەوا حەمدی خودای لەسەر دەکات و خەمی ئەو نەفسە دایدەگرێتەوە کە دەستبەرداری حەزەکانی نەبووە، بۆیە خۆی لێ دەپارێزێ نەبادا جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ سەریان.

هەر شتێك نەفس دەیەوێ تێیبکەوێ ئەو دەمکوتی دەکات، گەر دەمکوت بوو باشە، ئەگەر نە هەڕەشەی سزای لێ دەکات: بەوەی پشوو و پاڵدانەوەی لێ بگرێتەوە، رووبەڕووی ماندبوونی بکاتەوە، ماڵ و سامانەکەی بەرەو کەمی ببات، واز لە چێژ و خۆشی بهێنێت زیاتر لەوەی نەفس دەیەوێت بەدەستی بهێنێت.

گەر بەو هەڕەشەیە وازی هێنا ئەوا حەمدی خودای لەسەر دەکات، گەر سووربوو لەسەر ئەنجامدانیان و رجای وابوو تۆ سزای نەدەی و ئەو زاڵ بێت بەسەر تۆدا و تۆ لەو بێئاگا بیت و لە تێکۆشان دژ بە ئەو دەستەوسان بیت و نەفس گەڕایەوە بۆ سەر هەندێ لەوەی پەروەردگار تووڕە دەکات، ئەوا دەبێت ئەو سزایەی هەڕەشەی لێ کردبوو بەسەریدا دادەبارێنێت.

گەر بەو جۆرەش دەستی نەکێشایەوە بە نوێژکردن ماندووی دەکات، بەڕۆژووگرتن برسی و تینووی دەکات، یان زۆرێك لە حەزە حەلاڵەکانی لێ قەدەغە دەکات ئەو حەزانەی کە ناتوانێت ئارام بگرێت لەسەریان، یان بەخشینی ماڵێك کە دەیدات بە کەسێك لەو جۆرە ماڵەی ئەوی هەیە.



## سەرەتای هیدایەت



پاشان تەماشای چێژی یاخیبوون دەکات کە تامی کرد و لەدەستی چوو، سەرنجی ئەو سزایە دەدات کە بەسەریدا دادەبارێت، سزا نووری زیاتر لە دڵیدا و چالاکی زۆرتر بۆ نزیکبوونەوە لە پەروەردگاری دروست دەکات.

بۆیە نەفس گەرنکەچ دەبێت و بەسەریدا زاڵ دەبێت و دەموکتی دەکات و ئەویش دەمکوت دەبێت و ئامۆژگاری دەکات و ئامۆژگاری وەردەگرێت، چونکە نەفسێکی باوەڕدارە با لە پەروەردگاریشی یاخی بێت.

داباریینی سزا بەسەریدا بە بیر دەهێنێتەوە، نەفس دەزانێت گەر بگەڕێتەوە بۆ تاوانەکان ئەو سزایانەی بەسەردا دادەبارێتەوە، بۆیە وازیان لێ دەهێنێت و پشتیان تێدەکات.

بەردەوام لەگەڵ ئەو نەفسە خەریك دەبێت بۆ هەموو ئەو شتانەی نایەوێت ئەنجامی بدات و ئەویش بەو جۆرە سزایانە ئەدەب وەردەگرێت، تا هەموو ئەو هۆیانەی لە پەروەردگاری دووری دەخەنەوە کۆتایی پێ دێنێت.

### لە نێوان سزادانی نەفس و سوککردن لەسەری:

کە وازی لە دەقپێوەگرتنەکانی خۆی هێنا و لەسەر گوێڕایەڵی خودا راست راوەستا، توندی سزادانی نەفس وازلێدەهێنێت، نەبادا تووشی شەکەتی و بێزاربوون ببێت، پاشان لێی دڵنیا نییە بۆ گەڕانەوە بۆ سەر هەندێ لەوانەی وازی لێ هێناوە، ئەو شتانەی پەروەردگار بە پەسەندیان نابینێت.

بۆیە دەستبردن بۆ هەندێ لەو شتانەی کە سروشتی پێ بەهێز دەبێت و ئارەزووی پێ دەبوژێتەوە لەسەری سووك دەكات، لە هەندێ چێژیش ڕێگری لێ دەكات وەك زۆری خواردن و گۆشت و سك پڕبوون و سەرهەڵدانی ورگ، گەر هێزی پەیداكردەوە سەردەكاتەوە ڕۆژووگرتن.

چونكە كاتێك دەبینێت لە ئاراستەی سروشتیەوە نەفسی ململانێی لەگەڵ دەكات هێزی حەزەكانی تێكدەشكێنێت بۆ ئەوەی دڵی خاڵی ببێتەوە، بۆیە لە سەیروسەمەرەكانی دواڕۆژ ورد دەبێتەوە، سەرنجی بەڵێن و هەڕەشەكانی پەروەردگاری دەدات، یادی پەروەردگاری لە دڵیدا پاڵفتە و ئاسان دەبێت.

## گرتنە دەستی جڵەوی نەفس:

مەشخەڵەكانی دواڕۆژی بە بیر و خەیاڵ بۆ بەزدەكاتەوە(دەهێنێتە پێش چاو) سەختی و دژوارییەكانی ڕۆژی دوایی دەهێنێتە پێش چاو، لە پشتی ئەوانەوە بە خەیاڵ دۆزەخ و بەهەشتی نیشان دەدات، ئەو ناتوانێ بگاتە بەهەشت تا لە سزای دۆزەخ ڕزگاری نەبێت.

ئەوەی ئارام ناگرێت لەسەری بە چاوەكانی دەیبینێت، بۆیە ئەوەی سروشتی حەزی لێیەتی وازی لێ دەهێنێت لە ترسی ئەوەی پاڵبداتەوە بەلای شتێكدا كە ئارام ناگرێت لەسەری.

نموونەی ئەو لەو كارەدا وەك ئەو كەسە وایە كە نەخۆشییەك بەسەر لاقەكانیدا هاتووە، لاقەكانی ڕەش دەبنەوە و تووشی خۆرە دەبن، دەترسێت گەر ئەو لاقە نەبڕێتەوە نەخۆشییەكە بۆ هەموو جەستەی بگوێزێتەوە، بۆیە هەندێ ماڵ و پارە بە حەز و خۆشییەوە دەدات بە كەسێك لاقی ببڕێتەوە، دوای ئەوەی لای ناخۆش و گران

بوو پارچەیەك لە نینۆکی لێ ببێتەوە، بەڵاّم کە ئەو هۆیەی بینی سەردەکێشێت بۆ تیابردنی جەستەی خۆی، ئەوەی لا خۆش و باش بوو لە ترسی بەڵاّیەکی گەورەتر لەوە.

هەر بەو جۆرە ئەو کەسەی کە لە دوارۆژی خۆی ورد دەبێتەوە، و هۆیەکانی تیاچوونی خۆی لە دڵ و ئەندامەکانی تیادا دەبینێتەوە بە خۆشی و رازیبوونەوە لەو کارە خراپانە جیادەبێتەوە، گەر بە بەخشینی ئەوەی هەیەتی بۆی بەدەست بێت ئەوا ئەنجامی دەدات، وەك چۆن ماڵ و پارەی خۆی دەدات بە کەسێك لاقی بە ئاگر ببڕێتەوە، و شانی دا ژێر ئازاری ئەو سووتانە لەترسی سەرئەنجامێکی خراپتر لەوە، هەر بەو جۆرە ئەو کەسەی ئەدەبی نەفسی خۆی دادەدات شان دەداتە ژێر گەرمی و تاڵاّوەکان لە ترسی سەرئەنجامی خراپی هەتاهەتایی.

جیاوازی زۆر هەیە لە نێوان ئەو دوو سەرئەنجامەدا، هەروەها جیاوازی زۆر هەیە لە نێوان ئاسوودەیی ئەو کەسەی لاقی بڕاوەتەوە لەگەڵ ئەو کەسەی لە خودا دەترسێ و ئاسوودەیی هەتاهەتایی لە جیرانی خودا بەدەست دەهێنێت.



# فێڵی نەفس



## ئارەزووی پلە و پایە لەلای خەڵك:

دڵی لە ئاگاهی و خۆپارێزیدا دەهێڵێتەوە، کاتێـك نـەفس لـە ململانـێ و کێبـەرکێ دامرکایەوە و لە هۆگرییەکانی خۆی دوورکەوتەوە و خۆی بە گوێڕایەڵی خودا رازاندەوە سروشتی لار دەبێتەوە بەرەو خۆشەویستی گـەورەیی و پلـە و پایـە و مـەدح و سـەنای خەڵك و بە مەزن زانینی بە هۆی گوێڕایەڵییەکانی بۆ خودا و وازهێنان لە گوناهان.

لەم شوێنەش نەفسی خۆی دەمکوت دەکات و بە سەیرکردن و تووڕەیی خـودا بـۆ نـاخ و ناوەوەی دەیترسێنێت گەر لە ناخەوە بەندایەتی و نزیکبوونەوەکانی بۆ لای جگـە لـە خـودا بێت، بۆیە نەفسی دەمکوت دەبێت، چونکە کارەکەی ریایە و ریاش هاوەڵدانانە بۆ خودا.

## لەخۆبایی‌بوون ( خۆپەسەندی ):

پاشان نەفس دەگەڕێتەوە بۆ پشوو وەرگرتن بـە منـەتکردن لەسـەری: بـەوەی گوێڕایـەڵی پەروەردگاری خۆی کردووە و لە بەندایەتیدا ئیخلاصی نواندووە، لێرەش دەمکوتی دەکـات و بەو گونـاه و خراپانـەی پێشـتر ئـەنجامی داون و دایدەمرکێنێتـەوە، ئەو(نـەفس) پێشـتر نەیدەویست گوێڕایەڵی پەروەردگاری خۆی بکات و دەیویست بە عیبادەتـەکانی شـەرەف و گەورەیی لە لای خەڵك بەدەست بهێنێت دوای وازهێنان لە یاخیبوونەکانی، منەت بۆ ئـەو کەسەیە کە لەو خەوی بێئاگاییە بـەئاگای هێنـا و ئـەدەبی دادا و منـەتی کـرد بەسـەریدا

بەوەی لە حەزو خۆشویستنەکانی دووری خستەوە، بۆیە نەفس دان بەوەدا دەنێت کە هەموو ئەوانە لە مەولای خۆیەوە بووە و ئەو(نەفس) نەیویستووەو حەزی پێی نەبووە.

## ئەندێشەی فەزڵی(نەفس) لەسەر خەڵکانی تر:

پاشان نەفس وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: خودا -تبارك وتعالى- کاتێك منەتی کرد بەسەریدا و لە خۆشویستنەکانی وەریگێڕا فەزڵی ئەویدا بەسەر خەڵکانی تردا، ئەوانەی کەس حاڵ و باریان نازانێت لەناو خەڵکیدا.

لێرەش دەمکوتی دەکات و ئەو ئاسەواری خراپانەی لێیی وەشاوەتەوە دەهێنێتەوە بیری، ئەو خراپانەی لە نێوان خۆی و دروستکەرەکەیدا ئەنجامی داوە، و ترسی سەرئەنجامی خراپە لە دوا ساتەکانی تەمەنیدا، ئەو گوناهانەی دەیزانێت زۆر زیاترە لەوەی خۆی بە مەزن و چاکتر لەلای خودا تەماشا بکات.

لێرەش نەفس گەردنکەچ دەبێت و تەوازوع دەنوێنێت، چونکە خاوەن نەنگی کاتێک بە نەنگییەکەی خۆی دەزانێت گەردنکەچ دەبێت و دەچێتە ژێر بار، بۆیە خشوع دایدەگرێتەوە و لە ناخەوە دەشکێت.

## باوەڕەکانی پاڵفتەکراو و راستگۆیانەیە:

پاشان نەفس وەڵامی دەداتەوە و پشوویەك بە خۆی دەدات و دەڵێت: خودا منەتی نەکردووە بەسەریدا بە گوێڕایەڵی کردنی و دوورکەوتنەوە لە گوناه و یاخیبوون و زەلیل کردنی بە تەوازوع، بەڵکو ئەوی هەڵبژاردووە و گێڕاویەتی بە یەکێك لە صادقان، ئەمەش وەك پشوو بەخۆدان تاکو بەوە لە سروشتی خۆیدا سرورێك بەدەست بهێنێت.

لێرەش دەمکوتی دەکات و گوناهەکانی دێنێتەوە یاد و بەوە دەیترسێنێت کە خودا بەهۆی گوناهەکانییەوە خەشم و تووڕەیی لێگرتبێت، ئەو نەیتوانیوە بە حەقێك هەڵبستێت وەك پێویستە و ناشزانێت لەسەر چی دەمرێت.

بۆیە نەفس گەردنکەچ دەبێت و دەترسێت و خۆی لا بچووك دەبێتەوە، کاتێك پێی نیشان دەدا کە ئەم چوارە لە گوێڕایەڵی بۆ پەروەردگاری پشتی پێ هەڵدەکات: ریا و خۆپەسەندی و لوتبەرزی و عیززەت (خۆبەرزبینین)، کەسەکە لە دڵدا ئاگاهی و خۆپارێزی لەو چوارە هەڵدەگرێت، بەڵێن دەدات پشت لەوانە بکات و لا بەلایاندا نەکاتەوە لە باری بێئاگایی و لەبیرچووندا.



# بەڵگەکانی صدق لە تەوبەدا



## سووربوون و لێبڕان لە گوێڕایەڵیدا:

کە حاڵی گۆڕا و خۆی رازاندەوە بەوەی پێشتر لای سەخت و دژوار بوو و هۆگری پەیدا کرد لەگەڵ ئەو سیفەتانە کە پێشتر لێیان دووردەکەوتەوە، و پشتی هەڵکرد لەو شتانەی پێشتر حەزی لێدەکردن و بە یەقین نوورانی بوو و ئەوەی لە دوارۆژ لێی نادیار بوو بە ئەقڵی(ئەقڵ وەك کاری دڵ) موشاهەدەی کرد، مەزنڕاگرتنی خودا لە دڵیدا بەهێز بوو و ترس و رجا لە خودا لە ناخیدا پەرەی سەند و حەیا لە خودا گەشەی کرد و ئەو حەیایە لە هەر رێگرێك رێگەی لە نزیکبوونەوەی پەروەردگار لێ دەگرێت بێزار و کەنارگیری کرد، هەروەها لە هەر شتێك لە خودا بێئاگای دەکات دووریخستەوە و رجای لە ناخدا بۆ دروست کرد و بەرەو هەوڵ و کۆشانی هەمیشەیی چالاکی کرد و خۆشەویستی و هۆگری بە خوداوە بە موناجاتی سەردارەکەی خۆی گەشەی سەند و وەحشەتی لە جگە لە خودا بۆ دروست بوو.

لێرەوە موناجاتی لەگەڵ خودا درێژە دەکێشێت و بە هەموو کاروبارەکانی روو لە خودا دەکات و زۆرتر زیاتر لە دڵدا پەیوەستبوون دروست دەبێت و یادەکەی دڵی نوورانی دەکات و خۆشەویستی بۆ خودا مەزن دەبێت لەگەڵ ترسی زۆر لەوەی لە نێوان ئەو و خودادا وەحشەت دروست ببێت، بۆیە شەوقی بۆ لای مەولای خۆی زیاتر دەبێت و حوزنی درێژە دەکێشێ و ئەقڵی لە دونیا پشتەهڵدەکات بەهۆی مەزنی و گەورەیی پەروەردگارییەوە، لەگەڵ ترس و لەرز لەوەی لە رۆشنایی چاوەکانی(یادی خودا) داببڕێت.

## حوزن و ترس:

هەروەها ترس و لەرزین دایدەگرێتەوە، هەندێ جار بروسکەیەك بە لەرزینی دڵ لە بوونی دەدا و هەندێ جاریش چاوەکان بە سووتانی دڵ لافاوی فرمێسکیان پیادا گوزەر دەکات و هەندێ جاریش نەرمە فرمێسك و جاربەجارێکیش ئەقڵ دەسڕێتەوە(واتە سەرسامی رووی لێدەکات) کەسی نەزان وا دەزانێت ئەو رووبەڕووی شێتێتی بووەتەوە، بەڵام حاڵی ناوەوە مەستی کردووە و پەستی زاڵ بووە بەسەر دەرەوەدا، بۆیە لە رۆژدا لە خەڵکی هەڵدێت و خۆی دەشارێتەوە و لە وەحشەتی هەیە و شەوەکەش شەوی کەسێکی هەژاو و لەرزاوە.

ئەی ئەو کەسەی بە دونیا فریوت خواردووە و لە رێگەکەی لاتداوە گەر لە شەوی تاریکدا ئەو کەسەت ببینیبایە کە هەموو بەندەکان ئارام بوونەتەوە و هێشتا ئەو ئارامی رووی لە دڵی نەکردووە، خەڵکی بێدەنگ بوون و سوکناییان بۆ هاتووە و هێشتا ئەو ترسی خامۆش نەبووە، هەموو خەڵکی پشوو بە خۆیان دەدەن، بەڵام ئەو هێشتا حەنینی دڵی خاونەبووەتەوە، بە دڵە پڕ لە حوزنەکەی لەبەردەم پەروەردگاریدا راوەستاوە، سەری داخستووە و پێستی گرژ بووە و گەردنی کەچ بووە و چەماوەتەوە و حەیا زاڵ بووە بەسەر دڵیدا و کتێبەکەی خودای کردۆتەوە لەگەڵ بە مەزن راگرتنی ئەوەی دەیخوێنێت وەك مەزنی و شکۆمەندی بۆ ئەو کەسەی بەو قورئانە قسەی لەگەڵ مرۆڤدا کردووە.

بۆیە شالاوی حوزن دایدەگرێتەوە و دڵی لە سووتان بەردەوام دەبێت و فرمێسك بە چاودا دێتە خوارەوە، گریانەکەی خۆی دەشارێتەوە نەبادا کەسێك جگە لە پەروەردگاری بیبیستێت، هەناسەکانی سوار و فرمێسکەکانی بە سووتانی دڵەوە بەردەوامن.

کە مانەوەی زۆر لەبەردەم پەروەردگاری درێژە دەکێشێت موشتاقی زەلیـل بـوون بـۆ پەروەردگار دەبێت بە زەلیل کردنی روخساری خۆی وەك گەردنکەچی بـۆ پـەروەردگار، گەر تۆ ئەوت ببینیبایە چۆن بە سووتانی دڵ و کزەکزی سینە و هەناسەی پڕ لە سواری لەبەردەم خودادا چەماوەتەوە و بەڕوودا سوژدە دەبات و بیر لە سەیرکردنی مەولای بـۆ ئەو دەکاتەوە و فرمێسك بە گۆنایدا بەردەبێتـەوە تـا ئاسـاری فرمێسـکەکانی لەسـەر دەردەکـــەون دەپاڕێتـــەوە و دەلاڵێتـــەوە و هـــاوار دەکـــات و دەگـــری و فرمێســـك هەڵدەوەرێنێت و نـاخی مـەزنی خـودا داگـیری دەکـات و ترسـان لـە خـودا مەسـت و سەرگەردانی دەکات.

## بەربوونەوەی داوا لە گوێڕایەڵیدا:

هەندێ جار پەستی و شەکەتی لەسەر هەڵدەگیرێت بەهۆی ئەوەی لـە سـینەیدایە لـە شکۆمەندکردن و بە مەزندانانی پەروەردگاری.

چۆن بێزاری و شەکەتی رووی لێ دەکات لە کاتێکدا ئەو بۆ کارەکەی یەکلابووەتەوە، لە کاتی حوزن و دڵتەنگی و سووتانی دڵیدا خۆی بـە کەمتەرخـەم دەزانێـت، ئەمـەش بەهۆی ئەو مەزنی و ترسەوە کە بەرانبەر پەروەردگاری و ئەو شـەوق و ئـارەزووەی کـە بـــۆ لای ئـــەو هەیـــەتی، ئـــەو تێکۆشـــەرێکی ســـەرگەردانە، لەگـــەڵ ئـــەو تـــرس و سەرگەردانییەشدا ئارەزوومەند و موشتاقە، دڵی پەیوەستە بە مەولاوە و یـادی ئـەو و زۆری هەیبەتی لە دڵ دەرناچێت.

چۆن هەیبەتی کەسێك لە دڵ دەردەچێت کە کۆمەکی و یارمەتی کرد بۆ سـەرکەوتن و سۆزی بەسەردا داباراند بە رەحمپێکـردن و ئاگادارکردنـەوەی، یـادی خێرایـی لیقـای

پەروەردگاری لە دڵ نزیککردۆتەوە، ئەو لە هەموو ساتێکدا پێشبینی دابەزینی مـردن دەکات، بۆیە رۆژەکای ئارامی بە خۆی نادات و دڵی لە هـاتنی ناکـاوی مـردن ئـۆقرە ناگرێت لە هەموو کات و حاڵ و بارێکدا.

یەقینی پەیداکردووە کە لە بەردەم پەروەردگاریدا بەبێ پەردە لە نێواندا راوەسـتاوە، پۆشەرێك بوونی نییە چاوی داپۆشی بێت، وەك ئەوەی خودا ببینێت، گەردنی بۆی کەچ بووە و ئێسکەکانی بۆی چەمانەتەوە، لەگەڵ ترس و لەرزیدا لە توندی سەرقاڵی دڵی بە خوداوە وەك ئەوەی لە دونیا نەبێت و یەکێك نەبێت لە ئەهلی دونیا.

نەفسی خۆی باریك کردووە بۆ پێشبڕکێی سبەینێ، خۆی لـە دونیـا سـووککردووە بـۆ رۆیشتنی خێـرای سـەر پـردی دۆزەخ، لات و لاواز و تـواوەوە و باریـك، نیعمەتـەکانی بریتییە لە بەردەوامی لە حاڵی خۆیدا، داوا لە خودا دەکـات حـوزن و تـرس و سـۆز و شەوق و بەردەوامی و تێکۆشانی بۆ زیاد بکات.

دەستپێشخەر و خۆیەکلاکەرەوە و ئاسوودە بە تەمای نیعمەتەکانی خودا و گومـانی بـاش و هیـوا بـە خـودا، لەگـەڵ ئـەوەش دڵتـەنگ و حـەزین لـە ترسـی تیاچـوون و بێبەشـبوون، ئـەو لەگـەڵ ئـەوەش رازییـە لـە بڕیارەکـانی خـودا و خـۆی رادەسـتی فەرمانەکانی کردووە، متمانەی بەوە هەیە بۆی دابینکراوە و بەڵێنی پێدراوە، پەنا بـۆ هەموو کارێکی چاکە دەبات تاکو پشتی خۆی پێ قایم بکات، روو لە هـەر چـاکەیەك دەکات لەلای خودا رێز و حورمەتی زیاد بکات.

## زانست بە ڕێگەی تەوبە :

بەرچاو ڕۆشنە بە نەخۆشییەکانی دەروونی و کێشمەکێشەکانی دوژمنەکەی، پاڵ ناداتەوە بە لای مەترسی ئەودا، جوانی فیتنەی لێناگۆڕێت، ئەو بەرزبووەتەوە بۆ نزیکی لە خودا، بووە بە خاوەنی بەصیرەت لە کیتاب و سوننەتەوە، گەر پرسیاری لێ بکەیت دەبینی بەرچاورۆشنە بە ڕێگەی بەرەو خوداچوون، گەر وەڵامت بداتەوە بە وەسفی ئەو ڕێگەیە وەڵامت دەداتەوە کە گرتوویەتە بەر، قسە لەو ئافەتانە دەکات کە لە خۆی دەرکردوون، لەو تێکۆشانە دەدوێ ئازاری لەپێناودا چەشتووە، لە پلە باڵاکانی نزیکبوونە لە خودا -سبحانه وتعالی- کە بەرزبووەتەوە بۆ ناویان قسە دەکات.

موریدان بە سەرەتاکانی خۆی ئاشنا دەکات، باسی ئەو ڕێگرانەیان بۆ دەکات هاتوونەتە سەر ڕێ و بە چ شتێك کۆسپ و لەمپەرەکانی بڕی، ئەو دوای ئازار و ماندووبوون و تێکۆشان گەیشتە سروور و ئاسوودەیی، ئەمەش بۆ ئەوەی شان بدەنە ژێر ئەوەی ئەو شانیدایە ژێر تاکو بگەنە ئاسوودەیی و بێنیازی و سروور.

باسی ئەو ڕێگەیەیان بۆ دەکات کە نەفسی خۆی پێ ئەدەبدادا، ئەو کارە بۆ نەفس و سەرخستنی نەفس باس ناکات، تاکو شتێك لە گوێڕایەڵی پەروەردگاردا بووە بۆ خەڵکی نمایش نەکات.

هەواڵیان پێ دەدات: مورید بۆ خودا -عز وجل- یەکەمجار خودا بە منەت و چاکەی خۆی بەئاگای دەهێنێ بۆ ئەوەی داوا لە نەفسی خۆی بکات بەوەی داوای لێکراوە تاکو نەفس وەڵام بداتەوە، پاشان ئەوەی بەسەریدا زاڵ دەبێت -دوای ئەوەی نەفس بۆی گەردنکەچ دەبێت- بریتییە لە ترس و لەرزین.

لە لێوارەکانی بێهیوابوون نزیك بووەتەوە، باوەڕ و مەعریفەی بە بەخشین و چاکەی خودا هەیە، بەلاّم ترس و لەرز زاڵە بەسەر دڵیدا، ترسی ئەوەی هەیە خودا ئەوی قبووڵ نەبێت، بەهۆی ئەو تاوان و خراپانەی ئەنجامیداون، خودا بە بێهیوابوونیش چاکە و بەخشینی خۆی لەگەڵ ئەنجام دەدات.

کاتێك ئایەتی بەزەیی و پاداشت دەخوێنێتەوە دەڵێ: ئەمە ئەوە بۆ پاکانە و منی تێدا نیم.

## زانستی رجا و شوکر و ترس:

کاتێك خودا -سبحانه- سەیری بەندەکەی خۆی دەکات لەو بارەدا بەزەیی بە لاوازی و نیگەرانی و ترس و کەمی ئارامی بەندەکەیدا دێتەوە، بۆیە رجا لە دڵیدا گەشە پێدەدات، چاکەکانی خۆی و بەزەییەکانی خۆی بەبیر دێنێتەوە، خراپەکانیشی بەبیر دەهێنێتەوە، هەروەها بەبیری دەهێنێتەوە چۆن خراپەکانی بۆ گۆڕیوە بە چاکە و رووکردنە خودا.

لەوێوە گومانی بە خودا باش دەبێت، رجای بۆ پەیدا دەبێت و بەخۆی دەڵێت ئەو منەتەی خودا بەرانبەر ئەو کردی بەزەییەکی پێشینە لە پشتییەوەیە بەر لەوەی دروستی بکات، بۆیە هیوا بەسەر دڵیدا زاڵ دەبێت، خودا لێی دەبووریٚ بەوەی منەتی کردووە بەسەریدا بەو گشتە نیعمەت و چاکانە، هۆگری بە رجاوە بۆ دروست دەبێت، و شوکر لە دڵیدا مەزن دەبێت، لێرەوە ترسی ئەوەی بۆ پەیدا دەبێت نەتوانێت شوکری نیعمەتەکانی خودا بکات.

شوکر دەبێت بە ئەخلاقی بە رجا بۆزیادکردن، خودا هۆگری زۆرتری بە شوکرەوە و سرووری زۆرتری بە گومانی باش بە خوداوە بۆ دروست دەکات، بۆیە ئەسڵەکانی ترس و رجا لە دڵدا سەرهەڵدەدەن و دەڕوێنەوە، ئەو دوانەش دەبن بە رێنیشاندەری بۆ لای خودا و بوون بە دوو مەشخەڵ لەناو دڵیدا.

گەر رجای درۆینە لە ناخیدا راستبوویەوە بە کڵپەی ترس دایدەمرکێنێتەوە، و لە سەرئەنجامەکانی دوارۆژ دەترسێت، گەر خاوبوونەوە رووی تێکرد بە بڵێسەی رجا گەرمی و گەشی بە خۆی دەداتەوە، بۆیە خاوبوونەوەکەی نامێنێت، گەر لە بێهیوایی نزیك بوویەوە بە گومانی باش بە خودا و رجای بە بەخشینی تاریکی بێهیوابوون دەرەوێنێتەوە.



# عیززەتی مەقامی تەوبەکاران



ئەمە بریتییە لە ڕێگەی ئەو، ئەو دەبێتە ئەو کەسەی خودا بۆ موریدان راستی دەکاتەوە تاکو نەفسیان ئەدەب دابدات، کەسی نەزان لە مەقامی موریدی رووکردوو لە پەروەردگاری -عز وجل- خۆی بێنیاز ناکات.

لە دونیادا زۆر کەم هەڵدەگرێت، زەلیل و گەردنکەچ و دڵتەنگ و چاو بە فرمێسك و نامۆ لە ڕۆڵەکانی دونیا، ستەملێکراوە و داوای سەرخستن ناکات، لێداگیرکراوە و داوای قەرەبوو ناکات، قژهەڵچوو و تەپوتۆزاوی و خۆگرەوە لە دونیا و تەنها و غەریب.

گەر کەسێکی نەزان تەماشای دڵی ئەو بکات و ئەو چاکانە ببینێت خودا لە دڵی ئەودا دایناوە و ئەوەی وایکردووە لە جوانییەکانی دونیا و خۆشییەکانی دووربکەوێتەوە ئەوا ئارەزووی ئەو مەقامەی ئەو دەکات، دەیزانی کەسی دەوڵەمەندی جوان و چێژوەرگر و دڵخۆش بریتییە لە ئەو، ئەو گەیشتووە بە مەرامی خۆی و ئەوەی لە پەروەردگاری داوای دەکرد بەدەستی هێناوە، چونکە لە دونیا جیابووەتەوە و لێی بێزارە، ئەو دونیایەی کە خۆشییەکان تێکدەدات و تەنها بە هەڵپە و خەم و پەژارە دەتوانی شتێکی لێ بەدەست بهێنی، تەنها بە سەرقاڵ کردنی دڵ کەمێك لە دونیای بەردەست دەکەوێت، سەرباری ترسی هەژاری گەر دونیای لەدەست بچێت، لەگەڵ ئەو گشتە پەتا و نەخۆشی و ئافەت و موسیبەت و ئازار و مەینەتییەی کە لە دونیا جیانابێتەوە، چونکە مەیلدەر بەوانە بەسەر گوێڕایەڵی پەروەردگاردا پێشبینی مردن دەکات وەك چۆن ئەو کەسەی روو

لە خودا دەکات پێشبینی دەکات، جا یان رازیبوون و سەرئەنجامی باش یان خەشمی و تووڕەیی خودا و سەرئەنجامی خراپ.

کەس خاوەن مەیل بە دونیا شیرینی ئەو دوانە نابینێتەوە، بەڵام ئەو کەسەی دونیا رەد دەکاتەوە خۆشییان لێ وەردەگرێت، چونکە دونیای بۆ کەسێك بەجێهێڵاوە کە هەر کەس داوای ئەو کەسە بکات رووبەڕووی زیان نابێتەوە، کەسێکە پاداشتی ئەوانە دەداتەوە کە کاریان بۆ کردووە، ئەو لە دونیادا ئارامیگرتووە بۆیە لەبریتی ئەوە پاداشت دەدرێتەوە.

ئەو کەسەی کاردەکات ژیر و هۆشمەندە، یەقینی بە خێرایی لیقای خودا هەیە لە کەمترین ماوەدا، ئەو خاوەنی بەزەییە بەرانبەر ئەهلی دونیا، چونکە دەبینێت بە شتێکەوە سەرقاڵن کە بەهۆیەوە سزا دەدرێن، و لە کەمترین ماوەدا لێیان وەردەگیرێتەوە، پاشان هیچ پەنایەك نییە بۆ دادگاییکردنیان لەسەر ئەو کارەیان، لەگەڵ مەحرووم بوونیان لە لەوەی خودا بۆ ئەهلی تەقوای ئامادە کردووە بەهۆی ئەو کارانەی پێش خۆیان خستووە.

برام..چۆن ئەم موریدە دونیانەویستە زاهیدە دەبێت بە گەدا لە کاتێکدا شان شانێن دەکات لەگەڵ خەلیفە و مەلیکەکاندا.. تەماشایان دەکات و ئەو حاڵەیان دەبینێ کە ئەوانی تووشی خەم و پەژارە کردووە و ئەوەی لەدوای مردنیان رووبەڕوویی دەبنەوە لە دادگایی کردنێکی توند؟

یان چۆن ئەو بەندە رووبەڕووی زەلیلی دەبێتەوە کە بە خوداوە عەزیز بووە، بە زەلیلی و خشوعی بۆ خودا عیززەتی هەتاهەتایی بەدەست دەهێنێت، لە جیرانی خودای خاوەن رێز و بەخشندەیی؟

ئەو لە دونیادا بە خوداوە عەزیزە، لە لوتبەرزی دونیا دووركەوتەوە تاكو مەولاكەی بە بەرزكردنەوە لە بەهەشتدا قەرەبووی بۆ بكاتەوە.

چۆن ئەو دەبێت بە كەسێكی نامۆ لە كاتێكدا هۆگری تایبەت بەخۆی هەیە؟

چۆن خەم بۆ تەنهایی و دابڕانی قسەی خەڵك لە ئەو دەخوات كەسێك دڵی بە حیكمەت لێوانلێوە و زمانی هەمیشە بە یادی خوداوەیە؟

یان چۆن لاوازی روو لە كەسێك دەكات فروانی دونیای رەدكردۆتەوە و رازی نییە بە دونیا ژیان و زیندەگی ئەو بێت، چونكە یەقینی پەیدا كردووە كە لە دونیا جیادەبێتەوە، ئەو بە پشتكردنە دونیا فراوانی جیرانی پەروەردگار و ژیانی هەتاهەتایی مەبەستە؟

گەر وەك ئەوەی دەیزانی لە چاكەی خودا بەرانبەر بە تۆ كار و چاكە ئەنجام بدەی هێشتا شوكری نیعمەتێكی خودات نەكردووە.

ئەوەی بۆ چاكە ئەنجامت داوە بە زانست بە چاكە راستنابێتەوە.

چاكەی خودا لەگەڵ تۆ لەناو چاكەكانتدایە و چاكەكانی تۆ پێیهەڵناستن.

دڵتەنگ مەبە لەوەی لەدەستت چووە لە بەشی غەنیمەكەت زۆرتر لەدەستچوونی غەزا كردنت.

هەندێ جار یاخیبوو سزا دەدرێت بەبێ پێویستبوون، لەگەڵ لێبوردن، كێ هەیە لە رۆژی ئوحود سزا نەدرابێت بە عەزیمەت؟ پاشان خودا دەفەرموێت: "ولقد عفا عنكم- ئەو لێتان بوورا"

حەسەن دەفەرمویّت: مامی پێغەمبەر (ﷺ) شەهید بوو، چواردانی پێشەوەی پێغەمبەر شکێنرا و روخساری خوێناوی بوو و زۆرێك لە هاوەڵانی شەهید بوون، پاشان خودای موتەعال دەفەرمویّت "ولقد عفا عنكم-ئەو لێتان بوورا"، واتە لە ریشەدەرینەهێنان.

گەر کەسێك بە فەزڵ و ڕێزی لەلای خودا رزگاری ببوایە لە سزا دەبوا ئادەم-علیە السلام- سەلامەت بوایە، بەسە سزا بۆ ئەو کە لە بەهەشت دەردەکرێت، هەروەها نوح لەدوای ئەو، و داوود و موسا و یونس و محمد (ﷺ) لە سورەتی "العبس"دا، هەروەها خودا بە پێغەمبەر دەفەرمویّت: ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ﴾ الأحزاب: ٣٧

خودا لەوەی شایستەی بوون لێیان خۆشبوو، پێغەمبەر هەرگیز گومانی نەبردووە داننان بە گوناه و یەکتاپەرستی و چاکە و ترسان لە خودا بەبێ تەوبە کردن بەس بێت بۆ وەرنەگرتنی سزا، هەر بەو جۆرە هەموو ئەوانەی سزادران لە پێغەمبەران.

بۆیە چاوەڕوانی سزا بکە گەر لە گوناهان پاك نەبوویتەوە، لە کاتی دابەزینی سزاکەدا بە نەزانراوی مەزانە، چونکە تۆ شایەنی مەزنتری لەوە، بەڵام لێبوردنی خودایی مەزنی سزاکەی لێ شاردویتەوە.



## بەڵگەکانی صدقی شوکرکەران



شوکرکردن لەسەر نیعمەتی تەوبەکردن پێویستە.

نیشانەکانی کەسی شوکرکار بوونی خەمی هەستانە بە شوکر و داوای شوکرکردنە لە خودا.

گەر کەسەکە بەو جۆرە بوو بە شتێکی کەم لە دونیا رازی دەبێت و دەترسێت نەتوانێت بە شوکری زۆر هەڵبستێت، هەر کەس خەمی شوکرکردنی هەبێت و داوای شوکر لە خودا بکات ئەوا بە کەم رازی نابێت، بەڵکو بە هەمیشەیی موشتاق و ئارەزوومەندە و بە هەمیشەیی تینویەتی.

بزانە شوکرکردن لەسەر حەرام حەرامە، چونکە باوەڕت وابووە حەرام حەڵاڵە، تۆ گوناهت بە گەورە تەماشا کردووە کاتێك لە جێگەی نیعمەت داتناوە و شوکری لەسەر دەکەی، تۆ بە حەڵاڵکردنی حەرام لە خودا یاخیبوویت و ئەوەی بچووکە بە مەزنت راگرتووە و داوای زیادەیەك لە خودا دەکەی کە بە ناپەسەند تەماشای دەکات.

کەسی شوکرکار لە حەڵاڵدا هەندێ جار واز لەوە دەهێنێت داوای حەڵاڵی زۆر بکات، لە ترسی ئەوەی نەبادا شوکری زۆری پێ نەکرێت، بۆیە ئارام دەگرێت لە نەبوونی حەڵاڵی زۆر لەپێناوی مەزنی شوکردا، لەسەر کەم ئارام دەگرێت و تێیناپەڕێنێت بەهۆی خەمی شوکرەوە، وەك خۆپارێزی لەوەی نەتوانێت بە شوکری زۆر هەستێت، بۆیە خودا لەڕیزی ئارامگران و شوکرکەران دەینووسێت، چونکە خەمی ئەو خەمی

شوکرەو زۆریشی وازلێهێناوە لە کاتێکدا هۆکارەکانی بەدەستهێنانی لەبەردەستدایە، ئەمەش لەپێناوی شوکردا.

بۆیە ئارامی گرت لەسەر نەبوونی زۆری لە دونیادا، ئارامی گرت لەسەر کەمی دونیا، ئەو کەسێکی ئارامگری شوکرکارە، ئارامگرتنەکەی بۆ دەستەوسانی ناگەڕێتەوە، بەڵکو ئارامگرتنەکەی بەتوانا و دەسەڵاتەوەیە، کەسی دەستەوسان نەئارامی بۆ هەیە نەنیگەرانی، بەڵام کەسی بەتوانا ئارام دەگرێت لەسەر بوونی توانا بۆ زۆرکردنی دونیا و ئارام دەگرێت لەسەر بەلا لە کاتی نەبوونیدا، ئەندامەکانی جەستەی دەگرێتەوە، ئەو کەسێکی ئارامگرە، چونکە نەفسی خۆی بەند کردووە لەگەڵ بوونی توانا لەسەر کۆتاهێنان بە نەبوونی.






پاشکۆ

# ( ئەحکامی تەوبە )


نوسینی

عبدالغنی کوری اسماعیل نابلیسی





# مانای تەوبە و سنوورەکانی



زانایان جیاوازییان لە نێوانیاندا هەیە لە دیاریکردنی مانای تەوبەدا، هەیانە دەڵێ: بریتییە لە پەشیمانی، لە فەرموودەیەکدا هاتووە: ((پەشیمانی تەوبەیە))، هەیانە دەڵێت: بریتییە لە سووربوون لەسەر ئەوەی نەگەڕێتەوە بۆ یاخیبوون، هەندێکی تر دەڵێن: بریتییە لە دەستکێشانەوە لە گوناه، هەیانە هەر سێ ماناکەی کۆکردۆتەوە و ئەوەش کاملترین مانا و دروستترینیانە: ((پەشیمانی لەوەی تێپەڕیوە و سووربوون لەسەر نەگەڕانەوە بۆ یاخیبوون و دەستکێشانەوە لە گوناهان))

عەبدولاَی کوڕی موبارەك دەفەرموێت: ((تەوبە بریتییە لە پەشیمانی لەو گوناهانەی بەسەریدا تێپەڕیون و سووربوون لەسەر نەگەڕانەوە، کەسی تەوبەکار هەموو ئەو فەرزانەی لەدەستی چوون قەزای بکاتەوە، و ماف بۆ هەموو خاوەن مافێك بگێڕێتەوە لەوانەی ستەمی لێکردوون، جەستەی کە بە حەرام جوانی کرد بوو بە خەم و دڵتەنگی بتوێنێتەوە، تا پێستی بەئێسکەکانییەوە دەلکێت، پاشان لە نێوان ئەو دوانەدا گۆشتی پاك و خاوێن سەرهەڵبدات، ئازاری گوێڕایەڵی بە جەستە بچێژێت وەك چۆن چێژی یاخیبوونی پێ چەشت))

ئەم پێناسەیە کۆکەرەوەی هەموو خەسڵەتەکانی تەوبەیە کە لە کیتاب و سوننەدا دەقیان لەسەر هاتووە، ئەوەش بریتییە لە تەوبەی نەصوح، لەوەوە دەتوانین لێکدانەوە بۆ فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بکەین کە دەفەرموێت: ((پەشیمانی تەوبەیە))، ئەوەش بریتییە لە پەشیمانی تێروتەواو و راستەقینە کە باریکی جەستەی لێوە

سەرهەڵدەدات، ئەو جەستەیەی لەژێر سێبەری حەرامدا سەریهەڵداوە، نەك تەنها دووبارەکردنەوەی وشەکانی پەشیمانی بە زمان، و نواندنی لە بەردەم خەڵکیدا، هەر بەو جۆرە دەتوانین لێکدانەوەی تەوبە بکەین لەم ئایەتە پیرۆزەدا: ﴿ **إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ** ﴾ الفرقان: ٧٠، واتە: هەر دەبێ قەرەبووی ئەوە بکرێتەوە کە بەندە پێشتر پێیهەستاوە لە تەمەنیدا لە گاڵتە و تاوان و گوناه و یاخیبوون بە کرداری چاکە، بۆیە تەوبەکاری دەستگرەوە لە گوناه گەر قەرەبووی ئەو تەمەنە بە کرداری چاکە نەکاتەوە رجای رزگاربوونی نییە، ئایەتەکە ئیمان دەکات بە مەرجی تەوبە، ئیمانیش بریتییە لە قسە و باوەڕ و کردار، کردار لە ئیماندا کارکردنە بە فەرزەکان و هەموو بەشەکانی باوەڕ کە حەفتا و ئەوەندە بەشن چەند بتوانێت، هەموو ئەو بەشانە کاروکردەوەی چاکەن کە لە نێوان بەندە و پەروەردگار و نێوان و بەندە و خەڵکیدان.

**لە مەرجەکانی تەوبەی دروست:** ئەوەیە کە تەوبەکار کۆچ لە گوناه بکات، چونکە یاخیبوونن و خودا و پێغەمبەرەکەی تووڕە دەکەن، تەنها لەبەر خودا نەك بۆ هیچ هۆکارێکی تر، گەر دەستی لە گوناه گرتەوە لەبەر ئەوەی زیان بە تەندروستی ئەو یان بە ماڵ و داراییەکەی دەگەیەنێت ئەوە بریتی نییە لە تەوبە، بەڵکو کارکردنە بە ئارەزووی نەفس نەك بۆ رووی پاکی خودای موتەعال﴿ **تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا** ﴾ التحريم: ٨، نەیفەرموو تەوبە بکەن بۆ پارێزگاری لە تەندروستی و ماڵ و سامانتان، رەچاوکردنی تەندروستی و ماڵ و سامان ئامانجی سەرەکی تەوبە نییە، بەڵکو ئەوانە شتێکی ناوەندین و نابێت نیەتی تەوبە ئاراستەیان بکرێت.

لەسەر هەریەكێك لە ئەندامەكانی مرۆڤ تەوبە پێویستە، تەوبەی چاو گرتنەوەیەتی لە سەیركردنی حەرام، تەوبەی گوێ گرتنەوەیەتی لە بیستنی حەرام، تەوبەی دەست گرتنەوەیەتی لە دەستبردن بۆ حەرام، تەوبەی دوو پێ و لاقی مرۆڤ گرتنەوەیەتی لە رۆیشتن بۆ حەرام، تەوبەی داوێن گرتنەوەیەتی لە زینا، هەر بەو جۆرە هەموو ئەندامەكانی جەستە، تەنانەت ئەقڵ تەوبەی تایبەت بەخۆی هەیە، ئەوەش بریتییە لە گرتنەوەی لە بیركردنەوەی حەرام، زمان تەوبە دەكات شتێك گۆناكات لەلای خودا و پێغەمبەر (ﷺ) ناپەسەند بێت.



# تەوبە و کرداری چاکە



زۆربەی خەڵکی وا گومان دەبەن کرداری چاکە لەگەڵ مانەوە لەسەر گوناھ سوود بە مرۆڤ دەگەیەنێت لەلای خودا، و دەڵێن: ئەمەیان لای خراپەیە و ئەوەیان لای چاکە، هیوا وایە لای چاکە پارسەنگ بدرێت بەسەر لای خراپەدا و بەندەکە لەلای خودا سەرفەرازی بەدەست بهێنێت.

حارسی موحاسبی بە تەواوترین شێوە گرنگی بەم پرسە داوە، لە کتێبێکی چاپنەکراودا بەناوی **"آداب النفوس"**[١]، پوختەی ئەوەی دەیڵێت: پاککردنەوەی نەفس لە سیفەتە خراپەکان بە تەوبە لەپێشتر و چاکترە بۆ بەندە لە کار و کردەی سوننەت و کارە چاکەکانی تر، لە کاتێکدا ئەو لەسەر یاخیبوون بەردەوامە، بەم هۆیانەوە:

**١.** قبووڵکردنی کاری چاکە لە بەندەیەك کە لەسەر یاخیبوون بەردەوامە لەلای خودا دڵنیایی لەگەڵ نییە، چونکە نەفسی سەرقاڵ بە چێژی گوناھانەوە زۆر کەم کرداری چاکەی بۆ پاڵفتە دەبێت، سەرباری ئەوەی جێگەی نیەت بریتییە لە دڵێك کە بە حەزەکان پیس بووە، بۆیە ئەستەمە ئەو دڵە کرداری چاکە بۆ خودا پاڵفتە بکات گەر لیتاوی گوناھی لەسەر نیشت و بە حەزەکانی گوناھ تێربوو.

**٢.** مرۆڤ داوای لێکراوە هەموو شەڕێك واز لێ بهێنێت، بەڵام داوای لێ نەکراوە هەموو خێرێك ئەنجام بدات، لەسەر ئەم بنچینەیە وازهێنان لە شەڕ لە پلەی یەکەمدایە و لەسەر مرۆڤ پێویستە.

---

[١] ئەم کتێبە ئێستا چاپکراوە و ئێمە وەرمانگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

**٣.** وازهێنان لە شەڕ لە خودی خۆیدا مرۆڤ دەخاتە ناو خێرەوە، بۆیە تەوبەکار لە زینا مرۆڤ دەکات بە پاکداوێن، و تەوبەکار لە لوتبەرزی مرۆڤ دەکات بە کەسێکی خاکی و پڕ لە تەوازوع، و تەوبەکار لە دەستنوقاویی مرۆڤ دەکات بە کەسێکی بەخشندە و تەوبەکار لە درۆ مرۆڤ دەکات بە کەسێکی راستگۆ.

هەر بەو جۆرە هەموو کارە خراپەکان کە بکەرەکانیان تەوبەی لێ دەکەن و مرۆڤ دەخەنە ناو پێچەوانە و دژەکانیانەوە کە بریتین لە کار و کردەوە باشەکان.

**٤.** خێر لە کارێکی چاکەدا نییە لە هەمان دڵدا شەڕی تێکەڵ بووە، چونکە کاری چاکە کاتێك شەڕی تێکەڵ دەبێت دەگۆڕێت بۆ کاری خراپە.

لەسەر ئەم بنچینەیە حارسی موحاسبی پێیوایە وەستانی مرۆڤ لەسەر یەك خەسڵەت لە شەڕ دەروونی یەکلادەکاتەوە بۆ تەوبەکردن لێی و وردەکاری لەو تەوبەدا بەکاردەهێنێت و هەوڵدەدات لقەکانی لەناو دڵدا ریشەکەند بکات و شەو و رۆژ پێیەوە خەریك ببێت، لەگەڵ هەستان بە فەرزەکان بەتەنها، ئەم کارەی هەزار جار خێرتر و چاکترە لە کار و کردەوەیەکی چاکە لەگەڵ بەردەوامبوون لەسەر ئەو خەسڵەتە خراپە، بۆیە کاتێك لەو خەسڵەتە تەوبەی کرد روو لە خەسڵەتێکی تر دەکات، هەر بەم جۆرە تا تەواوی رەگ و ریشەی شەڕەنگێزی لە دڵیدا دەردەهێنێت، ئەو کات دڵی پاك و بێگەرد لێی دەوەستێت و کار و کردەوەی چاکەی لێوە دەردەچێت﴿ **إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ** ﴾الفرقان: ٧٠، خودای موتەعال – لەم ئایەتەدا- تەوبەی پێشخستووە، ئەوەش یەکەمجار بریتییە لە ریشەکەند کردنی رەگ و ریشەی شەڕ و یاخیبوون لە دڵدا، پاشان بەدوایدا ئیمانی باسکردووە، وەك

ئەوەی کەسی یاخیبوو پێویستی بە دەستەبەرکردنی ئاسایش(**أمن–إيمان**)ی خۆی هەیە لە پەنای خودادا لە جێگەی ئاسایشی لە پەنای حەزەکانیدا کە باوەڕ بە خوداکەی شێواندووە، پاشان باسی کرداری چاکەی کردووە ئەوەش دواین شتێکە کە لەسەر تەوبەکار پێویست دەبێت، ئەو کاتە کرداری چاکە لە دڵێکی تەوبەکاری باوەڕدارەوە دەردەچێت، ئەوکات سیفەتە دژەکان بۆ خەسڵەتی شەڕ جێگەی خەسڵەتەکانی شەڕ دەگرنەوە وەك باسمان کرد، ئەمەش بریتییە لە دانانی چاکە لە جێگەی خراپە وەك ئایەتە پیرۆزەکەدا هاتووە.

لەسەر ئەمە دروستە بەندە لە هەندێ لە خراپە تەوبە بکات جیا لە هەندێکی تری، بۆیە تەوبەکەی لەوەی تەوبەی لێکردووە قبووڵکراوە و ئەوەی لە یاخیبوون دەمێنێتەوە و پێیهەڵدەستێت لەسەری دەمێنێتەوە بەمەرجێك تەوبەکەی بۆ خودا بێت نەك هەوڵدانێك بێت بۆ تەندروستی جەستە و پارێزگاری لە ماڵ و سامان، یاخود پارێزگاری لە پلە و پایە و ناوبانگ یان ترسان لە یاسا یان بەهۆی نەبوونی ئەوەی دەیەوێت بیکرێت لە گوناه و یاخیبوون.

## بەردەوامبوون و سووربوون لەسەر گوناهان گاڵتەکردنە بە خودا و پێغەمبەرکەی

مانای بەردەوامی و سووربوون: ئەوەیە کە شیرینی گوناهان لە دڵدا بمێنێتەوە و ئاواتی ئەنجامدانیان بخوازێت هەرکات بۆی رێبکەوێت، بۆیە هەستکردن بە حەزی دەروونی گوناه و دامەزرانی دڵ بۆ خۆشەویستی گوناهان سووربوون و بەردەوامبوونە لەسەری، لەسەر ئەم بنچینەیە تەوبە لە گوناهان لەگەڵ مانەوەی ئەو چێژە لە دڵدا و

ئاواتخواستن بۆ ئەنجامدانی ئەو گوناهانە هەر کات بۆی رێکەوت و گفتوگۆی هەمیشەیی ناوەوە لەسەر ئەو گوناهانە بریتی نییە لە تەوبە، بەڵکو ئەو تەوبەیە پێی دەوترێت تەوبەی درۆزنان، ئەوە ئەو تەوبەیە "ئەبو هورەیرە"-خودا لێی رازی بێت- خاوەنەکەی وەسف دەکات بە گاڵتەکەر بە پەروەردگاری، ئەوە تەوبەیەکی وەرنەگیراوە، سەرباری تاوانی خۆڵەتاندن و خواخەڵەتاندن کە ئەو بەناو تەوبەکارە ئەنجامی دەدات و خوداش بەو فریو ناخوات.

## بەڵام ئەو کەسەی دڵی لەسەر خۆشەویستی یاخیبوون دامەزراوە و تیایدا نغرۆ بووە دەبێت چی بکات؟

رێگەیەك نییە جگە لە رێگەی تێکۆشانی پڕ لە زەحمەت لەگەڵ ئەو نەفسەدا، ئەو تێکۆشانەی "موحاسبی" لەم کتێبەیدا کە بە تۆ پێشکەش دەکرێت رۆشنی کردۆتەوە، هەر کەس مەنهەجی "موحاسبی" کە لەم کتێبەدا رەنگرێژی بۆ کردووە بکات بە رێگەی خۆی ئەوا بە مۆڵەتی خودا دەگاتە دەستەبەرکردنی تەوبە لەڕووی قسە و کردار و باوەڕەوە، و لە سووربوون لەسەر گوناهان رزگاری دەبێت.

یەکەمجار پێویستە لەسەری کۆچ لە شوێنی خراپە و لە دۆست و هاوەڵی خراپەکار بکات، رۆژانە بەردەوام بێت لەسەر خوێندنی ویردی قورئانی، ژیاننامەی هاوەڵان و شوێنکەوتووان و ساڵحان بخوێنێتەوە، ئالوودەی دوعاکردن ببێت لە کاتەکانی وەڵامدانەوەی دوعادا، بەتایبەت لە تاریکی شەودا تاکو خودا تەوبەی راستەقینەی پێ ببەخشێت، خودا وەڵامدەرەوەی دوعای ئەوانەیە داوای لێ دەکەن و پەنادەری ئەوانەیە پەنای بۆ دەبەن.

## سنووری شەرعی کامەیە بۆ سووربوون لەسەر گوناهان؟

**جمهوری زانایان دەفەرموون:** سووربوون بریتییە لە زاڵبوونی گوناهە بچووکەکان بەسەر کارە باشەکاندا، فەقیهان لە قسەکانیاندا ئاماژەیان بە دادپەروەری و ئەوەی دادپەروەری ناهێڵێت کردووە و دەڵێن: هەر کەس گوناهە بچووکەکانی زیاتر بوو لە کارە چاکەکانی ئەو کەسە بە سووربوو لەسەر گوناهان دادەنرێت و دەدپەروەری ئەو کەسە نامێنێت.

**هەروەها وتراوە:** سووربوون بە بەردەوامبوون لەسەر یەك گوناه دەستەبەر دەبێت، هەر بەو جۆرە دووباربوونەوەی بەردەوامی گوناهێك یان لەسەر هەندێك لە گوناهە بچووکەکان و دووبارەبوونەوەیان بە هەمان شێوە، هەروەها وتویانە: دووبارەبوونەوەی کۆمەڵێك لە گوناهی بچووك وەك هەستکردن وایە بە نزمترین ئاستی گوناهێکی گەورە بەهۆی گوێنەدان بە ئایین، بۆیە وتراوە: بەردەوامبوون لەسەر گوناهی بچووك یەکێکە لە گوناهە گەورەکان.

## تەوبەکردن لە گوناهی بچووك و لە گوناهی گەورە

بەر لەوەی رێگەی تەوبەکردن لە گوناهی بچووك و گوناهی گەورە دیاری بکەین یەکەمجار قسە لە مانای گوناهی بچووك و گوناهی گەورە دەکەین.

زانایان لە دیاریکردنی مانای گوناهی گەورە جیاوازیان لە نێواندا هەیە، گەر رادەی گوناهی گەورە و ماناکەیمان لەم جیاوازییەدا زانی ئەوا هەموو گوناهانی تر جگە لەو گوناهانە گوناهی بچووکن.

١. **"ئیسرافیینی و سوبكی"ش دەڵێن:** هەرچی گوناهە تاوانی گەورەن و بەرەهایی گوناهی بچووك بوونی نییە، ئەوەش وەك سەرنجدان لە مەزنی و شكۆمەندی خودای موتەعال نەك وەك تەماشاكردنی خودی كردارەكە، هەروەها دەڵێن: گوناهی بچووك دەچنەسەر یەكتر تا دەبن بە گوناهی گەورە، هەندێك كەس بەرهەڵستی ئەم پێناسەیان بەم ئایەتە كردووە: ﴿ إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ نُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ ﴾ النساء: ٣١ ، **ئەوان دەڵێن: ئەم ئایەتە دوو جۆر لە گوناه باس دەكات** یەكەمیان بریتییە لە گوناهە گەورەكان ئەویتریان بەبێ هیچ گومانێك بریتییە لە گوناهی بچووك، **"ئیسرافیینی و سوبكی"** و ئەوانەی شوێنی ئەوان كەوتوون بەرپەرچی ئەم بەرهەڵستكاریەیان داوەتەوە بەوەی مەبەست بە گوناهی گەورە لە ئایەتەكەدا بریتییە لە بێباوەڕی (كوفر)، **"تەفتازانی"** لە شەرحی **"العقائد النسفية"**دا هەمان شتی وتووە، هەروەها دەڵێت: كۆكردنەوەی **"الكبيرة"** بۆ **"الكبائر"** لە ئایەتەكەدا ئاماژە بە جۆرەكانی بێباوەڕی دەكات نە جۆراوجۆری گوناهی گەورە لە جۆردا، كۆیەكە مانای چەندبارەبوونەوەی بێباوەڕییە لە هەموو گەل و نەتەوەیەكدا، یان دووبارەبوونەوەی تایبەت بە تاكەكان كە گوتارەكە روو بە ئەوانە، **ئەوەش بینا لەسەر رێسای:** بەرانبەركێی كۆ بە كۆ داوای دابەشكردنی تاكەكان دەكات بۆ تاكەكان، وەك لە قسەی عەرەبدا هاتووە: **"لبس القوم ثيابهم، وركبوا دوابهم**-قەومەكە پۆشاكەكانیان پۆشی و سواری وڵاخەكانیان بوون**"** بۆیە مانای ئایەتەكە: گەر لە جۆرەكانی بێباوەڕی دووربكەونەوە یان لە تاكەكانی كوفر دووربكەونەوە، ئەوا لە هەرچی گوناهی ئێوەیە دەبوورین.

٢. **هەروەها وتراوە:** گوناهی گەورە ئەوەیە کە حەدێك(سزایەك یان تۆڵەیەك) لە حەدەکانی بۆ دانراوە، وەك زینا و دزی، ئەمەش پێناسەیەکی ناتەواوە، چونکە تۆڵەسەندنەوە مافێکی بەندەیە، "حەد"یش سزایەکی بڕیار لەسەردراوە بۆ خودا نەك بۆ بەندە، هەروەها لەبەر ئەوەی هەندێ گوناهی گەورە هەیە حەدی بۆ بڕیار نەدراوە وەك سووخۆری و خواردنی ماڵی هەتیو و هەڵهاتن لە جیهاد، لەسەر ئەمە زانایان ئەو پێناسەیان وەرنەگرتووە.

٣. **جمهوری زانایان دەڵێن:** گوناهی گەورە: بریتییە لە هەر گوناهێك خودا هەڕەشەی پێکردووە لە قورئان و فەرموودەدا، بەرهەڵستی ئەم پێناسەیان کردووە بەوەی گریان و لاواندنەوە (شین و شەپۆڕ) لە کاتی موسیبەتدا لە گوناهە بچووکەکانە لەگەڵ ئەوەی کە هەڕەشەی لە سوننەتدا لەسەر هاتووە، وەڵامی ئەم بەرهەڵستکارییە دراوەتەوە کە هەڕەشە هەندێ جار بۆ بێزارکردن و گێڕانەوەیە بۆ ئەوەی کەسی لاوێنەرەوە وشەی بێباوەڕی بە دەمدا نەیەت، بەلاّم مەبەست لە هەڕەشەکانی گوناهی گەورە هەڕەشەی راستەقینەن.

٤. **ئیمامی حەرەمەین دەفەرموێت:** گوناهی گەورە ئەوەیە بکەرەکەی رایدەگەیەنێت کە کەمباکی(بێخەمی و گوێنەدانی) بە ئایین هەیە، لەسەر ئەمە گوناهی بچووك بریتییە لە هەر گوناهێك بکەرەکەی کەمباکی بە ئایین راناگەیەنێت، بەرهەڵستی ئەمە دەکرێت بەوەی چوونە لای حەیزدار یان کەنیزەك پێش پاکبوونەوەی و خوێندنەوەی قورئان لەلایەن لەشگرانەوە یان حەیزدارەوە و دواخستنی زەکات و حەج لە سەرەتای کاتی بوارفەراهەمدا گوناهن و کەمی گوێدانی بکەرەکانیان بە ئایین رادەگەیەنن، بەلاّم لە گوناهانی بچووکیش دانراون.

٥. **وتراوە:** گوناهی گەورە ئەوەیە کە زۆر خراپ و ناشیرین تەماشا دەکرێت لەنێوان موسڵمانانندا و سنووربەزێنی بۆ خودا و بۆ حورمەتی ئایین تێدایە.

٦. **هەروەها وتراوە:** ئەوەی حەرامی تەواوە لە قورئاندا بە "فاحشە" ناوبراوە، وەك نێربازی، لە دونیادا سزای تەواوی بۆ دانراوە بە حەد یان لە دوارۆژدا بە هەڕەشەی ئاگر و نەفرەت.

گوناهی گەورە تەنها تەوبە دەیسڕێتەوە، بەڵام گوناهی بچووك زۆر شت دەیسڕێتەوە لەوانە ئەنجامدانی پێنج نوێژەکە، لەبەر ئەو فەرموودانەی کە ئاماژە دەکەن بەوەی نوێژەکان گوناهەکانی نێوانیان دەسڕنەوە، هەروەها لە جومعەیەکەوە بۆ جومعەیەکی تر و لە رەمەزانێکەوە بۆ رەمەزێکی تر و داوای لێخۆشبوون و عەمرە.

زۆربەی خەڵکی بە هەڵەداچوون لەوەی کە حەج هەموو گوناهاکان دەشۆرێتەوە، ئەوەی راستییە ئەوەیە کە حەج مافەکانی خودا لەسەر مرۆڤ لادەبات، ئەوەی لەدەستی حەجکەر چووە لە مافەکانی خودا وەك زەکات و نوێژ دەمێنێتەوە و دەبێ قەزایان بکاتەوە، و ئەوەی مافی بەندەکانی خودایە دەبێت بیانگێڕێتەوە.

**بۆ قبووڵکردنی تەوبە لە گوناهی گەورە بە مەرج دەگیرێت:**

ئەو مافانەی لەسەریەتی بیگێڕێتەوە بۆ بەندەکانی خودا وەك گێڕانەوەی ماڵی دزراو، یان ئەو ماڵەی بە ناحەق خواردوویەتی، داوای گەردن ئازادی لەو کەسەی زینای لەگەڵ کراوە یان لە سەرپەرشتیارەکەی لە دەستدرێژی بۆ سەر نامووسی، گەر لە ژیانی خۆی ترسا ئەوا بە شێوەیەکی گشتی داوای گەردن ئازادی دەکات بەبێ درێژەپێدان.

## گەڕانەوە لە گوناهان



**گەر گوناهکار لە گوناهەکەی تەوبەی کرد و پاشان گەڕایەوە بۆ سەری، حوکمەکەی چییە؟**

**خەڵکی لێرەدا دابەش دەبن بۆ دوو بەش:**

١.کەسێکە لە تەوبەکەی یەکەمیدا راستگۆ بووە و بەردەوام نابێت لەسەر گوناهەکەی، کاتێك تەوبە دەکات نیەتی گەڕانەوەی نییە بۆ سەر تاوانەکە، پاشان گوناهی تری بۆ دێتە پێشەوە بەبێ ئەوەی خۆی بۆ ئامادە کردبێت و کاری بۆ ڕێکخستبێت و زانستی بە ڕوودانی گوناهەکە هەبووبێت گوناهەکەی ئەنجامداوە، یەکسانە ئەو گوناهە گوناهی یەکەم بێت یان گوناهێکی تر بێت لە گوناهان، لەسەر گوناهکار پێویستە پەلە بکات بە تەوبە کردن بە مەرجەکانی خۆی، لەو ڕێکنەخستنی گوناهەکە.

**٢**. تەوبەکار لە گوناهی یەکەم لەگەڵ خۆشەویستی بۆ گوناهەکە و ئاواتخواستن بۆ ئەنجامدانی جارێکی تر، هێشتا خۆشەویستی حەرام لە دڵ هەڵنەکەنراوە و پاشان گوناهێکی تری بۆ دێتە پێش و ئەنجامی دەدات، ئەم کەسە گاڵتە بە پەروەردگاری خۆی دەکات و تەوبەکەی بە تەوبەی درۆزنان ناودەنرێت، چونکە بە زمانی تەوبە دەکات و بە دڵ نیەتی گەڕانەوەی هەیە بۆ سەر گوناهەکە.

# ناوەرۆك

**الحمد لله على فضله ونعمته**

لە بەروار ٢٠١٥/٩/٢٥ لە وەرگێڕان و پێداچوونەوەی کتابی تەوبە و ئەحکامەکانی تەوبە بوومەوە. داوامە لە خودا قبوولٚی بفەرموێت لە من و لەو کەسانەی هەوڵی بەچاپگەیاندنی دەدەن.

وەرگێڕ/ سلێمانی

  